نیهال تەجەدود ساڵی ١٩٦٠ لە تاران لەدایك بووە. لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە لە فەرەنسا دەژی. تەجەدود کە هەر لە منداڵیەوە بنەماکانی سۆفیگەری بەگوێدا دراوە، لە پەیمانگەی نیشتمانی زمان و شارستانێتییە رۆژهەڵاتیەکان خوێندویەتی، تێیدا چەند توێژینەوەیەکی لەبارەی مانی و دەقە مانەویەکان و بودا کردوە و دکتۆرای بەزمانی چینی بەدەست هێناوە. تەجەدود بە وەرگێڕانی شیعرەکانی رۆمی بۆ سەر زمانی فەرەنسی ناوبانگی دەرکردوە، وەك توێژەریش لە سەنتەری توێژینەوەی نیشتمانی فەرەنسی کار دەکات و چەند کارێکی سەبارەت بە مێژوو بڵاو کردۆتەوە. رۆمانی "پاسپۆرت بەشێوە ئێرانیەکەی" نووسیوە. لەگەڵ مێردەکەیدا، سیناریۆنووس و رەخنەگری سینەمایی جان کلود کارییە، لە فەرەنسا دەژی.

شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە
گریاو بووم، بەیانی پێئەکەنیم
دەوڵەتی عیشق هات
بوومە دەوڵەتێکی نەمر

**ڕۆمی**

## سەرنج

زۆربەی ئەو گفتوگۆ و راڤەکردن و کۆمێنتانەی لەسەر زمانی کەسایەتییە سەرەکیەکانی ئەم کتێبەدا هاتوون، لە کارەکانیان وەرگیراون.

**رۆمی**: دیوانی شەمسی تەورێزی و مەسنەوی و (فیە ما فیە).

**شەمسی تەورێزی**: وتارەکانی شەمسی تەورێزی.

**سوڵتان وەلەد**: وەلەدنامە.

هەروەها هەندێ زانیاریم بەکارهێناوە کە لە بایۆگرافیا (سیرەی زاتی)ی رۆمی و دەست و پێوەندەکەی وەرگیراوە "مناقب العارفین" کە ئەفلاکی (شەمسەدین ئەحمەد ئەلئەفلاکی، کە ساڵی ١٣٦٠ مردوە) لەسەر داوای نەوەی رۆمی لەنێوان ساڵانی (١٣١٨ و ١٣٥٣) نووسیوێتی.

# من پیره پیاوه سەرمابردەکەم

بەژن درێژ و ڕەقەڵە بوو، نیمچە ئێسکە پەیکەرێك، خۆی بە پاڵتۆیەکی ڕەشی کەتانی دەڵپەوە پێچابوو. پاش تاوە بارانەکە، کەزیەکانی پرچی لەژێر کڵاوەکەیەوە، کە لە شێوەی بەلەمێکی ڕەنگ شینی ئاسمانیدا بوو، شۆڕ بووبوونەوە. بەخێرایی هەنگاوی دەنا بێ گوێدانە ئەوەی لە دەوروبەری، دوکانەکان و خەڵك و ئاژەڵەکان، دەگوزەرا. بەچاوەکانیدا دیار بوو نەو میوانێکی ئەم شارەیە. ناوبەناو لەبەردەم یەکێك لە دوکانە بچوکەکاندا دەوەستا و نیگای چاوەکانی بەسەر ئەو سەبەتانەدا دەگێڕا کە لە قامیش و کلۆش دروست کرابوون. کاتێ سەبەتەسازەکە داوای لێکرد سەبەتەیەکی قامیشی لێ بکڕێ، بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت، چونکە مەگەر بەدەگمەن کەس داوای شتێکی لێ بکات.

کزەبایەکی سارد بەسەر ڕوومەتە لەڕە چرچەکەیدا هەڵیکرد وەك گەڵایەك بەئەسپایی بەر ئاگر بکەوێ. برۆکانی هێنایە یەك تا خۆی لەتەك سەرماکەدا بگونجێنێ، ئەو زوقمە ساردەی لە کۆتایی ئەو ساڵەدا لە قۆنیە هەڵیکردبوو.

بە سەبەتەسازەکەی گوت "من پیرە پیاوە سەرمابردەکەم".

پیاوەکە لە نمایشکردنی کاڵاکەی نەوەستا.

"تەماشای دەسکی ئەو سەبەتانە بکە، هەست بە بنەکانیان دەکەی. تەواوی شار بگەڕێ لەم جۆرە سەبەتانە نادۆزیتەوە. دەتوانن پیاوێك بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە".

"پێویستم بە سەبەتەکانی تۆ نیە تا بەرز ببمەوە بۆ ئاسمان".

کاتێ بۆ یەکەم جار چاوم پێی کەوت، ئەو شەمسی تەورێزی —ماوەیەکی کەم پێش دیدارە بەناوبانگەکەی لەگەڵ مەولانای ڕۆمی— تەمەنی شەست ساڵ بوو، وەك من و ئێستا.

ئەوەتا بوومەتە پیرە پیاوێکی جەستە لاواز، هێشتا لە دووبارەکردنەوەی قسە بەناوبانگەکەی شەمس "من پیرە پیاوە سەرمابردەکەم" نەوەستاوم، چونکە ئاگردانە بەگسپەکەی ئەو ژوورەی چیرۆکی ماموستا و گەورەمی تێدا دەنووسم، ئێسقانە لاوازەکانم گەرم ناکاتەوە، چوومەتە تەمەن و لە هەموو ئەوانە گەورەترم کە دەیانناسم. وا ئەو موریدە جحێڵە بەجۆش و خرۆشەی جاران، کە یەك پارچە چوست و چالاکی و پڕ لە گیانی خۆشمەشرەبی بوو، بووەتە پیاوێکی دانا و خەڵك بۆ پرس و ڕاوێژ و بیستنی ئامۆژگاریەکانی دێنە لای. گەیشتومەتە تەمەنی ویقار. ئەو جحێڵە وەرزشوانەی لە چلەی زستاندا شەختەی سەر ڕووی دەریاچەکەی دەشکاند تا خۆی پێ بشوات، ئێستا کاتەکانی لەبەردەم ئاگردانەکەدا بەسەر دەبات و بەجێی ناهێڵێ. ئەژنۆکانم ئازارم دەدەن، دەستەکانم کەمێك دەلەرزن.

دوای ئەوەی پیر بووم و هەرەکەتم نەما، هەوڵ دەدەم بەخەیاڵ شەمس بەر لە چل ساڵ بێنمەوە بەرچاو. دەبینم بەپەلە لە شوێنی سەبەتەسازەکە دوور دەکەوێتەوە. دەبینم بە شەقام و کۆڵانەکانی قۆنیەدا دەسوڕێتەوە. قونیە یەکەم شار بوو لە تۆفانەکە کەوتەوە، ئەو شارەی پۆڵس و پەیامبەر بەرنابا و تۆمای حەواری پێدا تێپەڕیون. شوێنی کۆبوونەوەی مەسیحییە بەراییەکان، کە پێش ئەوەی لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا ببێتە پایتەختی سوڵتانە سەلجوقیەکان، خاچپەرستان تالآنیان کرد و خراپەکاریەکی زۆریان تێدا کرد.

هێرشەکانی مەغۆل نەیانتوانی مەشخەڵی ئەو دڵە بکوژێننەوە کە بە بازرگانی لێی دەدا. ئەو شارەی تورك و یۆنانی و عەرەب و هیندی و فارس و ئیفرنجی و ئیگۆر و فینیسیایی و تەنانەت چینی تێدا دەژین. هەموو رۆژێك بەیانی زوو ئەو دەنگەدەنگەی ئاوبەرەکان دروستیان دەکرد کە کوندە لە پێستی بزن دروستکراوەکانیان لە جۆگەلەکانی دەرەوەی شار پڕ ئاو دەکرد و بەپشتی وشتر دەیانگواستەوە، خەڵکی شاری بەخەبەر دەهێنا، ئەویش بەهۆی هاوار هاواریان بەدەنگی بەرز بۆ فرۆشتنی ئاوی سازگار، لەگەڵ دەنگەدەنگی جلشۆران لە هاتوچۆیان لەنێوان روبارەکە و ماڵی مەعمیلەکانیاندا، کە بارگیر و ئێسترەکانیان لەژێر باری جلە پیسەکاندا نقەیان دەهات و لەوسەرەوە بەبارە جلی شۆراو و خاوێن و دەقکراو و بۆنخۆشەوە دەگەڕانەوە. هەروەها کرێکارانی بیناسازی کە لە دووریانی رێگە سەرەکیەکاندا دادەنیشتن و چاوەڕوانی تێپەڕبوونی بەڵێندەرێکیان دەکرد لە بەیانی زوودا کە بەدوای بیناسازی کارامەدا دەگەڕان. دەتوانرا لە شوێنە زۆرەکانی بیناسازیەوە —ئاخر سوڵتان شەیدای بیناسازی بوو— ئەو دەنگەدەنگ و جیڕەجیڕە ببیسترێ کە لەو جەنجەڕ و گوریسانەوە بەرز دەبوویەوە کە تا خۆرائاوابوون کرێکارانیان بە زنجیر بۆ لوتکەی منارەکان بەرز دەکردەوە. هەرچی ناو گەڕەکەکانە، وادیارە بانگەبانگی کۆنەفرۆشان کە بەشەقامەکاندا دەسوڕێنەوە و شتی کۆن کۆدەکەنەوە وچانی بۆ نیە. لە گۆڕەپانی قوتابخانەکانەوە، دەبیرستان، دەنگی ئەو منداڵانە دەبیسترێ کە بەبێ پسانەوە بەدەنگە تیژ و یەکسەمتەکەیان هەندێ ئایەتی قورئان دەڵێنەوە. لە شەویشدا لە پەنجەرە روناکەکانی نەخۆشخانەوە دەنگی گفتوگۆی سەیری شێتێکت دێتە بەرگوێ، تێیدا بەدەنگی بەرز و بەزمانێك جگە لە خۆی کەس تێی ناگات گوزارشت لەوە دەکات کە لە مێشکیدایە.

گەرماوە گشتیەکانیش تەمی هەڵمی ئاوی گەرم و بۆنخۆش دایدەپۆشین. لە ئەشکەوتەکانی ئەرمەنیشەوە بۆنی شەرابی رەسەنی گەییو دەهات، بەبێ گوێدانە زرنگەی شمشێرەکانی مەغۆل. هەرچی ئەو ژنە عەڕافانەن کە جامی ئاو بەدەستیان بەرز دەکەنەوە، لەڕێی شلەی کۆبووەوە، رووی ژیانی شاراوەی ئەو ئافرەتانەیان ئاشکرا دەکرد، کە بە حەپەساوی لەدەویان ئەڵقەیان دەبەست.

ئەو بیانییانەی لە خۆرئاواوە دێن هەمیشە دەڵێن قۆنیە شارێکی زۆر گەورەیە و لە شارێکی دوور دەچێ کە دەکەوێتە ناوەڕاستی دەشتێکی بەپیت لە بەری چەپی روبارێکی پانوپۆڕ، کە پێی دەڵێن کۆلۆنیا. هەرچی ئەو بیانییانەن لە خۆرهەڵاتەوە دێن دەیچوێنن بە بەغدا، بگرە بە شاری هامبی کە شوێنەکەی زۆر دوورترە.

پێش گەیشتنی بە ئەنادۆڵ "رۆژهەڵات"، یان "ئەناتول" وەك هاوڕێ یۆنانیەکەم "زریانوس" بەو شێوەیە دەریدەبڕێ، شەمسی تەورێزی تەنیا یەك خواستی هەبوو، ئەویش گەیشتن بوو بە مامۆستایەکی راستەقینە، مامۆستایەکی رۆحی. لەبەرئەوە سەرتاپای وڵاتی تەی دەکرد و لە وڵاتێکەوە دەچوو بۆ یەکێکیتر. شەمس پێشتر لە زێدی خۆی لە تەورێز لەسەر دەستی شێخێك خوێندبووی بەناوی "سەبەتەچن"، هەرچی دەیزانی هەر ئەوە بوو ئەو یەکەم مامۆستایە فێری کردبوو. بەڵام زۆر درێژەی نەکێشا شەمس بەجێی هێشت تا بەشوێن مامۆستایەکدا بگەڕێ بتوانێ شتێکی تێدا "ببینێ" کە نە سەبەتەچنەکە و نە هیچ کەسێکیدی نەیبینی.

وەك ئاژەڵێکی کێوی لە گەڕان کۆڵ نادات، شەمس لە شارێکەوە دەچوو بۆ شارێکیتر، وەرز دوای وەرز، بەشکو ئەمە خوایە راوچیەکەی بدۆزێتەوە. ئەم گەڕان و سووڕانە بەردەوامە گەیاندیە بەغدا و لەوێ شێخێکی ناسراوی بینی. ئەو قسانەی پێکەوە کردیان بەخێرایی بڵاو بوونەوە و گەیشتنە کۆشکی خەلیفە. لە گەرماوە گشتیەکان و مەیخانەکاندا، کە سەربازان تێیدا پشوویەك دەدەن پێش ئەوەی دەربچن تا لەسەر دەستی مەغۆل سەرببڕدرێن، بڵاو بوونەوە. بەڵام شەمس بێ ئۆقرە بوو. ئەوەبوو لەو تاکە دیدارە زۆر کورتەدا لە شێخی پرسی چی دەکات، شێخیش وەڵامی دایەوە "من مانگ لە ئاوی تەشتدا دەبینم"، شەمس بەو قسەیە یەکسەر هەستی کرد ئەو شێخە دادی ئەو نادات و بەتەنزەوە وەڵامی دایەوە "ئەگەر ملت دومەڵی تێدا نەبێ، بۆچی راستەوخۆ تەماشای مانگ لە ئاسماندا ناکەیت؟".

بەو وشانە شەمس حەماسەتی ئەو شێخە خەیاڵپڵاوەی تێکشکاند، شێخەکە کە پەرۆش بوو ببێتە مامۆستای ئەو پیاوە، تکای لێکرد بمێنێتەوە و ناوینا "وریا"، رابەر (مورشید)، "یاوەر"، بەڵام ئەو پیاوە نامۆ و تەمومژاوییە رازی نەبوو، شێخەکە بەسەر شانیدا دایە پرمەی گریان، خەمباری خۆی بەگوێیدا چرپاند، جلەکانی خۆی دادڕی و سینگی رووتی هێنایە پێشەوە تا شەمس ببینێ، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەی بەبا چوون، چونکە یەکێك لە چوار شتە مەحاڵەکە بوو شەمس "ی باڵندە" بگیرێ.

لەگەڵ ئەوەی هەستی بە هەندێ بەختەوەری کرد لە رەتکردنەوەی کاریگەریی ئەو پیاوە، کە دەروێشەکانی ئەوکاتی بەغدا بە "نووری خیلافەت"یان دادەنا، شەمس زانی ئەو کاتی خۆی لەگەڵ کەسێکی بێنرخی لەو شێوەیە بەفیڕۆ دەدات.

"تۆ بەکەڵکی هیچ نایەیت. تۆ شایانی هاوڕێیەتیی من نیت".

ئەوە دووایین قسەی شەمس بوو پێش لەوەی پشت بکاتە شێخەکە و بەغدا بەجێ بێڵێ. کەس بەتەواوی نەیزانی ئەو کێیە، چونکە وەڵامی هیچ پرسیارێکی شەخسی لەبارەی خۆیەوە نەدەدایەوە، بژێویی خۆی لە وتنەوەی قورئان و ئوسوڵی دین بە منداڵان پەیدا دەکرد، هەندێ جاریش لە بیناسازی یان بۆیەچێتی یاخود گەچکاریدا کاری دەکرد، بەڵام حەزی نەدەکرد وا بزانرێ سۆفی یان مامۆستا یان کرێکارێکی ناکارامەیە، بەڵکو خۆی وەك کەسێکی بێگانە دەناساند، کە لە جوڵەی جیهاندا هەڵواسراوە. هەرکات بگەیشتایەتە شارێکی تازە لەگەڵ ڕێبوارانیتر لە خان (کاروانسەرا)یەك دەمایەوە، وای پێ باش بوو خۆی وەك بازرگان بناسێنێ نەك پیاوی ئاین یان مامۆستایەکی ڕێزدار.

لەبەرئەوەی مەعریفەکەیشی، هاوشێوەی غەریزەکەی، سەرسوڕهێن بوو، بەزۆری داوای لێ دەکرا لە خانەقا، تەکیەی دەروێشان یان لە قوتابخانەیەکدا بمێنێتەوە کە هاوشێوەکانی لەدەوری بن، بەڵام ئەو بەو داوایانە ڕازی نەدەبوو و بەوە وەڵامی دەدانەوە کە لەبەرئەوەی کەسێکی غەریبە، دەبێ لە کاروانسەراکاندا، کە گوزەرگەن، بمێنێتەوە. بەڵام ئەوانەی ئەو ڕێبوارەیان دەناسی ناویان نابوو باڵندە (الطائر). دەڵێن سەرانسەری دنیا گەڕاوە پێش ئەوەی بگاتە قۆنیە کە جەلالەدین محەمەد بەڵخی، ناسراو بە ڕۆمی، تێدا دەژی، چونکە بەشێکی زۆری ژیانی لەم شارەی سەر بە قەیسەرەکاندا بەسەر بردوە، کە قوتابیەکانی بەناوی "مەولانا" بانگیان دەکرد و شەمس تەنیا بە پیتی م ئاماژەی بۆ دەکرد.

دەستەکانم دەسووتێنەوە کاتێ ئەوە دەنووسم کە بەچاوەکانم بینیم، بەڵام نامەوێ بەخێرایی درێژە بە نووسین بدەم. ئەوکاتە، هێشتا ڕێگەوبانەکان مەترسیدار بوون و وەك ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنووسم گوزەریان پێدا نەدەکرا. ئەوە بوو نەوەکانی جەنگیزخان دایان بەسەر ئەو خاکەدا، ئەوکاتەی (چورماغان)ی جەنگاوەر جڵەوی بۆ لەشکرەکەی کە ژمارەیان لە سی هەزار پیاو زیاتر بوو، شل کرد و چی خراپە بوو تێیدا کردیان، لە تاڵان و ڕاوڕوت و کوشتن و سەربڕینی خەڵکی شارە کۆنەکە، کە پێدەچێ لەباتی بەرگریکردن لە خۆیان، خۆیانیان وەك کاوکۆت دەرخوارد دابن.

هاتوچۆکانی شەمس زۆر پشتی بە جموجوڵە نارێکەکانی لەشکرە شاڵاوبەرەکانی مەغۆل دەبەست، ئەوکاتە سەرجەم ئەو خاکانەی لە سندەوە تا تەنگەی قوستەنتینیە درێژ دەبوونەوە لەژێر هەڕەشەدا بوون، شەمس تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو کاتێ مەغۆلەکان تەورێزی زێدیان سووتاند، لەکاتی گەشتەکانیدا دەنگی هاوار و شین و ڕۆڕۆی خەڵکە زیرەکردوەکە دەگەیشتە گوێکانی، زۆر جاریش قسەیەکی دووبارە دەکردەوە کە وەك میوەیەکی وەرزی لە قەراغی ڕێگە کەوتبێ هەڵگیرابووەوە: "مەغۆل دێن، وێران دەکەن و دەسووتێنن و دەکوژن و تاڵانی دەکەن پاشان دەڕۆن".

بۆیان گێڕابوویەوە کە سوارێکی مەغۆلی دەچێتە گوندێکی ئاوەدان و سەرجەم خەڵکەکەی یەك بەیەك دەکوژێ، بەبێ ئەوەی کەسیان زات بکەن پەنجە بەڕوویدا بەرز بکەنەوە. لە شوێنێکیتر بۆیان گێڕابوویەوە

بەربەریەکی بێچەك فەرمانی بە دیلێك کردوە لەسەر زەوی پاڵ بکەوێ و لە شوێنی خۆی نەبزوێ، پاشان مەغۆلیەکە چووە بەئیسراحەتی خۆی بەدوای شمشێرەکەیدا گەڕاوە و پاشان گەڕاوەتەوە و سەری پیاوە نەگبەتەکەی بڕیوە، کە بێدەنگ و خامۆش لە چاوەڕوانی مەرگی خۆیدا لەجێی خۆی جوڵەی نەکردبوو.

شەمس رۆژێکیان گەیشتە دیمەشق و دیسان چیرۆکی ئەو خۆبەدەستەوەدانە سەیرەی لەبەردەم داگیرکەراندا بیستەوە.

"یەکێکیان بۆی گێڕایەوە: ئێمە هەژدە رێبوار بووین، لە رێگەدا مەغۆلیەك هاتە رێی کاروانەکەمان و فەرمانی پێکردین خۆمان بەیەکەوە ببەستینەوە. هاوڕێکانم بەهێمنی کەوتنە خۆبەستنەوە بەیەکترەوە، من تاکە کەس بووم ئەو فەرمانە کوشندەیەم رەت کردەوە. پێم وتن ئێمە هەژدە کەسین لە بەرانبەر یەك پیاو. بەڵام سوودی نەبوو، هەر لە خۆبەستنەوە بەردەوام بوون. لەپڕ خەنجەرەکەم دەرهێنا و قوڕقوڕاگەی ئەو مەغۆلیەم بڕی و ئەو ئیلتەشییە، پەیامبەرە مەغۆلیەکە، دەستبەجێ گیانی دەرچوو و ئێمەیش هەڵاتین و ئەسپ و گوریسەکانمان لەدوای خۆمان بەجێهێشت. بەڵام وادیار بوو هەندێ لە هاوکاروانەکانم پەشیمان بوون کە بەزیندوویی ماون".

لە دیمەشق کاتێ تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو، لاوێکی بینی کە کۆمەڵێ هاوڕێی رووخۆش دەوریان دابوو. لەبەردەمیدا چەمایەوە و دەستی ماچ کرد و وتی: "ئەی بگۆڕ (صرّاف)ی دنیای ماناکان، فریامان کەوە". بێگومان ئەو دەستەواژەی "سەڕاف" وا بەکار هێنا وەك ئەوەی پارەیەك بە پارەیەکیدی بگۆڕێتەوە.

بەڵێ، گەیشتە دیارترین زانستخوازانی شار. ئەوە رۆمیی لاو بوو، لەمەودووا بەو ناوە ناوی دەبەم، کە بۆ خوێندنی زانستەکانی ئاین و شەریعەت هاتبوو بۆ دیمەشق. دوور لە بەشداریکردنی شادومانیی ئەو غەریبەی داوای لێکرد دەستی بگرێ، رۆمی دەستی کێشایەوە، کە بەلیکی ماچە تەڕەکانی ئەو تکاکارە تەڕ بووبوو و چەمایەوە تا یارمەتی هەستانەوە سەرپێی ئەو پیاوە بدات کە لەبەردەمیدا چۆکی دادابوو. هەر هێندەی هەستایەوە خێرا دوور کەوتەوە و رۆمیی لاوی لە بەحەپەساوی بەجێهێشت. وەك بێموبالاتیی هەر لاوێك لەو تەمەنەدا رۆمی هیچ گرنگیەکی بەو دیدارە نامۆیە نەدا. بەڵام کەسەکەیتر–مەبەستم لە کەسەکەیتریش شەمسی تەورێزییە، واتە "باڵندە"– تێگەیشت ئەو لاوەی بەهەڵپە کتێب قووت دەدات، هێشتا کامڵ نەبووە و پێویستە جارێکیتر بگەڕێتەوە.

نا، نەخێر رۆمی هێشتا کامڵ نەبووبوو، هێشتا بیست و پێنج ساڵیتری پێویستە. لە رۆژێکی پایزدا کاتێ دەیویست قوتابخانەی بازاڕی لۆکە بەجێ بێڵێ، جارێکیتر هەر بەرێکەوت شەمسی بینیەوە کە لە خانەکەی بازرگانانی شەکر دەهاتە دەرەوە، ئەم دیدارە بوو کە ژیانی سەراوژێر کرد. پاشتر دەگەڕێمەوە سەر باسکردنی ئەو دیدارە.

بەئاستەم دەتوانم وشەکان لەسەر کاغەز تۆمار بکەم تا بەسادەیی باسی رۆمیی مامۆستام بکەم، ئەو پیاوەی هێشتا تەمەنم نەگەیشتبووە بیست ساڵ هاتە ژیانمەوە و ئیتر لەژیانم دەرنەچوو، ئەو پیاوەی شیعرەکەی کردە گوزارشتێکی پوخت و ساف لە عیشق و محیبەت، رێگەی راستەوخۆی بۆ لای خوا چوون. بەڵام ئەمەیە ئەرکی من، ئەو ئەرکەی پێویستە لە کۆتایی ژیانمدا ئەدای بکەم. جا ئەگەر من نەیکەم، ئەی کێ بیکات؟

ناوی راستەقینەی جەلالەدین محەمەدە،ساڵی ٦٠٤ی کۆچی (١٢٠٧ی زاینی) لە بەلْخ لە رۆژهەڵاتی ئێران لەدایك بووە. باوکی بە نازناوی "سولْتانی زانایان" بەناوبانگ بوو، چونکە دەوترا زانستی کامڵە. بەڵام دوای مشتومڕێك لەتەك فەیلەسوفی کۆشك "بادیشاه" ناکۆکی سەبارەت بە نازناوەکەی لەگەڵ خەڵکی شارەکە دروست بوو، رەنگە لەترسی سوپای مەغۆلیش بێ کە بەناچاری ساڵی ٦١٨ك زێدی خۆی بەجێهێشتووە، ئەویش کاتێ کوڕەکەی، واتە مامۆستاکەی من پاشتر، هێشتا تەمەنی چواردە ساڵ بووە.

گەشتەکەیان دوور و درێژ بوو، لە بەغدا باوك و کوڕە جحێڵەکەی چاویان بە پێشەوای زانا و عارف سەهرەوەردی کەوت. لە دەروازەی پایتەختی خیلافەت پاسەوانەکان وەك چۆن لە هەر بێگانەیەکیان دەپرسی لێیان پرسین لەکوێوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن؟ سولْتانی زانایان، واتە باوکی رۆمیش وەڵامی دانەوە: "لەلای خواوە و بۆ لای خوا و هیچ هێزێکیش بەبێ خوا نیە". کاتێ ئەم وشانە گەیشتنە گوێی شەهابەدینی سەهرەوەردی، بەپەلە خۆی گەیاندە سەردانیکەران. بەگەرمی سڵاوی لە باوکەکە کرد و ئەژنۆی کوڕەکەی، واتە رۆمیی ئایندەی، ماچ کرد، کە سواری ئەسپێك بوو. دەوترێ، گەورەم وەك یادگاریەکی ئەو دیدارە —کە ئەوە رەنگە شتێك بێ تەنیا خەیاڵی هەندێ لە راویەکاندا رووی دابێ— چەند تاڵە موویەکی سووری ئیمامی عارفی لای خۆی پاراستوە، کە لەکاتی ماچکردنی جلەکانیدا پێوەی نووسابوون.

دوای ئەوە، کاتێ سەهرەوەردی تەمەنی گەیشتە سی و شەش ساڵ حاکمی شاری حەلەب، کە کوڕی سەڵاحەدین بوو، کوشتی، کە خۆی بە یەکێك لە شوێنکەوتە دڵسۆزەکانی دەناساند. بەڵام پارێزگاریی بەهێزترین شوێنکەوتەکانی ئیمامی عارف هیچ سوودی نەبوو لەبەردەم تۆمەتبارکردنی بەزەندەقە کە پیاوانی کۆشك بۆیان هەڵبەست، ئیمامی عارف نەیتوانی خۆی لە شەڕی ئەو رق و کینەیەی لە ناخیاندا بوو بەرانبەری، بپارێزێ. جا لەنێوان باوکی سولْتان و ئەو هاوڕێیەیدا کە باوەڕی بە غەیبیات هەیە، حاکمی حەلەب باوکی سولْتانی هەڵبژارد و بەدڵێکی پڕ کەسەرەوە فەرمانی دا بەکوشتنی مامۆستا زاناکەی.

لە رێگەی هەڵاتنی دوور و درێژدا ئەو پیاوەی دەبێتە مامۆستام، واتە کوڕی سولْتانی زانایان، لە نیسابور چاوی بە شاعیری سۆفی فەریدەدین عەتار دەکەوێ، کە کاری بۆنفرۆش (عطار) بوو. عەتار دانەیەك لە کتێبەکەی بەناونیشانی "ئەسرارنامە"ی پێشکەش کرد کە کۆمەڵێ هۆنراوەی تێدا بوو رۆمی لە

خوێندنەوە و لێوەرگرتن و وتنەوەیان نەدەوەستا، ئەگەرچی خۆی لەڕووی شکڵ و ناوەڕۆکەوە ئاستی بلیمەتیی ڕۆحی و شیعری عەتاری تێپەڕاندبوو. هەموو ئەوانەی ئامادەی ئەو دیدارە بوون گوێیان لە عەتار بووە بە سوڵتانی زانایانی وتوە: "کوڕەکەت بەخێرایی گڕ بەردەداتە پوش و پەڵاشی جیهان".

تەنانەت ئەگەر عەتاریش ئەو قسەیەی نەکردبێ، تەنانەت ئەگەر ئەوە تەنیا قسەیەکی بریقەدار یان هەڵبەستراویش بێ، ئەوا ڕۆمی هەر بەڕاستی، پڕبەپڕی مانای وشەکە، گڕی بەردایە جیهانی ڕۆحی، کە لەوانەیە ئەوە جیهانی راستەقینە بێ، لەو گڕ تێبەردانەیش بەردەوامە.

هەروەها وتراوە کاتێ کاروانەکە نیسابوری بەجێهێشتووە، عەتار کاتێ کوڕەکەی بینیوە لەدوای باوکیەوە دەچێ وتوێتی: "سوبحانەڵا، من دەبینم ئۆقیانوس لەدوای دەریاوە دەچێ".

لە یەکێك لەو شارانەی لەکاتی هەڵاتنەکەیاندا تێیدا وەستاون، ڕۆمی لە تەمەنی هەژدەساڵیدا جەوهەری کچی یەکێك لە خانەدانەکانی شاری لارندەی مارە کرد، هەمیشە ناوی ئەو شارەم لەیاد دەبێ، چونکە گەورەم لە هەندێ لە قەسیدەکانیدا وەسفی تامی میوەکانی کردوە کە لەبیر ناکرێ، بەتایبەت "شفتالو" یەکێکە لە جۆرە ئاودارەکانی قۆخە.

جەوهەر دوو کوڕی بۆ هێنایە دنیا، یەکەمیان سوڵتان وەلەد بوو کە ڕۆمی دەیوت زۆر لەو دەچێ. سوڵتان بوو بە سێبەری باوکی و لە وەرگرتنی سەرجەم بڕیارەکانیدا، چەندە دژیەك یان سەرچڵانە بوونایە، یارمەتی دەدا، بەڵام عەلا، کوڕی دووەم، کوڕە بێگوێ و لاسارەکەی باوکی بوو، ئەویش بوو بە "سێبەر"ی باوکی، بەڵام سێبەرێکی تاریك و پڕ لە هەستی رق و کینە و دوژمنکاری. ڕۆژێ لە ڕۆژان عەلا بوو بە هۆی ڕۆیشتن، "دیارنەمان" و هەندێ دەڵێن کوشتنی "خواوەندی باوکی"، شەمسی تەورێزی.

ئەوە شەمس خۆیەتی کە، وەك نووسیومە، دوای بیست ساڵ خۆی لە قۆنیە بینیەوە، ئەویش لە ٢٦ی جەمادی دوویی ساڵی ٦٤٢ی کۆچی (٢٣ تشرینی یەکەم/ئۆکتۆبەری ساڵی ١٢٤٤ی زاینی) لای دەرگای خانەکەی بازرگانانی شەکر، کە وەك هەر بازرگانێکی کارامە بەدوای دەگمەنترین کاڵاکاندا دەگەڕا.

وا دەهاتە پێش چاو بوونی دوو کوڕەکە کاتی مردنی ڕۆمی ململانێی ئەبەدیی نێوان خێر و شەڕ بەرجەستە دەکات. ئەوان لە دوو باڵەکەی فریشتە جبریل دەچوون، باڵی روناکی –باڵی راست– کە سروشتی نموونەیی لێ دەکەوێتەوە (سوڵتان وەلەد)، باڵی سێبەریش –باڵی چەپ، بەمانایەکیتر ئەو ڕۆحەی بۆ جیهانی نەوی دادەبەزێ و عەلا بەرجەستەی دەکات.

ڕۆژێکیان ئیتر هەڵاتنیان کۆتایی هات. چیدی دەریا نەدەڕۆیشت و ئۆقیانووسیش کەوتە هەڵقوڵین. بەبانگهێشتکردنیان لەلایەن سوڵتان کەیقوبادەوە –خوا ڕۆحی پیرۆز بکات– ڕێگەی قۆنیەیان گرتەبەر و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ تێیدا ئۆقرەیان گرت و ئیتر لە سوارانی بێبەزەیی دەشت و چۆڵەوانیەکان و کەسانی نەمەکنەناس پارێزراو بوون.

دەریا داچوو و ئۆقیانووس هەڵچوو. ڕۆمی دەستی کرد بە خوێندنی زانست و مەعریفەی باوکی. کاتێ باوکی وەفاتی کرد مەولانا تەمەنی لە بیست و چوار ساڵ تێپەڕی نەکردبوو. ئەو لاوە بەو زەبرەی بەمردنی باوکی پێی گەیشت زۆر خەمبار بوو، چونکە بەوە تەنیا باوکی لەدەست نەدا، بەڵکو باشترین مامۆستایشی لەدەست دا. ئیتر زانستەکەی بەناتەواوی دەمێنێتەوە و دەبێ چاوەڕوانی هاتنی مامۆستایەکیتر بکات. ڕۆمی ساڵێکی ڕەبەق گوێقوڵاخ چاوەڕوان بوو.

وەك چەقۆیەکی تیژ کە ئاوریشم دەبڕێ، مەغۆل بەرەو ئاوابوونی خۆر پێشڕەوییان کرد، بەر لە گەیشتنی سوپای مەغۆل ئێرانیەکان هەڵاتن، زۆریان لە قۆنیە گیرسانەوە. هەندێ وتیان بیستویانە چۆن فەقیهی ناسراوی شاری بەڵخ بورهانەدین تەرموزی لەناکاو دەرسەکەی بڕیوە و هەناسەیەکی هەڵکێشاوە و هاواری کردوە "ئەی داد و بێداد! شێخەکەم سوڵتانی زانایان لە دنیای خاکەوە چوو بۆ دنیای پاك، کوڕەکەی بەتاسەوە چاوەڕوانم دەکات، بۆیە دەبێ بچم بۆ قۆنیە و ئەو ڕاسپاردەیەی بدەمە دەست کە شێخەکەم لای داناوم".

شتێکی سروشتییە لەو زەمانەدا کە پشێوی و پاشاگەردانی دنیای گرتبووەوە خەون و موعجیزە و ڕێکەوتی سەیر و پێشبینیکردن لە سەرتاسەری دنیادا بڵاو ببنەوە. کاتێ ڕۆمی ئەوانەی دەبیست هیچ گرنگیەکی پێنەدەدان و تۆسقاڵێك حەقیقەتی تێیاندا بەدینەدەکرد. تەرموزی لە چ سیستمێکدا ئەم قسانەی کرد، بەچ شێوە و لە چ کاتێکدا؟ ڕۆمی هیچ گرنگیەکی بەم شتانە نەدا، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەیزانی تەرموزی دێت و خوێندنەکەی تەواو دەکات، کە دوای مردنی باوکی زۆر لەکەمی دابوو. هەرچی تەرموزییە دەیزانی ڕۆمی پێویستی بە مامۆستایەك هەیە و پێویستە بەزووترین کات خۆی بگەیەنێتە ئەو کوڕە خەمبارە و فێری وشەی ڕاسپاردە (ئەمانەت)ی بکات، چونکە ئەو فێرکردنە باشترین دیارییە بکرێ پێشکەشی بکات.

گەیشتنی مامۆستا بەساڵاچووەکە بە قۆنیە ڕۆمی پڕ کرد لە حەزی نوێ، چونکە تەرموزی لە جۆرەکانی زانستدا تاقی کردەوە و لە کۆتایی تاقیکردنەوەکەدا پێی وت: "لە سەرجەم زانستە ئاینی و یەقینیەکاندا بەسەد پلە ئاستی باوکت تێپەڕاندوە، بەڵام باوکی مەزنت لە زانستی قیلە و قالە[١] و زانستی حاڵدا کامڵ بوو".

بە گەورە تازەکەی وت "ئێستا دەمەوێ بچیتە سەر ڕێچکەی زانستی حاڵ"، "من ئەم مانایەم لە باوکتەوە پێ گەیشتوە، تۆیش ئەوە لە من بەدەست بێنە، تا بە دیار و نادیار میراتگری باوکت بیت و ببیتە چاوی ئەو".

---

[١] (قیل و قال)، واتە وترا و وتی. لەبەرئەوەی بەسیغە عەرەبیەکەی زۆر لەسەر زمانە و ئەو دوو وشەیە لە زانستە شەرعیەکاندا بەکار دێن، حەزم کرد وەك خۆیان بیانهێڵمەوە. عومەر.

تەرموزی راستی دەکرد، چونکە رۆمی ئەو زانستانەی نەبوو کە بە خوێندنەوەی تێزە عیرفانیەکان بەدەست نایەن، بەڵکو بە رامان و گۆشەگیری بەدەست دێن. وەك مردوو خۆی دایە دەست مورشیدە تازەکەی کرد تا بگاتە ژیانی ئەبەدی، هەروەها تا باڵندەی رۆحی لە فەزای پاکێتی و سەفادا لە شەقەی باڵ بدات. پاشان کوڕە لەدڵا شیرینەکەی، سوڵتان وەلەد، بەم بەیتانە وەسفی ئەو توانەوەیەی کردوە:

**بوو بە موریدی لە قووڵایی رۆحیدا و سەری دانەواند و**

**وەك مردوو لەبەردەستیدا بەرز کرایەوە،**

**کاتێکیش لەبەردەستیدا مرد زیندووی کردەوە،**

**گریانی بوو بەسەریەوە کە هێنایە پێکەنین.**

بەم شێوەیە تەرموزی موریدە گەنجەکەی نارد بۆ دیمەشق و حەلەب بۆ خوێندن.

رۆژێکیان لە مەیدانی دیمەشق، کاتێ بەرێگاوە بوو بەرەو قوتابخانە، ئەو کوڕە لاوە بۆ یەکەم جار چاوی بە دەروێشێکی باریکەلە کەوت، تکای لێکرد "دەستی بگرێ". وەك پێشتر وتم دیدارەکە بەرهەمی نەبوو و رۆمی گەڕایەوە بۆ لای هاورێکانی، ئەویش کاتێ دەروێشەکە، واتە شەمسی تەورێزی، هەستی کرد هێشتا "پێنەگەییوە"، هێشتا "کاڵ" بوو.

رۆمی ئەوەی دەزانی. کاتێ گەڕایەوە قۆنیە بەفەرمانی تەرموزی سێ خەڵوەتی لەدوای یەکی ئەنجام دا، کە هەزار و یەك رۆژیان خایاند، ئەوەیش ژمارەیەکە، بەگوێرەی بەهای ژمارەیی پیتەکان، رەزامەندی دەگەیەنێ.

لە کۆتایی ئەو ئەزموونە درێژەدا، وەسفێکی تێروتەسەلی سەبارەت بە بینینە ناوەکی (باتنی)یە زۆرەکانی پێشکەش بە تەرموزی کرد. لە یەکێك لەو بینینانەدا وتی: "تۆم بینی. گوێت لە رێنماییەکانی باوکم دەگرت. ئاگر لووشی دەدای، هەردوو پێت لەسەر ئاگردانەکە دانا و بەدەستی خۆت پشکۆ گسووتاوەکانت راکێشا".

مامۆستاکە قوتابیەکەی ماچ کرد و پێی وت: "ئێستا ئیتر هەموو نهێنیەکانی باتن و نهێنی رێچکەی ئەهلی حەقیقەتەکان و دۆزینەوەکانی رۆحانییان و بینینی شتە غەیبیەکانت بەدەست هێناوە". لەوێدا ئیتر قۆناغی فێرکردنی کۆتایی هات و "راسپاردە"کەی دایە دەست. ئەوەتا ئێستا قوتابیەکە پێشی مامۆستاکەی دەداتەوە.

تەرموزی دوای ئەوەی دە ساڵ لە قۆنیە مایەوە، بڕیاریدا بچێ بۆ شاری قەیسەریە، رەنگە لەبەرئەوەی هەستی کردبێ تینووەکە ئیتر پێویستی بە جۆگەیەك هەیە کە لە کانیاوێکەوە هەڵدەقوڵێ چیتر هی ئەو نیە، لەبەرئەوە داوای لە قوتابیەکەی کرد رێگەی بدات ئۆغر بکات، بەڵام ئەو بەداواکەی رازی نەبوو،

لەبەرئەوە مامۆستاکەی ناچار بوو بەگوێی ڕۆمی نەکات و بەبێ ڕەزامەندیی ئەو کەسەی زۆر هۆگری بوو ئۆغری کرد.

لە ڕێگەی چوونیدا بۆ قەیسەریە، ئەسپەکەی تەرموزی بەلەسە بوو، جڵەوی لەدەستیدا نەما و بەری دایەوە و پێی شکا. کاتێ بۆ چارەسەر ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ قۆنیە، قوتابیەکەی بینی کە پێداگری کرد هەر دەبێ خۆی کەوشەکانی بۆ دابکەنێ. ڕۆمی بەدەم یاریکردن بە پەنجەکانی پێ شکاوەکەیەوە لێی پرسی: "بۆچی خۆتمان لێ بەدوور ئەگری؟" پیرە عارفیش وەڵامی دایەوە "شێرێکی بێئامان نزیك ئەبێتەوە. ئەو شێرە، منیش شێرم، ئیتر ناسازێین".

ڕێنماییەکانی تەرموزی، پەیامەکانی ئەو هەقگەیەنە، کە ڕۆمی شەلاڵیان بووبوو، چووبوونە ناخیەوە، بەناو سەرجەم دەمارەکانیدا ڕۆچووبوون. سەرەنجام ڕێگەی بە پیرە حەکیمی عارف، بیرەکە، دا ئۆغر بکات. ئیتر ئێستا ئامادەیە بۆ پێشوازیکردن لە شێرە پێشبینیکراوەکە، واتە شەمسی تەورێزی و لێتێگەیشتنی.

بەڵام پێش ئەوەی ئەو وەحشە بگاتە قۆنیە، شارەکە کوڕی سوڵتانی زانایانی، کە تەمەنی گەیشتبووە سی و شەش ساڵ، بە میراتگری شەرعیی باوکی دامەزراند. گەیشتبووە ئاستی شکۆ و خەڵك ئیتر بە "مەولانا" بانگیان دەکرد. ئەو قوتابخانەیەی وانەی تێدا دەوتەوە هەرگیز لە مورید خاڵی نەبووە، ڕۆژانە چوارسەد فێرخواز ئامادە دەبوون، کە زانای ئاینی و حاکم و میریان تێدا بوو، بگرە سوڵتان خۆیشی ئامادەی وانەکانی دەبوو. ڕۆمی کە هەمووان ڕێزیان دەگرت و بەپیرۆزیان دادەنا، کەس لە زانست و فێرکردندا شانی لە شانی نەدەدا، لوتکە بوو، نوورێکی بێ وێنە بوو.

بەژن چوارشانە، لوت باریك، چاو پان و هێمن بوو، کە دوو برۆی هەندێ پڕ گەورەیان کردبوون، پرچی سەر و ریشی خەریك بوو ماش و برنج دەبوو. لێوی سەرووی کەوانێکی نایابی دروست کردبوو. بەنەرمی دەچوو بەڕێگەدا و بەردەوام لە بیرکردنەوەدا نوقم بوو، وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە هەمیشە لە داڵانەکانی قوتابخانە، لە مزگەوت لە سەرجادە و لە گەرماو (حەمام) ئاراستەی دەکران. میهرەبان بوو، بەڵام پارێزگاری لە مەودایەکی بچوکی ناوبانگ دەکرد، کە دەوری پیاوێکی دابوو کە نرخ و سەرچاوەی شکۆی ئەو ناوبانگەی دەزانی. هەندێ جار پەردەی رامان و تێفکرین روویان مۆن دەکرد وەك ئەوەی بەنهێنی گەڕابێتەوە بۆ ناو ناخی خۆی و لە پێچ و پەناکانی یادەوەریدا بەدوای دەستەواژەیەکی دوور، نموونەیەك، وردەکاریەك جگە لەو کەس نایزانێ، هەڵبژاردنێك، یاخود تروسکاییەکی لەناکاودا بگەڕێ.

بەڵام ئەو ساتانە دەگمەن بوون. زۆربەی کاتەکان بەبێ ئەوەی پرسیاری لێ بکرێ ئازادانە قسەی لەسەر بابەتی جۆراوجۆر دەکرد. لە قسەکانیدا بیرۆکەکان یەك بەدوای یەکدا ڕێچکەیان دەبەست بەبێ ئەوەی خۆ ماندووکردنێکی بەرچاوی پێوە دیار بێ، بەوە بیسەرانی تووشی سەرسوڕمان دەکرد، وەك ئەوەی هەموو

ئەوانە لە مێشکیدا تۆمار کرابن. ئەمە ئەو پیاوەیە کە لە کاتێکی ئایندەی ژیانیدا و زۆرجار، داوای بێدەنگی دەکات و پێی شادومان دەبێ.

روومەتی زەرد و لاواز ، هەردوو دەستی سپی بوون و لەکاتی قسەکردندا بەکەمی دەیجولآندن وەك ئەوەی دەنگی، لەو ساتانەدا، پێویستی بە شتێکیتر نەبێ تا گوزارشت لە خۆی بکات و قەناعەت بە گوێگرانی بێنێ. پۆشاکەکەی قشت و سەنگین بوو.

ئاماژەی بۆ کتێبێك دەکرد و بەیەکێك لە موریدەکانی دەوت: "بیکەوە تا هەر لاپەڕەیەك دەتەوێ"، موریدەکەیش بەگوێی دەکرد و یەکەم دوو وشەی لاپەڕەکەی دەخوێندەوە، پاشان رۆمی پێی دەبڕی و باقی لاپەڕەکەی بەدەم چاو نیمچە داخراوی تەواو دەکرد، بەبێ ئەوەی هەڵە بکات، پاشان ئەوەی خوێندبوویەوە راڤەی دەکرد.

کاتێك کەسێك بێزاری دەکرد هێمنی خۆی لەدەست نەدەدا، لەگەڵ ئەوەی سەرنجەکانی زۆر جار توند بوون. زۆربەی کاتەکان زوو لە کۆبوونەوەکان دەکشایەوە و تا درەنگانی شەو کاری دەکرد، کتێبی نوێی دەخوێندەوە و دەرسەکانی حازر دەکرد. زۆرجاریش یەکێك لە دیوانەکانی شاعیری سۆفی (عەتار)ی، کە بەمامۆستای خۆی ناوی دەبرد، لەگەڵ خۆی دەهێنا.

لەکاتی نووسینی ئەم چیرۆکەدا هاوڕێ یۆنانییەکەم (زریانوس)م بیر دەکەوێتەوە، ئەو پیاوەی دەستی گرتم و بردمیە ناو بازنەی زۆر داخراوی موریدانی رۆمی. تەمەنمان لێك نزیك بوو، دەوروبەری بیست ساڵان. وەرزشمان دەکرد و بەشادومانیەوە پابەندی رێساکانی گرووپەکە دەبووین، کە تێیدا سەماکردن بووبووە شێوەیەك لە شێوەکانی نوێژ. تا ئەمڕۆیش کە چوومەتە تەمەنم و ئێسکم لاواز بووە، ناتوانم ئەو ساتە بێکۆتایانەی راهێنانی وەرزشیم بیر بکەم کە لەگەڵ زریانوسی هاوڕێمدا بەسەرم بردن. وەك کە فێری کردم چۆن دار بەدەستەوە بگرم، فێری بنەماکانی سۆفیگەریشی کردم.

هێندەی بێتەوە بیرم، زریانوس لە دوکانی سەرتاشەکە دەرنەدەچوو، قژێکی چڕوپڕی هەبوو، وا دەهاتە پێش چاو وەك ئەوەی هەموو ساتێك بەبەرچاومانەوە سەوز ببێتەوە.

قەرزای مەولانا بوو بەژیانی. رۆژێکیان کاتێ رۆمی بەسواری ئەسپەکەی بەبازاڕدا تێدەپەڕی تا بچێتە سەر مەزاری باوکی، کەمێك هێواشی کردەوە تا سەرسامیی خۆی بەهەندێ ئەسپی عەرەبی دەرببڕێ کە ئەسپەوانەکانیان پاکیان دەکردنەوە و دەیانخوراندن و شانەیان دەکردن. لە چاوی ئەسپەکاندا ماندوێتیی ساڵانی رابردوو و ئایندەی دەبینی، بۆنی سەنێری ئەسپی کرد. دەیتوانی بە حیلەکەیاندا ئەسپی ئامادەکراو بۆ شەڕ و ئەسپی ئامادەکراو بۆ ئاهەنگەکان و ئەسپی پێشبڕکێ بناسێتەوە. لە گەرمەی ئەو غەڵبەغەڵب و قەپوقاڵەدا لەپڕ بەرگوێی کەوت کە جەللادەکان سزای کوشتن بەسەر لاوێکی یۆنانیدا جێبەجێ دەکەن.

"چی کردوە" رۆمی پرسی و لە سەربازەکان نزیك کەوتەوە.

سەربازەکان دەستبەجێ رۆمییان ناسیوە، کە زانیاریەکانی بەناوبانگترین زانایانی لە جیهانی شارستانیەوە کەمەندکێشی قۆنیە کردوە.

"ئەوە یۆنانییە. کەسێکیانی کوشتوە" فەرماندەکە وەڵامی دایەوە.

رۆمی لە ئەسپەکەی دابەزی و رووی کردە تاوانبارەکە، کە روومەتە ترساو و زەردهەڵگەڕاوەکەی، دەشتە بەبەفر داپۆشراوەکانی قۆنیەی پێش شاڵاوەکەی مەغۆلی، بیر خستەوە. هەردوو دەستە تەزیو و لاوازەکەی ئەو پیاوە بێچارەیەی پرواند کە لە دوو کرمی درێژی پێچراو دەچوون. پاشان رۆمی عەباکەی دا بەسەر لاشەی لەرزیوی تاوانبارەکەدا. ئەم دەستپێشخەرییە ئەوەی دەگەیاند پیاوە یۆنانییەکە هاتووەتە پەنای ئەو و کەس —نە سوڵتان و نە ئەمیر و نە وەزیر– دەسەڵاتی ئەوەیان نیە ئەو پارێزبەندیەی لێ بکێشنەوە.

دەستبەجێ فەرماندەکە جوابی نارد بۆ سوڵتان، ئەویش وەڵامی بۆ ناردەوە "بەندکراوەکە ئازاد بکە، چونکە چووەتە پەنای رۆمی، قازیی قازییان، مادام لەبەر ئەو یۆنانییە هاتووەتە ناوەوە، ئەوا دەتوانێ رەحمەتێك لە منەوە بەدەست بێنێ کە بەشی تەواوی شارەکە دەکات".

لەسەر فەرمانەکەی سوڵتان جەللادەکان زنجیری گەردنی بەندکراوەکەیان کردەوە و بەڕێزەوە رادەستی پیاوانی دەست و پێوەندی مەولانایان کرد. کابرای یۆنانی لەوێدا لەبەردەم رۆمیدا کەوتە سەر چۆك و ئەو قوڕەی ماچ کرد کە بە پێڵاوەکانیەوە نووسابوو.

"ناوت چییە" رۆمی لێی پرسی

"زریانوس"

"لێرە بەدوواوە ناوت بووەتە عەلا زریانووس"، رۆمی ئەمەی وت و لەناخی خۆیشیدا خوازیار بوو ئەو پیاوە کە بە موعجیزە لەمردن رزگاری کرد و ناوی دووەمی پێ بەخشی، جێگەی عەلای کوڕی بگرێتەوە، کە لە هەموو شتێکدا لێی جیا بووەتەوە جگە لە پەیوەندیی خوێن.

کاتێ زریانوس پاش موسڵمانبوونی خەتەنە کرا و بەسەرپەرشتیی مامۆستاکەی زانستەکانی ئاینی رەوان کرد و کەوتە نوێژکردن و رۆژووگرتن، ئەویش وەك مامۆستاکەی هۆگری تەفسیری قورئان و شەرحکردنی فەرمودەکانی پێغەمبەر بوو.

لە رۆژێك لە رۆژانی زستان، کاتێ زریانوس بۆ نوێژی بەیانی رووی کردە تەکیە سارد و تاریکەکەی مامۆستاکەی، بینی رۆمی لەسەر زەوی پاڵ کەوتوە و لەناوەڕاستی کۆمەڵێ مۆمی تواوەدا خەوی لێ کەوتووە، هێشتا لەباری سوژدەبردندا بو و ریش و سمێڵی بەر خشتە شەش لاکەی زەوییەکە کەوتبوون. کابرای یۆنانی لێی نزیك کەوتەوە و چەند دڵۆپێکی بەستووی لە هەردوو گۆشەی چاوی مەولانای نووستوودا بینی، بەوە زانی مامۆستاکەی کە هەموو شەوەکەی لە شەونوێژدا بەسەر بردوە، گریاوە. بەئەسپایی

خەبەری کردەوە و داوای لێکرد ڕێگەی بدات ئاوێکی گەرم بە دەموچاویدا بکات تا شەختەکە بتوێتەوە، ڕۆمیش ڕازی بوو و ڕێزی لە بایەخدانی لاوە یۆنانیەکە گرت کە دەستی بەگریان کرد.

دوای ئەوەی زریانوس بوو بە یەکێك لە دڵسۆزترین و بەوەفاترین یاوەرانی ڕۆمی، ئیتر بۆ هەرکوێ بچوایە یاوەری دەکرد. جارێکیان کاتێ دەیویست مزگەوتی میرام بەجێ بێڵێ، کە گومەزێکی شینی بچوك و سواقدراوی هەبوو و گژبەریی ئاسمانی هاوینی دەکرد و خەزەفە شینەکەی هەندێ لە مزگەوتەکانی بەڵخی زێدی خۆی بیر ڕۆمی دەخستەوە، مەولانا و زریانوس چاویان بە عارفی سۆفی حەیدەری کەوت کە هەر چاوی بە مەولانا کەوت بە ملپێچێکی یەمەنی سەری داپۆشی، وەك ئەوەی ئافرەتانی باڵاپۆش لەکاتی بینینی پیاوێکدا دەیکەن. پێویستە ئەوەیش بڵێم کە ئەو ملپێچانە نەرمترین و باشترین بوون لە دنیادا، بێگومان هێشتایش وان.

کاتێ موریدانی لەسەر ئەم هەڵسوکەوتەی سەرزەنشتیان کرد، عارفەکە بەدەم ئاماژەدان بە پەنجەکانی بۆ ڕۆمی وەڵامی دایەوە: "لەبەردەم زانست و مەعریفەکانی ئەم پیاوەدا، پێویستە سەرجەم پیاوان وەك ئافرەتان خۆیان دابپۆشن، پێویستە لەسەریان لە ماڵەکانیان بمێننەوە و تەونەکانیان بگێڕن"، پاشان لەبەرپێی ڕۆمیدا خۆی بەزەویدا دا و دایە پڕمەی گریان.

زریانوس بوو من و گەورەمی فێری زمانی یۆنانی کرد، بۆ نموونە چیرۆکی ملپێچەکەیان بە زمانی ئیسکەندەر بۆ گێڕامەوە.

هەرچی زانست و شارەزایی بەربڵاوی زریانوسە، گەیشتە ڕادەیەك، وەك ئەفسانەکە دەڵێ، وادەکات زۆربەی زانا و فەقیهان لەبەردەمیدا خامۆش و بێدەنگ بوەستن. دای ئەوەی بوو بە یەکێك لە نزیکترین موریدانی ڕۆمی، لە سەرجەم کەشفە ڕۆحیەکانیدا شوێنی دەکەوت، کاتێ موریدەکانی بەخراپ لێی تێدەگەیشتن ناچار دەبوو ڕووبەڕووی هەستە دوژمنکارانەکانیان ببێتەوە. تەنانەت زریانوس چەند جارێك برایە بەردەم دادوەران کە تۆمەتی ئەوەیان دابووە پاڵ گوایە ئیددیعای ئەوەی کردوە ڕۆمی خوایە. ئەویش لە وەڵامیاندا وتی ئەو هەرگیز ئیددیعای نەکردوە کە ڕۆمی خوایە، چونکە ئەو بەڕاستی خوایە.

"من کافر بووم بەڵام ئەو بە مەعریفە عیرفانیەکان ئاشنای کردم، کردمی بەزانایەکی ئاینی و مەعریفەی پێشکەش کردم و یارمەتی دام تا ڕێزی خوا وەك خۆی بزانم. من پیاوێك بووم ناوی خوام گۆ دەکرد، ئەو کردمی بە پیاوێك بوونی خوا بزانم".

پێش ئەوەی زریانوس بمرێ و لەگەڵ ئەو ڕاستییە خەمناك و سەختە بەجێم بهێڵێ کە ژمارەی ئەو هاوڕێیانەم کە باریان کردوە بۆ دنیاکەیتر لەوانەی ئێستا لە ژیاندان تێپەڕیوە، خەوێکی بۆ گێڕامەوە کە لە ژیانی یەکەمیدا، کاتێ مەسیحی بووە، دیبوی.

"شەوێکیان لە خەودا بینیم هەردوو پێی پیاوێك دەشێلم نایناسم. بەیانیی ڕۆژی پاشتر پاش ئەوەی دەست و دەموچاوم شۆرد، گوندەکەمانم بەجێهێشت و چووم بۆ شار. لە ڕێگەدا ئەو پیاوەم دی کە لە خەوەکەدا دیبووم و لێی پرسیم: "زریانوس ئێستا حاڵت چۆنە دوای ئەو ناڕەحەتیەی دوێنێ شەو بینیت؟"، لە حەپەساندا لەهۆش خۆم چووم. کاتێ چاوم کردەوە دیم پیاوەکە دیار نیە. دەمزانی خەوەکە دەربارەی ئەو ڕۆمییەیە لە لەسێدارەدان ڕزگاری کردم کاتێ عەباکەی خۆی بەسەردا دام. بەڵێ، ئەو پیاوەی پێکانیم دەشێلا لەڕاستیدا مەولانا بوو، ڕۆمی".

کاتی دیدارەکەی نێوان شەمس و ڕۆمی، من و زریانوس و دوو کوڕەکەی مەولانا تەمەنمان دەوروبەری بیست ساڵ بوو. ئەو وەرزشەی ڕۆژانە من و زریانوس دەمانکرد جەستەمانی خۆشە کردبوو، بەپێچەوانەی جەستەی لاوازی دەروێش و حاجیەکان. هەرکات سوڵتان وەلەدم ببینیایە —تا ئەمڕۆیش پاش چل ساڵ— بەدەست خۆم نەبوو سەرسام دەبووم بە بەیەکگەیشتنی هەردوو برۆکانی کە لەرزەیەکیان لەسەروو لوتیەوە دروست کردبوو کە دوو تیری ڕەشیان لێوە درێژ دەبێتەوە، بەڵام ئێستا بوونەتە خۆڵەمێشی. چاوەکانی وەك چاوەکانی باوکی بوو، کراوەیی و عەفەویەتی لەگەڵ خەڵك ئەو هەستەی لای ئەوانەی پێی دەگەیشتن دروست دەکرد کە ساڵانێکە دەیناسن. وا دەهاتە پێش چاو ئەو دەرگایەیە کە پێویستە هەرکەس بیەوێ بچێتە ناو باخچەکەی باوکی پێیدا تێبپەڕن، دەرگایەك لەوانەیە، بەپێی بارودۆخ، لاواز یان داخراو، قەپات یاخود لەسەر گازی پشت بێ. ئەرێ، سوڵتان وەلەد دەروازەی گەیشتن بە باوکی بوو.

بەڵام عەلا، یەك پارچە ساختەچێتی و قەڵبی بوو. ڕۆحی ڕەنگدانەوەی جەستەی بوو: ناشیرین، خوێنتاڵ، بچکۆلانە، کۆسە، چاوکز، کاتێ دەستەواژەیەکی دەردەبڕی دەنگی دەگۆڕا، لە دەنگێکەوە کە خەریکە بڵێن منداڵانە و ڕاشکاوە دەیگواستەوە بۆ نەبرەیەکی زبری پیاوێکی سەرسەری. لە یەك هەناسەدا دەیتوانی شێوەی پێشکەوتوو لە ڕێزداری و هەروەها سووکایەتیپێکردنی زبرتر و بازاڕیانەتری بەکار بهێنێ، کە ئەنجامی سەیریان لێ دەکەوتەوە، بۆ نموونە دەستەواژەی "تۆ ئەی ئەو کەسەی ئاسمانەکان لەبەردەمیدا دەچەمێنەوە، قنگت لەسەر زەوی دانێ"، بەڵێ، زۆرجار گوێم لە کوڕەکەی ئەو شاعیرە مەزنە بووە بەو شێوەیە کەفوکوڵی ناخی خۆی دەربڕیوە.

ڕۆمی لە ژنێکیدی دوو منداڵی پێ بەخشرا، کوڕێك و کچێك، کە وام بەخەیاڵدا دێ چەندین هەست لە زاکیرەدا بەجێدێڵن. هەرچی "کیرا"ی دایکیانە، بەشە مێینانەکەی چیرۆکێکە کە پڕ بووە لە پیاوان. لەبەرئەوەی بەتەمەن لە مەولانا بچوکتر بوو، ئەوا دەبوو، بەزەحمەت، قبوڵی گۆڕانی پاش گەیشتنی بە شەمس بکات. ناچار بوو بەرگەی بەجێهێشتنی لەلایەن مێردەکەیەوە بگرێ کە دەچوو بۆ ئەڵقە باڵاکانی فێرکردن کە لە مەسەلەکانی تۆبە و باوەڕ بەخوا دەکۆڵینەوە، هەروەها گواستنەوەی بۆ سازکردنی کۆڕ و

دانیشتنەکانی سەما و مۆسیقا و سووڕانەوە، هەروەك دەبوو لەماڵنەبوونی ڕۆمی قبوڵ بکات بەهۆی سەرقاڵبوونی بە دۆزینەوەی "حەوت شارەکەی عیشق" لەگەڵ پیاوێك کە لە خۆی بەتەمەنترە.

بەلای خەڵکی غەریبەوە ژنێکی جوان بوو، زریانوس نەیدەتوانی بەئاسوودەیی پێیدا هەڵبدات. هەرچی فارسە، سەرەڕای ئەوەی لەبەردەم جوانیەکەیدا دیار بوون، نەیاندەتوانی ببینن. کیرا باسی ئەوەیشی کردوە ئەو ژمارە کەمەی چینییان –رەنگە لە بازرگانان بن– کە ئەو بەبەردەمیاندا تێدەپەڕی لەوسەری شەقامەکەوە، تەماشایان نەدەکرد لەبەر ئەو جیاوازییە گەورانەی لەنێوان قسماتی ڕوومەتی و نموونەی ئەوان بۆ جوانیدا هەبوو، چونکە دەموچاوی درێژکۆلە هەڵکەوتبوو. دەمیشی، کە من سەربارى پەچە دادراوەکەی دەمتوانی ببینم، با مەولانا لەمەدا بمبەخشێ، فراوان بوو، چەناکەی هەندێ دەربەزیو بوو. کاتێ پێدەکەنی چرچ و لۆچ ڕوومەتیان دادەپۆشی، ئەویش بەهۆی ئەو شەوانەی بەتەنیا بەسەری دەبردن، شەوانی گومان کە ناخی ئاژنیبوو. بەڵام بەلای منەوە، بەبێ هیچ گومان و دوودڵیەك، وەك دایك وابوو. کاتێ ئاڵۆزی یان زەحمەتی پەیدا دەبوو گۆشەگیریەکەی ئارامی و ئاسوودەیی پێدەبەخشی. تا کۆتایی ژیانیشی خۆشەویستی و ڕێزی ڕۆمی بەرانبەری کز نەبوو. ڕۆمی زۆر غیرەی لێ دەکرد، تەنانەت ڕێگەی پێنەدەدا بەبێ مۆڵەتی ئەو چاوی بەئافرەتانیدی بکەوێ. ڕۆژێکیان وای کرد، کاتێ گەڕایەوە وەك ئەوەی نەفرەتێك بێ، ڕۆمی پێشبینی کرد بەدرێژایی ژیانی بەدەست سەرماوە دەناڵێنێ. لەو ڕۆژەوە، کیرا زۆر هەستیار بوو بەرانبەر سەرما، بەشێوەیەك تا ناوەڕستی هاوین خۆی بە فەرووی ڕێوی دەپێچایەوە. ئێمە هەموو ئەوەمان دەزانی کە لە ژوورەکەیدا لە ئاگردانەکە دوور نەدەکەوتەوە. کاتێکیش سەفەری دەکرد مۆمێکی داگیرساوی لەگەڵ خۆی دەبرد تا ڕوومەتی پێ گەرم بکاتەوە.

بۆ ئەوەی بازنەی هاوڕێ نزیکەکان تەواو بکەم، پێویستە ئێستا باسی سەلاحەدین بکەم، ئەو زێڕنگەرەی بۆ یەکەم جار لە ڕۆژێکی جومعەدا لە مزگەوتی ئەبولفەزڵ لە قۆنیە ڕۆمی بینی، ئەوەیش ماوەیەکی زۆر پێش دیدارەکەی ڕۆمی و شەمس و ئەو گۆڕانەی لێی کەوتەوە، ماوەیەکی زۆر پێش لەوەی من لە بازنەی موریدەکانیدا قبوڵ بکرێم.

ڕۆژێکیان کاتێ خەریکی ئامۆژگاریکردن بوو، ڕۆمی گوێی لێبوو کەسێك هاوارێکی ترسناك دەردەکات، کەوتە سەرنجدانی ئەو پیاوەی لە مینبەرەکەی نزیك دەکەوتەوە، پاشان مێزەرەکەی لابرد و پرچی بەردایەوە و خۆی فرێدایە بەر پێکانی. ڕۆمی لە مەوعیزەکردنەکەی وەستا و چوو پیاوە "ممسوس"ـەکەی بردە لایەکەوە و هێوری کردەوە و وای لێکرد قسە بکات، پاشان بەدەستی خۆی کوپێك چای پێشکەش کرد، چایەك یەکێك لە موریدە دڵسۆزەکانی ڕاستەوخۆ لە چینەوە هێنابووی، کە بازرگانێك بوو هەمیشە بەدوای کاڵای نوێدا دەگەڕا.

ئەو رۆمییە و ئەو پیاوەی ناوی سەلاحە کاتێ دوو گەنجی بچوك بوون هەمان مامۆستایان هەبوو. باوکی سەلاح ماسیگر بوو، بەڵام ئەو زێڕنگەر بوو. ئەمە هەموو ئەوە بوو رۆمی لەو رۆژی جومعەیەدا زانی، ئەو پیاوەی وەك تەرمێك خۆی فڕێدایە بەرپێکانی، ئەو پیاوەی دوای ماوەیەکی درێژ، دوای دیارنەمانی شەمس جێگەی ئەو کەسەی گرتەوە کە بەلای رۆمیەوە گۆڕانی نەکردە بوو.

رۆمی سەلاحی لای خۆی هێشتەوە، بەڵام بەشداری شیرزیەکەی نەکرد. لەبەر هۆیەك، کە فزولی دەبزوێنێ، هاوەڵیی ئەو کەسە نەزانە نیمچە نەخوێندەوارەی بەسەر هاوەڵیی زانایاندا هەڵبژارد. لە بۆنەیەکیتردا قسەی لەبارەوە دەکەمەوە.

هەرچی خۆمم، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ناوی خۆم ئاشکرا بکەم. من ناوم حوسامەدینە، لە خێزانێکی دێرینەوە هاتووم، باوکم ماوەیەکی کورت پێش دیدارە بەناوبانگەکەی نێوان شەمس و رۆمی مرد.

گەنج بووم کاتێ باوکم مرد، پێش چەند مانگێکی کەم کاتێ زانی لە کاتێکی نزیکدا بەجێم دێڵێ، پێداگری لێکردم کچێك لە خێزانێکی چاك بخوازم. بەم شێوەیە ژنم هێنا و گواستمەوە تا لەگەڵ ژنەکەم بژیم لە ماڵی خێزانەکەی لە فالیراس کە ماوەی دوو سەعات بەپێ لە قۆنیەوە دوورە. هەر هێندەی باوکم مرد یەکسەر سەرجەم هاوڕێ بەتەمەنەکانی، بە ریشە بەفرینەکانیان و نەعلە لکلکینەکانیان لای پەنجەی پێکانیان، بە کڵاوە درێژە لاکێشەییەکانی سەریانەوە، چەکدار بە خەنجەرە چەماوە و دەسکە بەزیو زاخدراوەکانیانەوە —ئەو جلوبەرگەی تەریقەتی (فتوە)ی پێ دەناسرێتەوە– لەبەردەم منی هەرزەکاردا لەسەر چۆك وەستان و داوایان لێکردم جێگەی باوکی کۆچکردوم بگرمەوە لە سەرۆکایەتیکردنی تەکیەکەیان، منێك جگە لە وەرزشکردن و شیربازی و زۆرانبازی بیرم لە هیچیدی نەدەکردەوە، بەڵام هەستم کرد پێویستم بەوەیە زیاتر بزانم لەوەی دەیزانم و رازی نەبووم ئەو بەرپرسیارێتییە قورسە هەڵبگرم، تەنانەت لەسەر شانە پانەکانیشم.

دوای ماوەیەکی کورت پیاوێکی پیر، کە لە تەکیەکەماندا لەپێشە، بردمی بۆ لای بەناوبانگترین کەسی قۆنیە، ئەویش رۆمی بوو.

لەو ساتەی خۆم فڕێ دایە بەرپێکانی، هەردوو دەستی گرتم، گوشینی و پاشان دەستی هێنا بە ریشە تازە خەتداوەکەمدا و داوای لێکردم بەریبدەمەوە. دەستبەجێ بڕیارمدا نەك هەر ریش بەربدەمەوە، بەڵکو بڕیارمدا ئامادەی قوتابخانەکەی گەورەترین زانا بم و بەپێی توانا بەئامادەبوونی شادومان بم.

ئەم بڕیارەی من هانی ژمارەیەك لە هاوڕێکانیتری باوکمی دا و شوێنپێی منیان هەڵگرت. بڕیارم دا تەکیەکەی باوکم دابخەم و رێنماییەکانیم بە رێنماییەکانی رۆمی تەواو کرد، میراتەکەی باوکمم خستە سەر سامانی مورشیدە تازەکەم.

کاتێ ئەو دیدارە روویدا هێشتا گەنجێکی بچوك بووم و هەموو خەیاڵم لەسەر بیرۆکەی باشکردنی توانا جەستەییەکانم بوو، ماوەیەکی درێژترم لە ژوورەکەی سوڵتان وەلەددا بەسەر دەبرد لەوەی لای باوکە بەناوبانگەکەی بەسەرم دەبرد، کە لەناو هەزارانیتردا منی بە گەنجێکی زیرەك دادەنا، بەڵام جیاوازیەکە ئەوە بوو من بەرێکوپێکی پارەم بۆ بەرێوەبەردنی دامەزراوەکەی دەبەخشی، کە ئەوە دەبووە مایەی خەم و ترسی هاورێکانی باوکم.

بەفەزڵی زریانوسی یۆنانی و ئەو دۆستایەتییە زۆر تایبەتەی لەنێوانماندا هەبوو —هەمان بایەخدانمان بە وەرزشکردن هەبوو— لەکۆتاییدا توانیم بچمە ناو بازنەی ناوخۆیی رۆمی و دەرکەوتن لەناو ئەو ژمارە زۆرەی قوتابیاندا. چێژم لە ئەنجامدانی راهێنانی جەستەیی دەبینی، بەڵام لەوە گرنگتر چێژم لە نووسین و تۆمارکردنی رووداوە رۆژانەکان دەبینی.

بەشوێنپێ هەڵگرتنی هەنگاوەکانی رۆمی، من بەلای ئەوەوە قەڵەمێکی نایاب، نەبینراو، سەرسوڕمان، گۆڕان، فەوتان بووم، لە ئایندەیشدا هەروا دەبم کاتێ، بەڵام دوای ماوەیەك، دەبمە نووسەری مەسنەوی، ئەو کارە مەزنە، کە خەمخۆر و هاندەری خولقاندنی بووم.

ئێمە بە سۆفی ناسرابووین، بۆچی؟ بەتەواوی نازانم. هەندێ دەڵێن لەبەرئەوەی ئێمە پۆشاکێکی سادە و ساکاری لە خوری دروستکراو دەپۆشین، بەڵام ئێمە وا نەبووین. لەڕاستیدا بڕیارماندا لەناو ئیسلامدا شوێن رێگەیەکی رۆحیی دیاریکراو بکەوین، هەوڵمان بۆ بەدەستهێنانی زانست نەبوو، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە بوو، واتە تێگەیشتنێك تێیدا مرۆڤ دان بەوەدا دەنێ ناتوانێ پەی بەخودا ببات، چونکە مەعریفە ئەوەیە لە کەسانیترەوە بۆمان دێ، بەڵام تێگەیشتن ئەوەیە خۆمان بەدەستی دێنین.

ئەمڕۆ، دوای ئەوەی بەساڵاچووم و ئێسکم لاواز بووە، دەتوانم بڵێم نەتوانینی پەیبردن، پەیبردنە. ئەمڕۆ دوای ئەوەی بوومە مامۆستا، ئەوە بۆ قوتابیەکانم شەرح دەکەم کە بۆ پەیبردن بە رەهەندە جیاوازەکانی ئیسلام، پێویستە خەیاڵی بازنەیەك بکەن چوارچێوەکەی شەریعەت، واتە ئاینی رواڵەتی و نیوەتیرەکەی تەریقەت، واتە ئاینی باتنی دەگەیەنێ، چەقەکەیشی بریتییە لە حەقیقەت، حەقیقەتی ئیلاهی. شەریعەت و تەریقەت، چوارچێوە و نیوەتیرە، هەریەکەیان بە رێگەی خۆی چەق پیشان دەدات. ئێمەی سۆفی تەریقەتمان هەڵبژارد، ئەو مەسلەکەی دەخوازێ مرۆڤ یەك هەنگاو لە دەرەوەی خۆی بنێ تا بگات بەخوا. ئەوە پرۆسەیەکی پێشکەوتنی لەسەرخۆیە، مەسلەکە، حەجکردنە. سۆفی ناوێکیتریشی هەیە ئەویش "سالك"ـە، واتە "حاجی". کۆتا ئامانجمان ئەوەیە لەناو دەروونی خۆماندا گەشە بکەین، سەرەتا لە دەرەوەی تاریکەوە بەرەو ناوەوەی روناك، لە ناوەوەی روناکیشەوە بەرەو خوا. ئەوەی بەدوای خوادا بگەڕێ لە قووڵایی ناخی خۆیدا دەیدۆزێتەوە، بەم مانایە شیعرێکی رۆمیم بیر دێتەوە دەڵێ:

**وا نەزانی ئەم پیاوە هەژارە**

بەدوای گەنجینەدا ئەگەڕێ

چونکە ئەو خۆی گەنجینەیە

هەرچی رۆمییە، گەورەترین سۆفییە لە هەموو زەمانێکدا و هەروایش دەمێنێتەوە، چونکە عیشق ئیسترلابی[٢] نهێنیەکانی خوایە. لەڕێی عیشقەوە مرۆڤ سۆزی بۆ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی بوونی، دەبزوێ. لەم رێگەیەیشدا، رێگەی عیشق، پێویستمان بە مامۆستایەك، بە مورشیدێك دەبێ، لێرەیشدا بڕگەیەك لە مەسنەویی رۆمیم بیر دێتەوە کە شەرەفی تۆمارکردنیم پێ بڕا کاتێ پێی نووسیمەوە، کاتێ بانگی کردم و وتی:

هۆ رۆشنایی هەق، هۆ حوسامەدین،

لاپەڕەیەك یان دووان بگرە و

لەبارەی سروشتی خواناسەوە بنووسە.

خۆت عارفێك هەڵبژێرە،

چونکە ئەو سەفەرە بەبێ ئەو،

پڕ گرفتاری و مەترسی و ترس ئەبێ.

سەفەری زۆرت بەم رێگەیەدا کردوە،

بەبێ مورشید و لەناو خۆتدا دڵەڕاوکێ دایگرتوی.

بەدرێژایی رێگەکە هیچ تێنەگەیشتی،

کەواتە بەتەنیا سەفەر مەکە و بێ مورشید مەبە.

بەلای رۆمیەوە، ئەم مورشیدە، ئەم چاوساغە، باوکی، واتە سولتانی زانایان، نەبوو، تەرموزیش نەبوو کە داوای لێکرد بەدوای مەعریفەدا بچێ بۆ دیمەشق و هەزار و یەك رۆژ زوهد و خواپەرستی بەسەردا سەپاند. بەلای رۆمیەوە مورشیدی دانا شەمسی تەورێزییە، پیرە پیاوە سەرمابردەکە، کە لەیەك ساتدا، لە یەك دیداردا، جیهانی لە ناخیدا بۆ ئاشکرا کرد. بەڵام بەلای منەوە، من حوسامەدین، مورشیدی عارف جگە لە رۆمی کەسیتر نەبوو، لە ماوەی نووسینی ئەم کتێبەدا، من خۆم مورشیدی هەزاران هەزار سۆفی بووم.

لەکاتی ئەو دیدارەی لەنێوان رۆمی و شەمسدا، تەریقەتەکەمان سازکردنی سەمای رۆحی، بیستن، یان سەمای تەنورە ناوبانگی دەرکرد، کە تێیدا سەماکەر دەچێتە دۆخێك تێیدا هەست بە ئاوازێك دەکات پێشتر بیستراوە، لە دەرەوەی زەمەن هەستی پێکراوە، رۆمی دەیوت: "چەندین رێگە هەن (مرۆڤ) بەخوا ئەگەیەنن، بەڵام من رێگەی مۆسیقا و سەمای بیستنم هەڵبژارد". ئەم رێگەیەی دوای دیدارەکەی لەگەڵ

[٢] ئیسترلاب: ئامێرێکە فەلەکناسان بەرزیی هەسارەکانی پێ دەپێون. وەرگێڕ.

شەمس گرتەبەر. بەر لە دەرکەوتنی شەمس، رۆمی لە سایەی کتێبخانە گشتیەکاندا دەژیا و بەرگەی ئازارەکانی زوهد و حیرمان و رۆژووگرتنی دەگرت. بەڵام لەگەڵ شەمس گەیشتە پلەی عیشقی ئیلاهی.

هەست بەخەم و پەشیمانی دەکەم کە من لەوێ نەبووم کاتێ شەمس دیار نەما، نەمتوانی ئامادەی دیدارەکەیان بم کە زۆری لەبارەوە وترا و کرایە گۆرانی و ترش و خوێی پێوە کرا. بەڵام لەوێ بووم کاتێ شەمس دەستی رۆمی گرت و بردی بەرەو ئەو ژوورەی برد کە تێیدا چل رۆژ و چل شەویان بەتەنیا بەسەر برد.

## لەپڕ، دیم...

بەوریاییەوە ژووری خەوتنەکەی، بە سێ کلۆم داخست. پیاوێکی نەناس، لەوانەیە بازرگانی شەکر بێ، ژوورەکەی تەنیشتی بەجێهێشت و سڵاوێکی لێکرد، ئەویش بەدەنگێکی نزم کە بەحاڵ دەبیسترا وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و یاوەری کرد بۆ سەربانی کاروانسەراکە، بەڵام لەپڕ سووڕایەوە و بەخێرایی گەڕایەوە تا لەوە دڵنیا ببێتەوە کە دەرگای ژوورەکە قفڵ دراوە، لەکاتێکدا جگە لە حەسیرێکی رزیو و کتریەکی شکاو لەگەڵ تایەرە بەردێك کە وەك سەرین بەکار دەهات هیچی تێدا نەبوو، خاترجەم بوو کە دەرگاکە بەباشی داخراوە. بەئاگاییەکی زۆرەوە کلیلەکانی خستە ناو کیسێکی گەورە کە بە مرەکەب پەڵە پەڵە کرابوو، پاشان وەك ئەوەی بوخچە (پریاسکە)یەکی بچوك بێ دای بەشانیدا.

کەس تەمەنی نەدەزانی. هەندێ کەس دەڵێن تەمەنی شەست ساڵە و ناوی محەمەد مەلەك دادە، بەڵام بە شەمس، باڵندە، ناسراوە. کاروانسەراکەی بەجێهێشت و دەرگا بەوێنە رازاوەکەی لەدوای خۆی داخست.

"من پیرە پیاوە سەرمابردەکەم"، شەمس ئەم رستەیەی دووبارە کردەوە، ئەنجا دوای ئەوەی ماوەیەك لەسەر شەختە رۆیشت، دانیشت. نە سەبەتەفرۆشەکە و نە هیچ بازرگانێکیدی نەیانتوانی قایلی بکەن هیچ شتێك بکڕێ لەبەردەم دەرگای کاروانسەرای بازرگانانی شەکر، کە تێیدا لایداوە.

لەوکاتەی رۆژدا هەمووان سەرقاڵی کارەکانیانن. کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات. هەندێکیان روویان کردە مزگەوت، مزگەوتی گەورە، هەندێکیتریش خۆیان بەعەباکانیانەوە پێچابوویەوە کە چەند نانێکی گەورەیان لەناو تۆشەبەرەیەکدا لەبن دەستیاندا هەڵگرتبوو، نانی تازە کە هەر ئێستا لە فڕن دەرچووبوو، پەلەپەلیان بوو تا زوو بەر لەوەی نانەکە سارد بێتەوە و برنجەکە بسوتێ و بەکەڵکی خواردن نەمێنێ، بگەنە ماڵ.
هەرچی ئافرەتەکانن کە بە پۆشاکەکانیان خۆیان پێچابوویەوە و کارەکەرەکانیان لەدوایانەوە بوون، زۆر بەوریایی بەسەر شەختەکەدا هەنگاویان دەنا نەوەك بخلیسکێن و بکەون و سیحری رۆیشتنەکانیان کە بۆن و بەرامەی گوڵ و میسکی دەبەخشیەوە تێك بدەن. هەندێکیتر، پیاوانی ئاینی بوون، مێزەرە بەسەر، قەراغی پەنجەکانیان پەڵە مرەکەبی رەشی پێوە بوو، بەرەو قوتابخانە رێگەیان دەبڕی تا گوێ لە وانەکانی وتاربێژە گەورەکە بگرن کە لە وڵاتانی دووری دنیاوە هاتووە، رۆمی کە هەمووان بە مەولانا ناوی دەبەن.

شەمس چاودێرییان دەکات، چاوەڕوانە، لەسەرمادا دەلەرزێ. بەخۆی دەڵێ: کەس ناتوانێ دیمەنێکی ئاوا بنەخشێنێ خوا نەبێ. لەتوانای هیچ هونەرمەندێکدا نیە، جا وێنەکێش بێ یان شاعیر یان مێژوونووس یان زانای بیرکاری، بەخەیاڵ بیر لەم دیمەنە بکاتەوە بەگشت وردەکاریەکانیەوە، بەم ئەندازەیە لە خۆبەخۆیی و سروشتیبوون و زیندوێتی، ئابەم ئاسانییە کە خەریکە بە بێموبالاتی بێ، بەڵام سەرباری هەموو شت، زۆر ئاڵۆزە.

شەمس چاوەڕوانی کرد، سەرما دەوری دەدات، چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا.

پاشان پیاوێك لە قوتابخانەی بازرگانانی لۆکە بەسواری هێسترێك هاتە دەرەوە، مورید و شوێنکەوتەکانی لەدوایەوە دەڕۆیشتن. روومەت زەرد و لاواز بوو، مێزەرێکی سپی گەورەی بەسەرەوە بوو و جبەیەکی لە پێستی بەرخ دروستکراوی بەسەر پۆشاکێکی سۆفیانەی درێژدا لەبەر کردبوو، نەعلێکی چەرمی درێژیشی لەپێ بوو کە ناوەکەی خوری بوو، تا پێکانی لە زوقم و سەرما بپارێزێ.

شەمس چاوەکانی کردەوە کە کزەبایەکی توند تەزاندبوونی. هەر کە چاوی کەوتە پیاوە هێستر سوارەکە زانی ئەوە ئەو پیاوەیە بەدوایدا دەگەڕێ. هیچ گومانی لەوە نەبوو. ئەو هەر ئەو قوتابییەیە بیست و پێنج ساڵ لەوەوپێش لە گۆڕەپانی دیمەشق پێی گەیشت، کە ئەوکات هێشتا لاوێکی پێنەگەییبوو بوو و نەیزانی چۆن دەستی "بگرێ". بەڵام ئەمڕۆ، لە بیست و شەشەمی جەمادی دوایی ساڵی ٦٤٢ی کۆچی، وادیارە ئیتر پێگەییوە. ئەو پیاوەی رەتیکردەوە بەدەم تکاکەی شەمسەوە بچێ کە وتی "ئەی سەڕافی جیهانی ماناکان، فریامان کەوە"، گۆڕاوە. بەڵام ئەمڕۆ ئەوەتا کامڵ بووە. ئەوە رۆمییە. رەنگە کاتی ئەو دیدارە هاتبێ کە زۆر دەمێکە چاوەڕوانی دەکرد. دەبێ ئیدی کاتی خۆی هاتبێ.

رۆمی بەسواری هێسترەکەی، قوتابی و موریدەکانیشی بەدوایەوە، بەبەردەم خانی بازرگانانی شەکردا تێپەڕین. شەمس بازی دایە بەردەمی و رەشۆی هێسترەکەی توند گرت، هێستر و سوارەکەی وەستاند.

بەهۆی ئەم دەرکەوتنە لەپڕ و توندە ساتێك ترس و بیم باڵی بەسەر دۆخەکەدا کێشا. موریدەکان بەدەوری گەورەکەیاندا ئەڵقەیان بەست و هەوڵیان دا ئەو پیرە پیاوە دوور بخەنەوە، کە ژیرانە رەفتار ناکات. هەندێکیان وتیان شێتە. بۆ پاراستنی گەورەکەی زریانوسی یۆنانی بەزەبرێکی بەهێز پاڵی بە شەمسەوە نا و خۆی خستە نێوان ئەو و رۆمی و پشتە بەهێزەکەی دا بەهێسترەکەوە. رۆمی کە لەسەر پشتی هێسترەکەی پەشۆکابوو، بەخێرایی خۆی ئارام کردەوە. تەنیا یەك ئاماژەی ئەو بەس بوو بۆ هێورکردنەوەی ئەو پشێویەی رووی دا. هیچ مەترسی نیە. لێگەڕێن با ئەو پیاوە غەریبە قسە بکات.

شەمس بە بەژنە درێژەکەیەوە قیت وەستا و بەدەنگێکی گڕ لە رۆمی پرسی: "کامیان مەزنترە، ئەبو یەزید یان پێغەمبەر؟".

رۆمی وتە و کارەکانی سۆفیی گەورە ئەبو یەزیدی بەستامی لەبەر بوو، زۆری خوێندبووەوە، بۆ چەند جارێك هەندێ برگەی کتێبی "تذكرة الاولياء"ی خوێندبووەوە، کە تێیدا عەتار ئاماژە بەو کەسە نائاسابیە دەکات کە لە کتێبی "نوێژی بێکۆتا"دا بەناوی "سوڵتانی عارفان" و "بەڵگەی گەڕاوان" ناسراوە. تائێستایش، کاتێ دەگەڕێمەوە بۆ نوسخە شەخسیەکەی مەولانا، کتێبەکە بەتەنیا لەسەر ئەو دە لاپەڕەیە دەکرێتەوە کە باسی ئەبویەزید دەکات و لە زۆر خوێندنەوەیاندا شڕ و وڕ بوون.

"سی ساڵی ڕەبەق بەدوای خوادا گەڕام. لەپڕ دیم: ئەو بەشوێن مندا دەگەڕا". ڕۆمی لەمێژ بوو ئەو دەستەواژەیەی دووبارە کردبووەوە. لەسەر ئەژنۆ، لە کۆتایی هەموو نوێژێکدا بانگی بەستامی دەکرد و لەوە رادەما کە نزیکەی چوار سەدە لەوەوبەر لە کتێبی "نوێژی بێکۆتا"دا هاتبوو: "کاتێ بەستامیم بەجێهێشت، وەك کە مار کارژەکەی فڕێ دەدات، بینیم: خۆشەویست و عاشق و عیشق یەکن. لە سی ساڵ لەمەوپێشەوە خوام کردۆتە ئاوێنەی خۆم. بەڵام ئێستا بوومەتە ئاوێنەی خۆم".

هەندێ جار ڕۆمی بەڕستەیەك دەست پێدەکات دەڵێ: "نموونەی من وەك ئەو دەریایەیە نە قووڵاییەکەی و نە سەرەتا و نە کۆتایی نابینرێ". کەمێکی کەم لە خەڵك دەزانن ئەم قسەیە بەستامی کردوێتی، کەمێکی کەمیش دەزانن دوای ئەوە چی دێ: "من ئاسمانی نۆیەمم. من ئەو عەرشەم لە ئاسمانی نۆیەمینە. من ئیبراهیم و مووسا و محەمەدم. من جبریل و میکائیلم. من ئیسرافیل و عیزرائیلم".

شەمس لە ڕۆمی پرسی: "کامیان مەزنترە، ئەبو یەزید یان پێغەمبەر؟". چیتر پیرە پیاوەکە هەستی بەسەرما نەدەکرد، چیتر گوێی بە با و بە موریدە شپرزەکان نەدەدا. چاوەکانی چاوەڕوانی وەڵامی ڕۆمی بوون. کاتێکی پاشتر، وەك هێماکردنی بۆ قووڵیی ئەو پرسیارە، ڕۆمی وتی ئەو وای کردوە ئاسمان لەسەر زەوی رابکشێ.

"محەمەد مەزنترە" ڕۆمی وتی و هەستی کرد وەك ئەوەی بڵێیسە ئاگرێکی گەورە لە کەللەسەریەوە بەرەو هەورە نزمەکان بەرز بووبێتەوە. درێژەی بەقسەکردن دا و وتی: "لەبەرئەوەی بەستامی چۆڕێکی وەرگرت و تینوێتی پێ شکاند، کە ئەوە لەگەڵ دەفری تێگەیشتنیدا ناگونجێ. بەڵام تینوێتیی محەمەد گەورە و بێسنوور بوو. لە تینوێتیدا قڕ بووبوو. دایم تینووی بوو. کاتێ ئەبو یەزید گەیشتە حەقیقەت، دەستبەجێ تێر بوو و بەدوای زیاتردا نەگەڕا. بەڵام محەمەد ڕۆژ بەڕۆژ و سات بەسات پێشدەکەوت و لە بینینی ئەنواری ئیلاهی و شکۆ و جوانی و حیکمەت نەوەستا، لەبەرئەوە لە خوا دەپاڕایەوە و دەیوت ئەو هەرگیز ناتوانێ بەو شێوەیەی شایانە بیناسێ".

لێرەدا شەمس لەهۆش خۆی چوو، بوورانەوەی ڕاستەقینە. پاشتر، وتی ئەو لەو ساتەدا، ڕۆمی لە ڕۆمیدا نەبینیوە، بەڵکو خۆی بینیوە. شەمس لەسەر زەوی راکشا، پیاوەکەیتر لەپشتی هێسترەکەی دابەزی و داوای لە موریدەکانی کرد بەبایەخەوە ئەو کەسە غەریبە هەڵبگرن و بەڕێزێکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵ بکەن –جەختی کرد: "ڕێزێکی زۆر"– بیگوێزنەوە بۆ قوتابخانەکە. سوڵتان وەلەد، یەکێك لە دوو کوڕەکەی ڕۆمی کە ئەوکاتە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو و زۆر لە باوکیەوە نزیك بوو، دڕی بە حەشاماتەکە دا و خۆی گەیاندە شەمس و سەری شەمس و دوای ئەوەیش لاشەی بەرز کردەوە. بەیارمەتیی موریدەکانیدی، لاشە کز و چروساوەکە درا بەسەر پشتی هێسترەکەدا.

حەشاماتەکە روویان کردە ئەو قوتابخانەیەی مەولانا دەرسی تێدا دەوتەوە. لە دەرگاکە تێپەڕین و چوونە ناو حەوشە چوارگۆشەکە. ماڵەکەی ڕۆمی لە دوو بەش پێکهاتبوو: ماڵ و قوتابخانەکە. لە ناوەڕاستی ماڵەکەدا، ئەو بەشەی تەرخان کراوە بۆ خێزانەکە و ئەو موریدانەی دەمێننەوە، ژوورەکانی ئافرەتان "حەرەملك" هەیە. قوتابخانەکە دەکەوێتە بەرانبەر شەقامەکە. کاتێ موریدەکان وایان بەخەیاڵدا هات جەستەی بێهۆشی شەمس جەستەی مەولانایە، بەپرتاو لە ژوورەکانیان هاتنە دەرەوە و لەبەردەم دیواری حەوشەی قوتابخانەکەدا لە هەر سێ لاکەیەوە قەتارەیان بەست و پەشۆکاوی کەوتنە وردبوونەوە لە هێسترەکە و ئەو کەسەی لەسەر پشتی بار کرابوو. هەندێکیان دالآنە داپۆشراوەکەی تەنیشت ژوورەکانیان بەجێهێشت و چەند هەنگاوێك هاتنە پێش و چوونە حەوشەکە بەڵکو راستی رووداوەکە بزانن، عارف و زاناکان ئەو ژووره گەورەیان بەجێهێشت کە تێیدا یەکترییان دەدی و لای چوارەم لای حەوشەکەوە ریزیان بەست، بەرپرسانی حکومەت کە بۆ گوێگرتن لە تەفسیری رۆمی لە دەسەڵات هاتبوون، لە کتێبخانە نزیکەکە —ئەو شوێنەی زۆرترین سەردانیکەری لە ناوچەکەدا هەیە— هاتنە دەرێ. دەوترێ تاکە هۆی راستەقینە کە وای لە باوکی رۆمی کرد لە قۆنیە جێگیر ببێ، ئەوە بووە لە ئێوارە دەردەدارەکاندا بۆنی (کتێبخانە)کە هەڵبمژێ، کە سوڵتان وەك دیاری پێشکەشی میوانە سەنگینەکەی کردبوو.

ئافرەتان کە نە هێسترەکەیان دیبوو نە ئەو پیاوەی لێی بار کرابوو بەپەلە خۆیان گەیاندە حەوشە پڕ لە درەختەکەی ناوەوە کە لەم پایزە ساردەدا گەڵایان پێوە نەمابوو. باجیەکان لە سووچی گۆم (ئەستێلك)ـەکەدا خڕ بوونەوە، ئەوە شتێك بوو پێشتر رووی نەدابوو. لە ناوەڕاستی ئەستێلکە نیمچە بەتاڵەکەدا نافورەیەکی لەکارکەوتوو لەریەوە، کە بەتاسەوە چاوەڕوانی کەشوهەوایەکی فێنکتر و گەرمتری دەکرد، تەنانەت رێژگەی ئەو گوڵانەی چاوەڕوانی گۆڕانی ئاسایی وەرزەکان و هاتنی بەهاریان دەکرد، بەم غەڵبەغەڵبە لەناکاوە راچڵەکین کە پێدەچوو بەشێوەیەکی کاتی هارمۆنیەتی حەتمیی ئەو باخچە جوانکیلەیەی تێکدابێ. سوڵتان وەلەد هەوڵی دا خەڵك هێور بکاتەوە. نا، باوکی نەبوو، چونکە ئەو چەند هەنگاوێك دوای هێسترەکە دەڕوات، ئەو پیاوەی بووراوەتەوە کەسێکی نەناسراوە، وادیارە دەروێشێکی ئیختیارە. حەشاماتەکە دەستبەجێ بڵاوەیان لێکرد، پاشان زریانوسی جەستە بەهێز هاتە پێشەوە، باوەشی بە شەمسدا کرد و هەڵیگرت بۆ ناو هۆڵەکە و دەرگاکان بەڕووی موریدە پەشۆکاوەکاندا داخرا.

دوای پازدە خولەك شەمس بەدەنگی رۆمی بەهۆش خۆی هاتەوە، کە ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە:

"بازرگانێکی فارس خۆی ئامادە دەکرد سەفەری هیند بکات. پێش ئەوەی دەست بە گەشتەکەی بکات سەرجەم ئەندامانی بنەماڵەکەی کۆکردەوە —خێزان و خزمەتکار و تەنانەت حەیوانە ماڵیەکانیش. لەبەرئەوەی پیاوێکی سەخی تەبیات بوو لێی پرسین حەز دەکەن چییان بەدیاری بۆ بێنێ، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و هەریەکە داوایەکی جیاوازی هەبوو. کاتێ بەنۆرە لە هەریەکەیانی پرسی، تووتی وتی:

"بچۆ بۆ دارستانەکان، کاتێ تووتییە هاوڕەگەزانمت بینی سڵاوی منیان پێ بگەیەنە و لەباتی من لێیان بپرسە ئایا ئەوە دادپەروەرییە ئەوان هەموو پێکەوە لەسەر لقی درەختەکان بژین لەکاتێکدا من لێرە بەتەنیا لە قەفەسەیکدا دەژیم. لێیان بپرسە ئایا راستە من لێرە، دوور و تەنیا بمرم".

کاتێ بازرگانەکە گەیشتە هیند رووی کردە دارستان و تووتیەکی کێوی دۆزیەوە و پرسیارەکانی باڵندە خۆشەویستەکەی بۆ گێڕایەوە. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو باڵندەکە کەوتە لەرزین و لەبەر پێکانیدا دای بەزەویدا. ئیتر هەناسەی وەبەردا نەهاتەوە و دەسبەجێ مرد. بازرگانەکە زۆر خەمبار بوو و بەداخ بوو کە ئەو قسانەی بۆ کرد. کاتێ بازرگانەکە گەڕایەوە، ئەو دیارییانەی هێنابوونی بەسەر ئەندامانی خێزانەکەیدا دابەش کرد. کاتێ سەرەی تووتییەکە هات چیرۆکی مردنی خەمناکی تووتییە کێویەکەی بۆ گێڕایەوە. هەر هێندە قسەکانی تەواو کرد تووتیەکە لە قەفەسەکەیدا کەوتە لەرزین، لەسەرمانا لەرز دایگرت و پاشان کەوتە سەر زەویی قەفەسەکە و مرد. بازرگانە بۆ مردنی باڵندەکەی زۆر گریا کە دەنگێکی خۆشی هەبوو، هاوەڵ و راوێژکاری بوو. هەر کە بازرگانەکە دەرگای قەفەسەکەی کردەوە و باڵندە مردوەکەی دەرهێنا، یەکسەر تووتییەکە دای لە شەقەی باڵ و فڕی و لەسەر لوتکەی بەرزترین درەخت نیشتەوە. لە حەشمەتا بازرگانەکە هۆی رەفتارە نامۆکەی لە باڵندە زیندووەکەی پرسی، باڵندەکە وەڵامی دایەوە، "بەگوێی ئامۆژگاریی تووتییە داناکەم کرد، کاتێ وا خۆی پیشان دا مردوە پیشانیدام چۆن هەڵبێم، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئازاد و بەرەڵا بم". بازرگانە خەمبارەکە ملکەچی ئەو زیانە بوو کە لێی کەوت وماڵئاوایی لە دیلەکەی رابردووی کرد.

شەمس چاوەکانی کردەوە. زانی ئەو لە ژوورێکدایە "کورسی"یەکی تێدایە، کە بریتییە لە مێزێکی درێژ و نزم و پان بوو بە بەڕە دادەپۆشرا، سەردانیکەران قاچیان لەژێریدا رادەکێشا و لە ئاگردانێك کە لەژێر مێزەکەدایە نزیك دەکرایەوە. لە زستاندا ئەو ژوورەی "کورسی" تێدایە بە شوێنی سەرەکی دادەنرێ، پیاوان تێیدا دەخەون و دەخۆن و دەخۆنەوە و پێشوازیی میوانان دەکەن و دەرس دەخوێنن و دەمەتەقێ دەکەن، هەروەها پیر دەبن و لەکۆتاییشدا دەمرن. شەمس هەردوو لاقی درێژ کردە ژێر کورسیەکە، سەری پاڵ دابوو بە ئەژنۆی رۆمیەوە، کە شانی دادابووە سەر هەندێ پشتیی گەورەی بە بەڕە داپۆشراو.

هەرچی رۆمییە کە زۆر چاوەڕوانی ئەو پیاوەی کرد کە بێداری دەکاتەوە —پیاوێك نازانێ کێیە— ئەو پیاوەی بینی کە پێڵوەکانی دەجوڵێنێ. وەك ئەوەی بیەوێ چیرۆکی بازرگان و تووتییەکە تەواو بکات پێی وت: "بەلای منەوە، ئازادی ئەوەیە بێمە ناو قەفەسەکەت"، پاشان وتی "کاتێ لەناکاو تۆم دی، بەم شێوەیەم لێهات".

دەستی خستە سەر پرچە سپیەکەی شەمس و بەنەرمی دەستی پێدا هێنا. شەمس یەکسەر راست بوویەوە و لەسەر قنگ دانیشت. بازنەیەك لە پیاوانی دیاری لە دەوری کورسیەکە بینی، کە بەشی

سەرەوەی جلە ئاوریشمینەکانیان –لەبەرئەوەی بەشی خوارەوەی جلەکانیان لەژێر ئەو بەتانیەی مێزەکەی داپۆشیبوو شارابوویەوە– بەبەردی شیلان رازێنرابووەوە، هەروەها بەدەزووی ئاڵتونی دوورابوون و بەجۆرەها نەخشی رەنگاوڕەنگ نەخشێنرابوون، بەشێوەیەك لەگەڵ مێزەرەکانیان بگونجێ. واپێدەچوو ئەو پیاوانە زۆر سەردانی کۆشکی سوڵتان و میرەکان بکەن. یەکێکیان تەزبیحێکی یاقوتی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ تێپەڕاندنی هەر دنکێکی لەناو پەنجەکانیدا ناوێك لە نەوەد و نۆ ناوەکەی خودای وەك ویرد دەوتەوە، پیاوێکیتر دەستی بە گەرووی بولبولێکدا دەهێنا کە لەناو بۆشایی لەپی دەستیدا بوو، ئەوە هەر ئەو پیاوە بوو کە رۆمی چیرۆکی بازرگان و تووتیەکەی بۆ دەگێڕایەوە.

من و زریانوس لەوێ بووین و وەك ئەوانیتر حەپەسابووین. ئاخۆ شەمس پێی وابێ ئێمەیش بەو تەمەنە بچوکەمانەوە لە چینی خانەدانان بین؟ لێرەدا شتە نائاساییەکە بە ئاماژەیەکی سادە دەستی پێکرد.

شەمس هەستی بەئەبڵەقبوونی چاوی موریدەکان کرد. وا دیار بوو لە هەڵوێستی مامۆستاکەیان نەگەیشتبوون. من، کە لەناویاندا لەخۆبوردەترینیان بووم، دەمزانی چۆن بیر بکەمەوە. هەستم کرد هاوڕێ یۆنانیەکەم، زریانوس، کە لە تەنیشتم دانیشتبوو نیگەرانە. شەمس بە قیافە لەڕ و لاوازەکەی وەك چارۆکەی کەشتیەکی هێرشبەر هەستایە سەر پێ، دەستی رۆمی گرت و بەرەو قاپیەکە بردی و ئەو ژوورەیان بەجێهێشت کە کورسیەکەی تێدا بوو.

شوێنیان کەوتین، بەدەوری دالانە سەرگیراوەکەدا سووڕانەوە و لەبەردەم ژوورێکی بچوکدا وەستان.

گوێم لێبوو شەمس بە مەولانای وت: "بە بێئەدەبانە و بوێرییەوە هاتمە ناو هاوڕێیەتیت". رۆمی ئەم بەیتانەی بۆ سوڵتان وەلەد، کوڕە راساڵەکەی، وتەوە:

**لەسەر گالیسکەی کازیوەدا مانگێك دەرکەوت،**

**لە گالیسکەکەوە هات و لێم رائەما.**

**وەك هەڵۆیەك باڵندەیەك بدزێ،**

**مانگ دزیمی و بەرەو گالیسکەکە رایکرد.**

**هەروەها وتی: "دزرام"**

دەرگای ژوورەکە بەدوایاندا داخرا. ماوەی چل رۆژ لە ژوورەکە نەهاتنە دەرەوە. ماوەی چل رۆژ لەپێناو یەککگرتن لەگەڵ خۆشەویست، رۆژوویان گرت.

زۆر شت دەربارەی ئەو دیدارە یەکلاکەرەوەیە گوترا کە بەرهەمەکەی پەنجا هەزار بەیتە شیعری، تاجی ئەدەبی سۆفیگەری بوو. هەندێکیان دەڵێن دیدارەکە لە شوێنێکیتر و لە بارودۆخێکیتردا رووی داوە. دیدارێکی موعجیزەئامێز، کە هەندێ لە نووسەران بە بلیمەتی، شتێکی سروشتبەزێن (خارق للطبيعة)

وەسفیان کردوە. ئایا هەر بەڕاستی شەمس لەبەردەم ڕۆمیدا دەرکەوتوە، بەبێ ئەوەی یەك وشە لە دەمی دەربچێ، بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێکی سروشت ڕۆحی لێ بکات؟ ئاخۆ ئەویتر کەوتۆتە سەرزەوی، وەك بەربوونەوەی بەرێکی پێگەییو لە درەختێك؟

یەکێك لە ژیاننووسانی ڕۆمی دەگێڕێتەوە ئەو دیدارە نائاساییە چۆن چۆنی لەماڵی مەولانا، لە کتێبخانەکەیدا، رووی داوە. وەك ئەو نووسەرە باسی کردوە، مەولانا هەندێ بابەتی ئاینی لەگەڵ موریدانی تاوتوێ دەکرد. لەوکاتەدا شەمس هاتە ژوورەوە و سڵاوی کرد و لەسەر زەوی دانیشت، پاشان قامکی بۆ کتێبەکان راکێشا و لێی پرسی "ئەمە چییە؟" ڕۆمیش پێی وت: "تۆ نازانی ئەمە چییە؟"، مەولانا هێشتا لەم رستەیەی نەبووبوویەوە ئاگر بەربووە کتێبەکان و کتێبخانەکە. وەك ئەو راوییە دەگێڕێتەوە، ڕۆمی پرسی: "ئەمە چییە؟" شەمس وتی: "تۆیش نازانی ئەمە چییە؟" پاشان هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە گۆڕینی ڕۆمی، ئەو پیاوە توند و وشکەی، کە تا ئەوکاتە زۆربەی کاتەکانی لە میحرابی مزگەوتدا بەسەر بردبوو، گۆڕی بۆ عاشقێکی بەسۆز، بۆ گەڕۆکێك کە هەموو شوێنەکان، هەر شوێنێك بێ، دەگەڕێ تا ئاهەنگی سەمای ڕۆح ساز بکات.

وەك نووسەرێکیتریش گێڕاویەتیەوە، دیدارەکە لای حەوزێکی ئاودا رووی داوە، ڕۆمی لە تەنیشتی (حەوزەکە) دانیشتبوو، چەند کتێبێکیشی لەبەردەمیدا دانابوو. شەمس لە مەولانا نزیك کەوتەوە و لێی پرسی: "کارت بەمانە چییە؟" ئەنجا کتێبەکانی هەڵگرت و فڕێی دانە ناو ئاوەکە، ڕۆمی بەپەرۆشیەکی زۆرەوە وتی: "دەروێش چیت کرد؟ هەندێ لەو کتێبانە لە دانسقەکانی باوکمن و مەحاڵە جارێکیتر دەست بکەونەوە"، جا شەمس دەستی بردە ناو ئاوەکە و کتێبەکانی یەك بەیەك دەرهێنایەوە. وەك راوی دەڵێ، کتێبەکان تەنانەت تەڕیش نەبووبوون و ئاو کاری لە هیچکامیان نەکردبوو. جا مەولانای ڕۆمی وتی: "ئەمە چ نهێنییەکە؟" شەمس وەڵامی دایەوە "ئەمە زەوق و حاڵە، تۆ هیچ لەمانە نازانی؟".

دەولەتشا حیکایەتێکی جیاواز سەبارەت بە دیدارەکە و ئەو پشێویەی بەدووایدا هات دەگێڕێتەوە، کە ئەفسانە و مەجازێکی زۆری تێکەڵە. دەڵێ مەولانا سواری ئەسپێك بوو، غەریبێك لێی پرسی: "ئامانج لەم ئازارکێشان و مراندنی جەستە و دووبارەکردنەوەی زانستە چییە؟" مەولانا وەڵامی دایەوە "شوێنکەوتنی سوننەت و ئادابی شەریعەتە"، شەمس وتی: "ئەو زانستەی لە خۆت رزگارت نەکات، نەزانی زۆر لەو باشترە".

سەرجەم راویەکان چیرۆکی سەیر و سەمەرەیان گێڕاوەتەوە. هەریەکەیشیان دەڵێ گوایە هەندێ شتی بەچاوی خۆی دیوە، بەڵام لێرەدا بارودۆخە راستەقینەکان هیچ بایەخێکی راستەقینەیان نیە، لەبەرئەوەی چەند ساڵێکە لەدایکبوونێك ئامادەسازی بۆ دەکرا، وا من دیم ئەوە رووی دا. من، حوسام، لەوێ بووم کاتێ شەمس بەپێوە وەستا و دەستی مەولانای گرت و بردی بەرەو ژوورەکە. بەڵێ، من لەوێ بووم و گوێم لە

رۆمی بوو، پێش ئەوەی بچێتە خەڵوەتکێشانەکەیەوە بە کوڕە راساڵەکەی دەگوت: "من دزرام". بینیم دەرگاکە دادەخرێ و سوڵتان وەلەدیش لەبەردەم دەرگاکەدا دەکەوێتە سەر چۆک.

زەحمەتە بە هەندێ وشەی سادە باس لەو جۆش و خرۆشە بکرێ، جا چ دەهشەتی گەورەم، مەولانا بێ، چونکە رۆمی زادەی کۆمەڵێ کتێب بوو کە ئاگر لووشیدان یان لە ئاودا نوقم بوون و بەموعجیزەیەك گەڕانەوە، یان بەهۆی گفتوگۆیەکی رۆحانیەوە دیدارەکە لەناکاو، بەشێوەیەکی چاوەڕێنەکراو و حەپەسێن، رووی دا. دیدارێکی نەکردە لەنێوان دەروێشێکی نەناسراو و زانایەکی گەورەی ئاینی کە ناوبانگی دنیای پڕ کردوە، بەوە کۆتایی دێ پیاوە حەپەساوەکە بەو پیاوەی هەموو ئەو شتانەی خولقاند بڵێ "کاتێ لەناکاو تۆم دی، بەم شێوەیەم لێهات".

لە عەسری ئەو رۆژەی کۆتاییەکانی پاییزدا، ئێمەی موریدان کە تا دەهات خورپەمان زیادی دەکرد، خواخوامان بوو لەو ژوورە بێتە دەرەوە، لانیکەم بۆ ئەو سەعاتەی ئەو دەرسەی لەو رۆژەدا تایبەت بوو بۆ قسەکردن دەربارەی بڵندبوونەوەی پێغەمبەر بۆ ئاسمان "میعراج"، ئەو پلیکانەیەی لەگەڵ کیانی مرۆڤدا ئاوێتە دەبێ. بەڵام نەهاتە دەرەوە. وتمان مەولانا حەزی لەوەیە نوێژی مەغریب لەگەڵ موردیەکانی بکات بەدڵنیاییەوە مەغریب هەر دێتە دەرەوە، بەڵام مەغریبیش نەهاتە دەرەوە. سوڵتان وەلەد، کوڕە راساڵەکەی مەولانا هەستی کرد خەڵوەتی ئەم جارە لە هیچ خەڵوەتێکی پێشتر ناچێ، لەبەرئەوە ناردی بەدوای کیرای باوەژنیدا، کە دوو ساڵ بوو رۆمی لە دووەم ژنهێنانی مارەی کردبوو، ئەویش شتێکی ناباوی کرد و چووە ئەو ژوورەی پیاوان تێیدا کۆدەبنەوە و حیجابەکەیشی باش نەبوو، کە ئەوە لەوانە بوو کارەساتێك بقەومێنێ. سەبارەت بە حەقیقەتی ئەو پیاوە تازە هاتووە پرسیاری لێکردن.

"ئایا کەستان دەزانن ئەو پیاوە کێیە؟"

کەس وەڵامی نەدایەوە.

شەو هات. پیاوەکان وردە وردە بڵاوەیان لێکرد.

سوڵتان وەلەد داوای لە کیرا کرد بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی. سەرباری دڵناڕەحەتیەکەی داواکەی سوڵتان وەلەدی جێبەجێ کرد. پێش ئەوەی بچمە شوێنی خەوتنم زۆر بەئەسپایی لە ژوورەکە نزیك کەوتمەوە، کە وەك باقی ژوورەکان گومەزێکی بچوکی زەخرەفەکراوی بەسەرەوە بوو. گوێم نا بەدەرگاکەوە، گوێم لە هیچ ورتەورت و دەنگەدەنگێك، تەنانەت لە یەك وشەیش نەبوو، هەردوو پیاوەکە تەنها و کڕ و کپ لەوبەری دەرگاکەوە دانیشتبوون.

رۆژی دواتر، برواداران و خەڵکانیتر لە قوتابخانەکە کۆبوونەوە. هەندێ دەیانوت گوایە شەمس تەڵەکەباز و جادوگەرێکە و هیچیتر. هەندێ لە موریدەکان کە لە بەغدا و لە رۆژهەڵات و فەرغانە و سەمەرقەند و دەلهیەوە هاتبوون، بێزاری و پەستیی خۆیانیان لەو دۆخە دەربڕی. "چ مانایەکی هەیە ئەو هەموو

زەحمەتیەی ڕێگە بدەیتە بەر خۆت بۆ ڕێزنان لە مامۆستایەك كە تەنیا لەبەر بینینی كەسێكی هیچوپوچ كە كەس نازانێ كوڕی كێیە، خۆی بشارێتەوە؟"، لەگەڵ پیرە پیاوێكی زۆر هەستیار، وەك زریانوس بەخۆی دەوت، كە لەكاتی دیدارەكەیان لەوێ بوو و هەڵسوكەوتی شەمسی بینبوو.

كەس زاتی نەبوو بچێتە ناو ژوورە داخراوەكە و خەڵوەتەكەیان پێ ببڕێ. هەندێ پێشنیاریان كرد لەمدیو دەرگاكەوە بانگی ڕۆمی بكەین تا ڕێنماییەكانی و ئەركەكانی بەرانبەر خێزانەكەی بیر بخرێتەوە. بەدرێژایی شەو خەو نەچووە چاوی كیرا، هەر بیری لە هۆی گۆشەگیربوونی مێردەكەی دەكردەوە، بەڵام بێسوود بوو. تۆ بڵێی من داوای زۆرم لێكردبێ و ئەویش حەز بكات لە خزمەتی خوا و پێغەمبەرەكەیدا بێ؟ ئایا من توانام نەماوە ئارەزووی بوروژێنم؟ ئایا لەپڕ گەورە و پیر بووم؟

هەرچی عەلای كوڕە بچوكی ڕۆمییە، ئەو گەنجە تەبیات ڕەق و زبرە كە تەمەنی هێشتا حەڤدە ساڵی تەواو نەكردبوو، لەپشتی دەرگاكەوە دەستی كرد بەقسەوتن بەو غەریبەیەی بووبووە هاوبەشی باوكی لە ژوورەكەیدا، "تۆ كێی تا بوێری ماڵە خواناسەكەمان پیس بكەی؟" ئەنجا بەدەنگێكی نزمتر وتی "هەی گوی سەگ، هەی كەری خەساو".

سوڵتان وەلەد، كوڕە گەورەكەی، لە براكەی نزیك كەوتەوە و داوای لێكرد قوڕەكە خەستر نەكاتەوە. من و زریانوس، كە لەتەنیشت یەكتر دانیشتبووین، هەموو ئەوانەمان دی. برادەرە یۆنانیەكەم ناوبەناو مێزەرەكەی بەرز دەكردەوە و پرچە پەرشبووەكانی ڕێك دەكرد. دەبێ بەخۆی وتبێ كە هەر لەو ژوورە چووە دەرەوە بچێ بۆ لای سەرتاش.

میزاجی كوڕە بچوكە توندەكەم پێ سەیر نەبوو كە لەوانەیە لە هەر ساتێكدا بتەقێتەوە. زریانوس كە لە ماوەیەكی زۆر كورتدا توانی ببێتە هاوڕێیەكی دڵسۆز بۆ مەولانا و قووڵترین نهێنیەكانی لێوە فێر بوو، چەمایەوە و پێی وتم عەلا چەند شتێكی بەنرخی دزیوە.

وتی: "سوڵتان وەلەد بۆ هەندێ سكەی ئاڵتونیدا دەگەڕا كە ونی كردبوون، بەڵام لە كۆتاییدا لەناو یەكێك لە كتێبەكانی براكەیدا دۆزینیەوە".

باوەڕم پێنەكرد. ئاخر ناكرێ شتی وا لەژێر سەقفی ماڵی مامۆستای مامۆستاكان و شكۆی شكۆكاندا ڕوویدات، لە ماڵێكدا خوا خۆی لە خراپیی پیاوان دەیپارێزێ. زریانوس ئەوەیشی پێ وتم كە لەوەتی ڕۆمی كردویەتیە كوڕی خۆی، دووچاری غیرەیەكی توند بووە لەلایەن هەندێ لە موریدەكانەوە كە ناتوانن باوەڕ بكەن چۆن دەكرێ كۆنە تاوانبارێك لەپڕ ببێتە كەسی نزیكی مەولانا، ئەنجا وتی "ئەوان هەرگیز لە مەولانا تێناگەن".

ئێستا بینیم دەماری ئەو غیرەیە وا دەجولێ، ئەم جارەیان نەك بەرانبەر زریانوس، بەڵكو بەرانبەر شەمس. ئیتر لە هەموو ژوورێکەوە هەندێ مل، هەندێ رووی ناباو و نامۆ، کە هەمان فزولی تاڵ ناخیان دەخوات، بەرز دەبنەوە و دەڵێن "بۆچی من نیم؟"

سوڵتان وەلەد کە دەیزانی ئەو خەڵوەتە درێژە دەکێشێ، هەوڵیدا فزولیەکان دوور بخاتەوە، بەڵام من توانیم لەژێر پەردەی گەنگەشەکەم لەگەڵ زریانوس بمێنمەوە. سەرنجم دا و هەموو شتم دی.

کاسەیەکی پڕ لە سیری هاڕاو و لەتە نانە رەقە و شیری خەستکراوە، لەسەر سینیەك لە مۆبەقەوە گەیشت و لەبەردەم دەرگای ژوورەکەدا دانرا. سوڵتان وەلەد کە تا دەهات رێزگرتنی زیاد دەبوو نەیوێرا هەواڵ بداتە دوو خەڵوەتێکشەکە کە نان حازرە. ترسا خەڵوەتەکەیان لێ تێك بدات. لەبەرئەوە ئەو کوڕە ساڵحە وای بەباش زانی پارچە کاغەزێك لە درزی دەرگاکەوە بخاتە ئەودیو تێیدا هانیان بدات هەندێ لە خواردنەکە بخۆن. دوای کەمێك، دەرگاکە کرایەوە و دەستێك سینیەکەی راکێشایە ژوورەوە.

بینیم، ئەو دەستە، بەڵێ، بینیم. ئاخۆ دەستی گەورەم بوو یان دەستی "بدزەکەی"؟ کاتێ لە سوڵتان وەلەدم پرسی، وتی بۆی جیا نەکراوەتەوە هی کامیانە. زریانوس کە لەنزیك ژوورەکە دانیشتبوو کاتێ دەستەکە سینیەکەی راکێشا، سوێندی خوارد دەستی پیاوێکی سێیەم بوو. بەڵێ سوێندی خوارد: ئەوە دەستێکی سێیەم بوو. بەڵام ژوورەوە دوو کەس زیاتری لێ نەبوو، بەڵام ئیتر ئەفسانەکە بڵاو بووەوە.

رۆژی دووەم کیرای هاوسەری جارێکیتر هاتەوە بۆ قوتابخانەکە. ئەم جارەیان جلێکی پۆشتەی لەبەر بوو. حیجابە ئاوریشمیەکەی دوو پارچە بوو: پارچەی یەکەم لە کەمەری دەئالا و دەبووە تەنورەیەك، پارچەی دووەم پشت و شانەکانی دادەپۆشی و بەسەر ناوچاوانیدا شۆڕ دەبوویەوە. شێوەی لەبەرکردنی جلەکانی و زرەزری بازنە زیویەکانی جوڵەی باڵەکانیان جلەو دەکرد. حیجابەکەی بچوك بوو لە شاشی دیمەشقی بوو کە بەعادەت ژنانی کۆشك لەبەری دەکەن. هەروەها دەموچاوی دەشاردەوە، کە وەك دەموچاوێکی شەکەت و نیگەران دەهاتە بەر چاوم. وەك زریانوس –کە هەموو شت دەزانێ– وتی، ئەو دوو شەوەی رابردوو کیرا خەو نەچووەتە چاوی. چاوم چووە سەر گۆرەوییە ئاوریشمییە دووراوەکەی، دواین هاوار لە جلوبەرگدا کە لە وڵاتی دووری چینەوە لەگەڵ مەغۆلە داگیرکەرەکاندا گەیشتبوو. هەرچی ناز و نوزی مێینانەیە هیچ بۆ من کتوپڕ نەبوو، چونکە لە قۆنیە هەندێ ئافرەتی دەوڵەمەندی فارسم دەدی کڵاوە بە دەزووی ئاڵتونی دووراوەکانیان لەسەر دەکرد –لەگەڵ ئەوەی هێشتا بەحیجاب داپۆشرابوون– کە چەند پەڕێکی رەنگاوڕەنگیان بەسەرەوە بوو، لە رەنگەکانی دەشتاییە مەنگۆلیەکان دەچوون.

کیرا سڵاوی لە پۆلە پیاوێك کرد کە هەندێکیان، من یەکێکیان بووم، لەسەر داوای سوڵتان وەلەد توانییان بڕۆن. کیرا رووی کردە ژوورەکە و لەسەر زەوی دانیشت. گۆرەوییە چینیەکەی داکەند و حیجابەکەی رێك کرد. زریانوس رایکرد و بەڕەیەکی لەسەر زەویەکە داخست و مقەڵیەکی خستە بەرپێکانی

و هەندێ سەرینی لەدەوری ڕێکخست. دوای ئەوەی بەئاسوودەیی دانیشت، وا هاتە پەێش چاو کیرا ئامادەیە بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەردەم دەرگای ژوورەکەدا دابنیشێ. خزمەتکارێك چایەکی ناردینی بۆ هێنا کە بە بۆنەکەیدا ناسیمەوە، هەروەها سینیەك کە چەند دانەیەك لە هەویری بادامی لەسەر بوو کە گەورەی چێشتلێنەران بەتایبەت بۆ خاتوونی ماڵ ئامادەی کردبوو، لەگەڵ کەمێك زەیت و شەربەتی بادام. کیرا چەند قومێکی دا لە چایەکە بەڵام گوێی بە هەویرکارییەکە نەدا. من هێندە برسیم بوو دەمتوانی هەرهەمووی بەخێرایی ئاودیو بکەم. ئەوکاتە تەمەنم هەژدە ساڵ بوو، ئیشتیایەکی زۆرم هەبوو.

کیرا پاڵی دا بەدەرگای ژوورەکەوە و گوێی بە دەرگا تەختەیینەکەوە نووساند.

لەوکاتەی سەرجەم ئەندامانی خێزان خۆیان بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئامادە دەکرد، کیرا لەپڕ شوێنی خۆی گۆڕی. هەر دانیشتبوو، بەڵام پشتی بەتەواوی سوڕاند بەئاراستەی حەوشەکە تا بتوانێ لەڕێی درزی دەرگاکەوە تەماشای ناو ژوورەکە بکات. چی بینی؟ من تاکە کەس بووم ئەوم دی، ئەوانیتر هەموو سەرقاڵی نوێژکردن بوون. بەڵام بۆ ئەوەی باشتر ببینێ، هەستا و چووە ناو قوتابخانەکە. ژنەکەی رۆمی بۆ ساتێك لە چاوم ون بوو. کاتێ گەیشتمە رووکاری سەرەکیی بیناکە کە ژوورەکەی لێیە، بۆم دەرکەوت لەهۆش خۆی چووە. چەپکێك گوڵیش لە باوەشیدا بوو.

رامکرد بۆ لای و سەریم بەرز کردەوە. وام لێکرد چەند قومێك چا بخواتەوە، کاتێ بەهۆش هاتەوە گوڵەکانی هەڵگرت و وتی مەولانا بەدەستی خۆی پێشکەشی کردون و داوای لێکردوە ئاگای لێیان بێ. تەماشای گەڵاکانیانم کرد، لە هیچ لەو گوڵانە نەدەچوون کە لە ناوچەکەماندا سەوز دەبن. کیرا پێی وتم رۆمی دیوە رووی لە شەمس بووە. هەردووکیان بێدەنگ بوون. ئەوە یەکەم جار بوو دوو پیاوەکە ببینێ.

پاشان وتی "نیوەڕۆ مێردەکەم داوای لە شەمس کرد پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات، بەڵام شەمس رەتیکردەوە و وتی کەس بۆی نیە ئەوە بکات مەولانا نەبێ، مێردەکەیشم بەگوێی کرد".

لەوکاتەی کیرا ئەو چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە، چرپاندی بەگوێمدا: "ئەوان بەتەنیا نەبوون. شەش کەسیتر لە دەوریان بوون، بەڵام کاتێ نوێژ تەواو بوو نەمان و ئەم چەپکە گوڵەیان لەبەرپێی مەولانادا بەجێهێشت".

نەمزانی چی بڵێم و بیر لە چی بکەمەوە. شەش کەسیتر؟ لەکوێوە هاتن؟ تۆ بڵێی کیرا بیەوێ پێگوتنی شتێك بیرم بشڵەژێنێ، کە خۆی هیچی لەبارەوە نازانێ؟

پێش ئەوەی خاتوونی ماڵ بۆ لای خزمەتکارەکەی بسوڕێتەوە، داوام لێکرد گوڵێکم بداتێ، تەنیا یەك گوڵ، ئەویش سەخاوەتمەندانە چەند گوڵێکی دامێ.

دەستبەجێ چووم بۆ لای بۆنفرۆش (عەتار)ێك و لێم پرسی ئاخۆ جۆر و ناوی ئەو گوڵە دەزانێ، ئەویش وتی مەحاڵە، نە گەشی و نە رەنگ و نە بۆنی ئەم گوڵە لە هیچ لەو گوڵانە ناچێ کە لە پایزدا لە قۆنیە سەوز دەبن.

ئەم گوڵە چییە؟ تەواوی دوای نیوەڕۆم بە پرسیارکردن لە عەتاران و پزیشکان و ئەوانەی چارەسەر بەگژوگیا دەکەن و ئەوانەی مەڵهەم و بۆن دەگرنەوە، بەسەر برد. بەڵام بەبێ سوود. ئێوارە رووم کردە چێشتخانەیەکی میللی و گوڵە نامۆکانم لەبەردەم سینیەکی مسینی پڕ پاچە گۆشتی برژاودا دانا، شاگردەکانیش مێش و مەگەزیان لە خواردنەکە دوور دەخستەوە.

پیاوێکی هیندی لەتەنیشتم دانیشت. تەماشایەکی سینیەکەمی کرد و لێی پرسیم ئاخۆ پێم باشە ئەویش داوای ژەمێکی وەك ئەوەی من بکات. نەمزانی چۆن ئامۆژگاری بکەم چونکە دەنگۆی ئەوە هەبوو کە چێشتلێنەران گۆشتی حەرامی وشتر لەباتی کۆشتی مەڕ لە ئامادەکردنی ئەو خواردنەدا بەکار دێنن، پاشماوەی جۆراوجۆری تێکەڵ دەکەن، پاشان زەعفەران و مێوژی تێدەکەن تا لە کۆتاییدا تامی خواردنەکە خۆش دیار بێ.

کاتێ پیاوە هیندیەکە سەرنجی پارچە گۆشتەکانی سەر سینیەکەی منی دەدا تا بزانێ ئاخۆ تازەیە، گوڵەکانی کەوتنە بەرچاو و لێی پرسیم ئاخۆ من لە ساراندیب لە دورگەی سیلانەوە هاتووم. وتم نەخێر، وتی ئاخر ئەوە تاکە شوێنە ئەو گوڵانەی لێ دەڕوێ.

زیاتر شڵەژام. ئەو شەوە هەزار و یەك پرسیارم لەخۆم کرد، بەبێ ئەوەی وەڵامێکم دەست بکەوێ. رۆژی دواتر، گەڕامەوە قوتابخانە و بەسەرهاتەکەم بۆ زریانوس گێڕایەوە. بەڵام ئەو یۆنانییە نەك هەر لەوە ئاگەدار بوو کە لەگەڵ کیرا رووی دابوو، بگرە بەهۆی ئەوەوە زانیاریی زیاترشی لەلا بوو: بەیانیی ئەو رۆژە کاتێ کیرا گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی لەبەردەم ژوورەکەدا، مێردەکەی بەهەڵەداوان هاتە دەرەوە و داوای لێکرد چەپکە گوڵەکە پیشانی هیچ موریدێك نەدات و وتی: "ئەوە دیارییەکە باخەوانەکانی بەهەشتی دنیا لە هیندەوە بۆیان هێناوی. ئەم چەپکە گوڵە ئارامگەی رۆح و چاوی جەستەت شیفا دەدات".

کیرا بۆ ماوەیەکی زۆر پارێزگاری لەو گوڵانە کردبوو، لەو ماوەیەدا نە سیس بوون و نە رەنگیان گۆڕا. دوای ئەوەی رۆمی خەڵوەتەکەی بەجێهێشت رێگەی بە کیرا دا گوڵێك یان دوو گوڵیان بداتە خوشکی سوڵتان کە چاوی تووشی نەخۆشیەك بووبوو.

منیش پارێزگاریم لەو گوڵانە کرد کە دانی پێم و وەك چاوی خۆم چاودێریم دەکردن، بەڵام هەوڵم نەدا بەکاریان بێنم لەترسی ئەوەی نەوەك بیانبینم کاریگەرییان نیە و بێئومێد بم، هەروەها بۆ ئەوەی گەورەم نەفرەتم لێ نەکات کە لەوانەیە، بەهۆی نەزانیمەوە، بە فێڵبازم دابنێ.

لە ڕۆژی چوارەمدا سوڵتان وەلەد داوای لێکردم لەپاڵ ژوورەکەدا بمێنمەوە تا ئاو بۆ خۆشتن بدەمە دوو پیاوەکە —ڕۆمی شەیدای خۆشتن بوو— و زبڵ و پاشماوەکانیش فڕێ بدەمە چاڵێك. ئەو کارە ئەگەرچی ئەرکێکی وەك هەندێ دەڵێن بێنرخە، بەڵام من بەکارێکی شەرەفمەندانەم دەبینی.

کاتێ بەڕەسمی ڕێگەم پێدرا تەواوی شەوەکە لە دووریی چەند پێیەك لە ڕۆمی و "بدزەکەی" بەسەر ببەم، چاوەڕوانم کرد تا سەرجەم خزم و خوێش و دۆستان چوونەوە، تا بەئارەزووی دڵ خۆم مەڵاس بدەم و بزانم بەڕاستی چی ڕوو دەدات. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر ئەوەدا، هەزار جار لە مەولانا پاڕامەوە لە سەرچڵی و هەڵەشەییەکەم ببورێ، چونکە ئەوکاتە تەمەنم بیست ساڵ تێپەڕی نەکردبوو.

لەو ئێوارەیەدا، خۆم بەعەبایەکی ناو فەرووەوە پێچاوبوویەوە تا گەرمم بکاتەوە، لە درزی دەرگاکەوە ڕۆمیم دی لەبەردەم مۆمدانێکدا کە بەقەدەر باڵای درێژە دەچەمێتەوە، کتێبەکەی باوکی لە سەرەتای شەوەوە تا بەرەبەیان دەخوێنێتەوە، کاتێ ڕۆژ بوویەوە ڕۆمی سەبارەت بە ناوەڕۆکی وشەکانی باوکی پرسیاری لە ڕۆمی کرد، شەمس وەڵامی دایەوە، "واز لە خوێندنەوە بێنە! واز لە خوێندنەوە بێنە! واز لە خوێندنەوە بێنە!"، ڕۆمیم بینی دەستنووسە ئەسڵیەکە "المعارف" دەخاتە لاوە، پاشان گوێم لێ بوو لە شەمسی دەپرسی، "من ئەبێ چی بکەم؟".

خەڵکانیتریش وردە وردە هەستان. گوێم لە دەنگی سەتڵ و جەنجەڕی بیر بوو. هاتنی بۆنی کێکی گوێزی هیندی لە مۆبەقەوە کاتی نانی بەرچایی ڕاگەیاند. من خۆم ئامادە کردبوو بۆ ڕۆیشتن، کتری و دەفرێکی مسینم هەڵگرت، کاتێ دەنگی شەمسم بەرگوێ کەوت کە هەمان پرسیاری دووبارە دەکردەوە "من ئەبێ چی بکەم؟". گەورەم بەم بەیتانە وەڵامی دایەوە:

**کاتێ تینووت ئەبم**

**ئاوم مەیەرێ**

**کاتێ ئاشقت ئەبم**

**خەو لە پێڵوەکانم بدزە**

پاشان وتی، "پێویستە من چی بکەم؟". شەمس وەڵامی دایەوە، "قسە مەکە. قسە مەکە. قسە مەکە".

لەبەرئەوەی قەناعەتم وابوو ئەو بێدەنگیەی شەمس فەرمانی پێکرد، فزوڵی دانەمرکاندمەوە، ماوەیەك شوێنەکەم بەجێهێشت. کاتێ گەڕامەوە لە سوڵتان وەلەدەوە زانیم ڕۆمی ڕازی نیە بەهیچ شێوەیەك قسە بکات. بۆ ماوەیەکی درێژ یەك وشە لەناو ژوورەکەوە نەدەبیسترا. لەکۆتاییدا، ڕۆژێکیان شەمس فەرمانی پێکرد بێدەنگیەکەی بشکێنێ.

سوڵتان وەلەد پێی وتم: "باوکم لێی پرسی بۆچی،.. شەمس وەڵامی دایەوە داوای شتێکیدیکەی لێ دەکات. داوای کچۆڵیەکی جوانی کرد، بەڵێ کچۆڵەیەکی جوان، باوکم بانگی کردم و داوای کرد بە کیرا بڵێم بێت، ئەویش هات".

کیرا بەها و جوانی و شۆخ و شەنگی بەرجەستە دەکرد. چووە ژوورەکە و بینی هەردوو پیاوەکە لەسەر تەختێك دانیشتون و پاڵیان داوە بەهەندێ سەرینی مەخمەڵی گەورەوە: دۆشەك و بەتانیەکان بەباشی دەق کرابوون و پاڵ درابوون بەدیوارەکەوە. شتی جۆراوجۆر خرابوونە ناو باوەڵە مسینە بەزیو سواقدراوەکان، جگە لە دەستنووسەکانی سوڵتانی زانایان و یەکێك لە شاعیرانی عەرەب. رۆمی بە ژنەکەی گوت شەمس چیتر رێگەی پێنادات کارەکانی باوکی و قەسیدەکانی ئەو شاعیرە بخوێنێتەوە. پێی گوت دەتوانێ کتێبە پەرشوبڵاوەکانی ژوورەکە بۆ ژوورێکیتر بگوێزێتەوە، پاشان داوای لێکرا بە مەینەتیەکدا تێپەڕ ببێ، ئەویش بەوەی وەك بەڵگەیەك لەسەر رێزگرتنی رۆمی بۆ شەمس، خۆی بەشەمس ببەخشێ ئەگەر حەزی لێ بوو، ئەگەر وەك دیاری قبوڵی کرد.

بەڵام شەمس دەستبەجێ ئەوەی رەت کردەوە.

سوڵتان وەلەد بۆی باس کردم کیرا چەند قەڵس بووە، بۆچی مێردەکەی داوای لێدەکات خۆی بەو پیاوە غەریبە ببەخشێ؟ ئاخر رۆمی، جەلالەدین، بەر لە دەرکەوتنی شەمس، پیاوێکی بەغیرە و هەستیار بوو، تەنانەت رێگەی پێنەدەدا سەردانی ئافرەتانیش بکات.

کاتێ کیرا، بەکتێبەکانەوە، ژوورەکەی بەجێهێشت، داوای لە سوڵتان وەلەد کرد جێگەکەی ئەو بگرێ، چونکە شەمس وتبوی ئەو "خوشکی رۆحیەتی" و ناتوانێ دەستی لێ بدات. پاشان شەمس داوای گەنجێکی قۆزی کرد، رۆمیش داوای لە ژنەکەی کرد بانگی سوڵتان وەلەد، "یوسف" بکات.

کوڕە راساڵەکەی رۆمی پێی وتم: "جا نۆرەی من هات تا ببمە قوربانی"، بەڵام شەمس منیشی رەت کردەوە لەکاتێکدا ئامادە بووم لەخۆبوردوانەترین کار ئەنجام بدەم، ئەویش ئەوەیە پێڵاوەکانی بسرم، بەڵام رەتیکردەوە و وتی ئەو بەکوڕی خۆیم دادەنێ.

شەمس ئەویشی وەك کیرا رەفز کرد. من لە وشەکانی سوڵتان وەلەددا سەرسامیەکی نهێنیم دی بەو پیاوە تەورێزییە. ئەو دڵسۆزترینی دڵسۆزەکانە و کوێرانە گوێڕایەڵی باوکی دەکات و لە مەترسیدارترین و تاریکترین رێچکەکاندا شوێنی دەکەوت.

حیکایەتخوان لە گێڕانەوەی حیکایەتەکەی بەردەوام بوو لەکاتێکدا من بڕیارم دا تێبینیەکانم تۆمار بکەم چونکە هەرچی بیستبووم نامۆ دەهاتە پێش چاو، کە ناکرێ باوەڕی پێ بکرێ. لەوکاتەوە، لەو مێژەی لەسەریم دەنووسی جیا نەبوومەوە، کە جامێکی لە تەختەی سنەوبەری رازاوە دروستکراوی لەسەربوو،

قوتویەك مرەكەب و چەند قەڵەمێكی قامیشی دادراو و چەند خلۆرەیەك لە كاغەزی چینی لەناودا بوو. ئەمڕۆ دوای ئەوەی چاوێکم بە جامە کۆنەکەدا گێڕا، سەرجەم ئەو یادەوەریانەم گێڕایەوە. بەردەوام دەبم.

پاشان سوڵتان وەلەد وتی شەمس داوای مەی کردوە، رۆمی خۆی چووە دەرەوە، هەموو کەس بینی ساتێك لە ژوورەکە چووە دەرێ و داوای لە خزمەتکارەکە کرد لەباتی ئەو بچێتە گەڕەکی جولەکان و قاپێك ئارەقی باشی بۆ بکڕێ.

لە تۆمارکردنی تێبینی بەردەوام بووم. کاتێ خزمەتکارەکە شەرابەکەی لەودویو دەرگای ژوورەکەوە دانا کە خوا و پێغەمبەرەکەی خواردنەوەیان حەرام کردوە، شەمس هاوارێکی کرد هەمووان گوێیان لێ بوو و بەدەنگی بەرز وتی: "سوێند بەو یەکەمەی جگە لەو کەس یەکەم نیە، هەروەها بەو دواییینەی جگە لەو کەس دوایین نیە لە سەرەتای گەردوونەوە تا کۆتایی گەردوون، پیاوێکی وەك تۆ نەبووە و نایشبێ".

پاشان سوڵتان وەلەد بۆی باس کردم و بەوە ئەم چیرۆکەی کۆتایی پێ هێنا، کە شەمس جلەکانی خۆی دادڕیوە و سەری لەبەر پێی باوکیدا، واتە رۆمی، داناوە. لەو ساتەدا ئەوەم بەبیردا هات کە ئەگەر شەمس داوای لێ بکات ژنەکەی و چوار کوڕەکەی بکاتە قوربانی، دەیکردن.

# شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە

دوای چل ڕۆژ لە خەڵوەتکێشان، دوای چل ڕۆژ لە چاوەڕوانی، سەرمای زستان سەختتر بوو. ئێوارەی ڕۆژێکیان بەفر حەوشەی ماڵەکەی بەتەواوی داپۆشی، پێشنیارمان کرد مێزێکی نزم لە ژوورەکەدا دابنرێ کە چەند بەتانیەکی پێدا درابێ و ئاگردانێکی لەژێردا دابنرێ (کورسی). بەڵام پێشنیارەکەمان لەلایەن ڕۆمی و شەمسەوە ڕەت کرایەوە و وتیان دەیانەوێ ژوورەکە بەتاڵ بێ. کورسی بۆ ئەوەی ژوورەکە باش گەرم بکاتەوە شوێنێکی زۆر لە ژوورەکە داگیر دەکات. قسە و قسەڵۆك پەیدا بوو، بەچپەچپ پرسیار دەکرا: بۆچی ڕۆمی پێویستی بە شوێنێکی بەتاڵ لە ژوورەکەدا هەیە لەکاتێکدا دنیا زۆر ساردە؟

وانەکان لە قوتابخانە وەستان و چیتر قوتابی بۆ نەدەهاتن. بۆشاییەکی گەورە دروست بوو. چاوەڕوانیەکی درێژ. چینەکانی تەپوتۆز و داوی جاڵجاڵۆکە نیشتنە سەر یەك. ژمارەیەکی کەم لە موریدانی دڵسۆز ڕۆژانە لە ئەنجامدانی نوێژەکانیان لەژێر نیگا تەنزئامێزەکانی باخچەوانەکەدا کە سەرقاڵی بەفرماڵین بوو، بەردەوام بوون.

وردە وردە قوتابیانی بیانی گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان. پاش وەستانی وانەکان، چیتر مانەوەیان دوور لە ماڵی خۆیان و بەرگەگرتنی ئەو هەموو خەرجە بێسوود بوو بۆیان. هیندیەکان چوونەوە، بەدوواياندا ئەو قوتابیانەی لە هیرات و سەمەرقەندەوە هاتبوون، بەدوای ئەوانیشدا قوتابیانی عەرەب. زریانوس هەوڵیدا هەندێکیان قایل بکات بە مانەوە و هەندێ چاوەڕوانکردن، چونکە ئەوەی پاش تەواوبوونی خەڵوەتە نائاساییەکە دەیبینن بەرانبەر هەزار وانەیە لە عیرفاندا. بەڵام قسەکانی گوێیان بۆ نەگیرا، چونکە ئەوان هەموو خەمیان بریتی بوو لەوەی دەفتەرەکانیان بە شتی تیۆری پڕ بکەنەوە. پاشان یۆنانیەکانیش چوونەوە.

دوو هەفتە تێپەڕێ بەبێ ئەوەی هیچکام لەو دوو پیاوە کەمترین ئاماژە بدەن بۆ ئەوەی دەیانەوێ لەو خەڵوەتەیان دەربچن و بگەڕێنەوە جیهان. لەوکاتەی لەبەردەم ئەو ژوورانەدا تێدەپەڕیم کە دەوری حەوشەکەیان داوە، سوڵتان وەلەدم بینی وەستاوە و بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە. وەستام تا لە خولانەوە نامۆکەی بوویەوە و پێش ئەوەی بچێتە ژوورەکە. هەر کە منی بینی لە خولانەوە وەستا و پێی وتم هەر ئێستا باوکی دیوە بەرێنمایی شەمس ئەو سەمایە دەکات.

"سەما؟" لێم پرسی.

پاشان وتی: "بەباشی سەرنجم دا. باوکم دەخولایەوە، ناولەپی دەستی ڕاستی بەرەو ئاسمان بەرز کردبووەوە، دەستی چەپیشی بەرەو زەوی، وەك ئەوەی لە هەمان کاتدا هەم خاڵ و بازنەیش بێ. دەخولایەوە و دەخولایەوە بەبێ ئەوەی ریتمەکەی بگۆڕێ".

سولّتان وەلەد دەستی راستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، دەستی چەپیشی بۆ خوارەوە شۆڕ کردەوە، بەو شێوەیەی رۆمی دەیکرد. بەلاّم کاتیّ دەستی بەسوڕانەوە کرد، چورتمیدا و کەوت.

"لەبەیانیەوە مەشقی لەسەر دەکەم، بەلاّم زەحمەتە".

بەچاوە نیوە قوچاوەکانی و بە دەمە کەمێك دەچەقاوەکەی، هەندیّ جولّەیتری ئەنجام دا، بالّەکانی لەیەك ئالاّند و سەری بەرەو شانی خوار کردەوە، ئەنجا پێی وتم کە باوکی پێش بینینی شەمس کاتیّ لە رامان و گەشانەوەی ئاینیدا رۆبچوایە، رازی نەدەبوو گوێی لە هیچ جۆرە مۆسیقایەك بیّ، تەنانەت ئەگەر مۆسیقایەکی رۆحیش بوایە. کاتیّ گەنج بوو دایکی هەولّی دابوو فێری مۆسیقا و سەمای بکات، بەلاّم ئەو دوودلّ بوو، نەیتوانیبوو دەرك بەو شادومانییە ناوەکییە بکات کە دەکریّ لە ئاهەنگی ئامێرە مۆسیقیەکان هەستی پیّ بکات. دەستی بەشێوەیەکی نەزانانە دەجولاّند.

"بەلاّم ئێستا تەماشای بکە! وا دەخولێتەوە".

ئەم جولّەیەی سولّتان وەلەد باسی کرد، کە  پاشتر ناوی دەنیّ سەمای "بیستن" و سەمایەکی رۆحییە، تێیدا سەماکەر دەخولێتەوە. خولانەوە سەماکەر دەکاتە ئەلّقەی پەیوەندی لەنێوان ئاسمان و زەویدا، ئەو کەسەی گۆڕانەکە لەرێیەوە روودەدات. پاشان رۆمی بە دامەزرێنەری ئەو سەما و رێگەیە دانرا کە پێی دەوتریّ "دەروێشە خولاوەکان".

کوڕەکە واقی وڕمابوو، لە گۆڕانەکەی باوکی تووشی سەراسیمە بووبوو. رۆمی، ئەو پیاوە خواناسەی تا ئەوکاتە لە نوێژ زیاتر هیچی نەدەزانی، بەلاّم ئێستا سەما دەکات، دەخولێتەوە. بەلاّم من، زیندوێتیی گەنجانەی خۆم سولّتان وەلەدم پرسیارباران کرد: ئەی کێش و زرنگە و ریتمی جولّەکانی رۆمی چۆن بوون؟

"هەنگاوەکانی لەگەلّ دەنگێکی نەبیستراو هاوئاهەنگ دەبوو. شەمس هەندیّ جار پێی دەبڕی، پاشان هەندیّ جار لەگەلّی دەخولایەوە و مۆمدانە درێژەکەیشی بەدەستەوە بوو و بازنەیەکی دروست دەکرد".

کوڕە راسالّەکە رووی کردە دەلاقەیەك کە چەند پارچە ئاوێنەیەکی لەسەر بوو، هەروەها قورئانێکی بریسکەدار و چرایەکی رەنگ زیوی لەناودا بوو. ئامێرێکی رەبابەیەکی هەلّگرت. وا نەدەهاتە پێش چاو بوونی ئەو ئامێری رەبابە لەتەنیشت کتێبی خودا شتێکی گونجاو بیّ، ئیماندارە توندڕەوەکان دەلّێن: "شوێنی ئەم ئامێرە پیسە ئێرە نیە".

"شەمس خۆی ئەم ئامێری رەبابەیەی دامیّ" سولّتان وەلەد روونیکردەوە. "دەیزانی من لەپشت دەرگاکەوە سەیر دەکەم، کاتیّ لە خولانەوە بەدەوری مۆمدانەکە بووەوە بانگی کردم بچمە ژوورەوە، ئەوە دووەم جار بوو بچمە ئەو ژوورە. کاتیّ چوومە ژوورەوە، لەبەردەمیدا چەمامەوە.

"وەك نەریتی خۆی باوکم پرچی سەرمی ماچ کرد و رۆژانی منداڵیمی بیر خستمەوە، ئەو رۆژانەی تێیاندا ماچی دەکردم، پرچمی ماچ دەکرد. پاشان شەمس پێی وتم: "سولّتان وەلەد! تۆ تاکە کەسیت لەم

دەرگاوە کە جیهانەکەیتر لەم جیهانە جیا دەکاتەوە، هاتویتە ژوورەوە. ئەم رەبابە بگرە و بچۆ بۆ لای والی و ئامێرەکەی بۆ بگێڕەوە".

رێگە بە کوڕەکەی رۆمی درا ماوەیەکی درێژتر لەلایان بمێنێتەوە، رەبابەکەی بەدەستی هەڵگرتبوو تا وێنەی باوکی لە یادەوەریی خۆیدا بپارێزێ کە سەمای دەکرد و دەخولایەوە و بەوردی رێنماییەکانی ئەو پیاوە پیرە چرچۆڵە، لەڕ و لاوازەی جێبەجێ دەکرد، کە پێی دەڵێن شەمس.

من و سوڵتان وەلەد لە ئامێرە نائاساییەکە ورد بووینەوە کە ناکرێ تا پاش دەستپێکردنی خەڵوەتەکەیان برابێتە ژوورەکەوە. ئاخر کێ دەوێرێ شتێك بێنێ کە یاسا ئاینیەکان هێنانی بۆ ئەو ماڵە پڕ لە خواناسییە حەرام دەکەن؟ لەناو دەستوپێوەندەکانی رۆمیدا کەسێك ناناسرێ لە ژەنین یان گۆرانی یان سەما بزانێ. سەرجەم موریدەکانی، لە ئەمیرەوە تا پینەچی، لە دینداراني دەمارگیرن و لەسەر وشە و فەرموودەکانی پێغەمبەر و تەفسیرەکانی موفەسیران پەروەردە کراون، مەحاڵە سەماکەرێکیان تێدا بێ. ئایا راستە (ئەو ئامێرە) ئامێری والیی قۆنیەیە؟ ئەو پیاوە پایەبڵندەی، پێش خەڵوەتی ئەو دووانە، پەرۆش بوو بۆ ئامادەبوون لە سەرجەم وانە و وتارەکانی رۆمیدا. پاش دەستپێکردنی خەڵوەتکێشانەکەیش چەند جارێك هات و لەبەر دەرگای رۆمی وەستا و سۆراخی مامۆستاکەی پرسی کە ئاخۆ لە خەڵوەتەکەی دەرچووە یان نا، ئەویش ئیتر خەریك بوو سەبری نەدەما و زۆر قەناعەتی بەو تەفسیرانە نەبوو کە سوڵتان وەلەد دەیهێنانەوە. وەك ئەوانیتر، هەموو داوای ئەویش ئامادەبوونی مەولانا و سوودبینین بوو لە زانستە فراوانەکەی.

من دڵنیا بووم والی لە دووایین سەردانیدا رەبابەی پێ نەبوو. ئەی کێ ئەو ئامێرە نەزۆك و دنیاییەی هێناوەتە ماڵی ئەم زانا گەورەیە و بوونی چ سوودێکی هەیە؟.

سوڵتان وەلەد ئەو سندوقەی پشکنی کە دەنگی لێوە دەردەچوو. ژێکە لەریەوە و یەکەم دەنگی ئامێرێکی مۆسیقی لەژێر بنمیچی ماڵی رۆمیدا بیسترا، لە ترس و خۆشیدا موچرکەم پێدا هات. ئێستا پێویستە دەست بەکار بین، چونکە شەمس داوای کرد ئامێرەکە بگێڕینەوە بۆ ئەو کەسەی گوایە خاوەنیەتی. روومان کردە ماڵی والی.

ئەوە یەکەم جار بوو بچم بۆ کۆشکی والی. راڕەوێکی پانمان بڕی کە بە درەختی ئارەوەن (سەرو) تەنرابوو دەچووە ناو گۆڕەپانێکی ناوخۆیی. بە بینینی باخە پرتەقاڵەکەی لای چەپم سەرسام بووم. وا بڵاوە والی ئەو درەختی پرتەقاڵانەی لە چینەوە هێناوە، جا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاوهەوای قۆنیەدا خۆیان بگونجێنن پێش ئەوەی لە بێستانەکەیدا بیانچێنێ دابوونی بە شەتڵەوانە شارەزاکەی خوزستان. بەدرێژایی ئەو پلیکانە کەمانەی دەچوونە ناو باڵەخانە سەرەکیەکە پشتێنەیەکی تەسکی گوڵە شلێر درێژ بووبووەوە، لێرەدا چەند بەیتێکی شاعیری مەزن عەتارم بیر کەوتەوە، کە گوڵە سوورەکان دەڵێن:

له گەشتی خۆشەویستیدا

لەبەرچاوی

هەردوو جیهانەکە

دیار نەمام و فەوتام

چیدی لێم ناپرسی

نە لە ناوم

نە لە شوێنەوارم،

لەم دوو جیهانەدا

لە گەڵای درەخت،

ناو و شوێنەوارم ون بوون

ون بووم، ون بووم.

ون بووم،

مرۆڤ چۆن ئەکرێ بزانێ

ئەگەر تۆ نامناسی،

ئیتر چۆن ون بووم.

رێژگەی گوڵەکان و راڕەوەکان و درەختەکان زۆر هاوئاهەنگ رێك خرابوون.

ئەو ئەستێلکەی لە ناوەڕاستدا بوو تاکە شت بوو جمکی نەبوو. هەروەها پارێزگاری لە پلەیەکی دیاریکراوی گەرما دەکرا تا نەیبەستێ، نافورەکە بەبەردەوام دەزولەیەك ئاوی فڕێ دەدا کە لە زستاندا بەهەوادا سەمای دەکرد. بەژێر سابات/رواقێکدا تێپەڕین کە چەند جۆگەلەیەکی ئاو دروستیان کردبوو کە بەسەر راڕەوەکە دەڕۆیشتن و پاشان لە لاکەیتر دەڕژانە سەر زەوی. یەك تنۆك ئاویش بەسەرماندا نەکەوت. چەند تاوسێك کلکەکانیاندا شی کردبووەوە و بەدەور و خولماندا دەهاتن تا سەرنجمان بۆ لای خۆیان رابکێشن و سەرنجمان لە رکابەرەکە ئەبەدیەکانیان واتە قاز، دوور بخەنەوە.

خزمەتکارێك بردینی بۆ هۆڵێکی گەورەی پێشوازیکردن. لەکاتێکدا کەوتینە وردبوونەوە لەو شکڵانەی لەسەر مافورەکە وێنە کێشرابوون، خەیاڵمان وەك باڵندە –وەك ئەوەی لەسەر مافورەکە کێشرابوو– لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕی. جلەکانمان بۆنی دوکەڵی بخوردی هیندییان گرت و بۆنەکە تا چەند هەفتەیەك لە

جلەکانی من و سوڵتان وەلەد نەدەبووەوە، خەڵك لێیان دەپرسین "ئایا تازە لە گەشتێکی هیند گەڕاونەتەوە؟".

کاتێ والی زانی هاتووین، بەپەلە هات بۆ بینینمان. ریشی بەو زەیتی بوراقەی لە دیمەشقەوە هێنرابوو دەبریسکایەوە، کلێکی تۆخی ئەسفەهانی دەوری چاوەکانی دابوو، پاڵتۆیەکی سووری لە فەروی رێوی دابوو بەسەر عەبایەکی درێژی مەخمەڵی رەنگ یاقوتیدا، مێزەر و گۆرەوییە رەنگاورەنگەکانی وێنە کێشراوەکانی سەر مافورەکەی بیر دەخستەوە. هەرچی نەعلەکانی بوون لە نەرمترین و ناسکترین چەرمی مەغریبی دروست کرابوون.

سوڵتان وەلەد هۆی چوونەکەمانی بۆ والی باس کرد، رەبابەکەی لێ وەرگرت و بەوردی تەماشای کرد، بەڵێ ئەوە ئامێرەکەی ئەوە، بەڵام تێنەگەیشت چۆن گەیشتۆتە ژوورەکەی مەولانا، چونکە شەوی رابردوو ژەنیارێکی سەمەرقەندی لە ژوورەکەیدا ئاوازێکی پێ دەژەنی بەناوی "بتە چینییەکان".

بەرەو ژوورەکەی بردین، مەملەکەتی بیستن کە تێیدا هەستەکانیتر چێژ وەردەگرن، لەسەر دەرگاکەی بە خەتێکی جوانی ئاڵتونی دەستەواژەیەك نووسرابوو، داوای لە سەردانیکەران دەکرد بەهەستەوە گوێ رادێرن: "لێرە، مەخۆ، مەخۆرەوە، قسە مەکە، مەخوێنەوە، بەڵکو تەنها گوێ شلکە".

کورسی و قەنەفە عاجییەکانی سەر مافورەکە تاکە کەلوپەلی ناو ژوورەکە بوون. هەندێ دەلاقە لەسەر دیوارەکە هەبوون لە شێوەی ئەو ئامێرە مۆسیقیانەی تێیدا دانرابوون. یەکێك لەو دەلاقانە کە لە شێوەی ئامێری رەبابەدا بوو بەتاڵ بوو. والی لە دەلاقە بەتاڵەکە نزیك کەوتەوە و رەبابەکەی خستەوە جێگەکەی خۆی.

نەماندەتوانی ئەم رووداوانە لێکبدەینەوە چونکە ئێمە قوربانیی ئەو رووداوانە بووین. والی یان سوڵتان وەلەد یان من پێویستمان بە سیحر نەبوو تا باوەڕ بە جیاوازیی ئەو گژبەری (تەحەدا)یە بێنین کە شەمس و رۆمی خۆیانیان خستبووە ناوی. بەلای والی و کوڕەکەی رۆمی و منەوە موعجیزەکە بریتی بوو لە دیداردەکەیان و یەکگرتنە هەمیشەییەکەیان.

کاتێ کۆشکی والیمان بەجێهێشت، باوەشێن فرۆشێکی نابینا یەخەی گرتین —وەك هەموو باوەشێن فرۆشان تا بتوانن بەئاسانی بچنە ناو شوقەکانی ئافرەتان— تا مێشکوژێکی لە پەلکی دارخورما دروستکراوی لێ بکڕین، هەروەها داوای لێ کردین گسکێکی کلۆشە برنج و شقارتە بۆ بەخێرایی داگیرساندنی خەڵوزی بەردین و تەڵە مشکی لێ بکڕین. کاتێ لەوە دڵنیا بوو حەزمان لە کڕینی ئەو باوەشێن یان شقارتانەی دەیانفرۆشێ نیە، پێداگری کرد لەسەر ئەوەی دەتوانێ بە هەندێ شتیتر سەرنجمان رابکێشێ و وتی، نهێنیەکی لەلایە کەس نایزانێ.

وتی: "دوێنێ ئێوارە ئەو پیاوەم بینی کە پێی دەڵێن شەمس چووە ناو کۆشکی والی و هاتە دەرەوە رەبابێکی لەبن دەستدا بوو، هەر ئەو رەبابەی ئێوە گێڕاتانەوە بۆ والی".

"ئایا بینیت؟"

"بەڵێ".

"بەڵام تۆ نابینایت".

"من شتی وا دەبینم ئێوە ناتوانن بیبینن. من بەچاوی دڵم دەبینم".

پاشان ئەو پیاوە کە چاوەکانی بە دەستەسڕێك داپۆشیبوو قسەکانی تەواو کرد و باسی لەوە کرد، ئەو جارێکیان شەمسی لە تەورێز و لە دمەشق دیوە دەچێتە کۆشکی ئەمیرەکان، ئامێرە مۆسیقیەکانیان دەبات و دەڕوات، بەبێ ئەوەی کەس بتوانێ رێگری لێ بکات. دووپاتی کردەوە کە ئەو "بینیویەتی"، شەمسی بینیوە. لەکاتێکدا ئەو کوێر بوو.

مانگێك بەسەر دیدارەکەدا، یەککگرتنەکەدا تێپەڕی. رۆژێك نەبوو قوتابیەکان لەبەردەم دەرگای قوتابخانە کۆنەبنەوە. سوڵتان وەلەد لە حەوشەکە دووری دەخستنەوە تا دەنگەدەنگی تووڕەییەکەیان نەگاتە گوێی دوو خەڵوەتکێشەکە. هەندێ جار توندیی ماندوێتی و شەکەتی تووڕەیی ئەو قوتابیانەی خەفە دەکرد و لە دوورەوە بزەی چاویان دەهات بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ شتێك بکەن. ئەو پیاوەی مامۆستا و مورشیدیان بوو لایدا و خەریکە بگەنە ئەو باوەڕەی ئیتر لەدەستیان داوە.

لە حەرەملکیش کیرا کەوتە دڵەڕاوکێ. ئەو گەنجێکی جوان بوو، هێشتا تامەزرۆی مێردەکەی بوو، کە وا لەژێر سەقفی ماڵەکەیاندا شەو لەگەڵ پیاوێکی پیر بەسەر دەبات. عەلا، برای سوڵتان وەلەد، هەموو بەیانیەك سوێندی دەخوارد کە سنوورێك بۆ ئەو خەڵوەتکێشانە دادەنێ، کلۆمی ژوورەکە دەشکێنێ و باوکی لە چنگی ئەو پیرە پیاوەی لە تەورێزەوە هاتووە رزگار دەکات. بەڵام ئەوەی نەکرد، چونکە دەسەڵاتی باوکایەتی رێگر بوو لەوەی پەنا بۆ رەفتارێکی لەو جۆرە ببات. بەهۆی دۆستایەتیمان لەگەڵ سوڵتان وەلەد، من و زریانوس دەمانتوانی هەندێ بەئازادانە لەنزیك ژوورەکە بجولێینەوە و هەوڵ بدەین لەو شتانە تێبگەین کە دەرگای تێگەیشتنیانمان لێ داخراوە.

شەوی پاش رۆژی سی و نۆیەمین شەمس داوای لە سوڵتان وەلەد کرد بچێتە ژوورەوە. پیرە پیاوەکە کوڕە راساڵەکەی مەولانای بردە پەنایەکەوە و بەگوێیدا چرپاند.

"وازم لە مشایخەکان هێنا و ژیانم هەڵبژارد. لە وەفاتی پێغەمبەرەوە کەس نەیتوانی بەو شێوەیە گوزارشت لە خۆی بکات کە م دەیکات (شەمس بە م ئاماژەی بۆ رۆمی دەکرد). یەك سکە پارەی ئەو بەرانبەر زیاتر لە هەزار دینارە. هەر کەس بێ بۆ لای من پێویستە خۆی بەوەوە ببەستێتەوە. دەرگایەکی داخراو بوو، وا ئێستا کرایەوە. من توانای ناسینی (م)م نیە. هەر بەڕاستی ئەوەت پێ دەڵێم. ناتوانم م

بناسم. هەموو رۆژێك لە بوون و لە کارەکانیدا شتێك دەدۆزمەوە پێشتر نەمدۆزیوەتەوە. هەوڵ بدە م بناسی. هەوڵ بدە زیاتر بیناسی. تەنیا بە روومەتە جوانەکەی و وشە جوانەکانی قایل مەبە، هەندێ شت زۆر لەوانە گەورەترن، بەدووای ئەو شتانەدا بگەڕێ".

پاشان شەمس بێدەنگ بوو. سوڵتان وەلەد تێگەیشت کە دەبێ ئێستا بەجێیان بێڵێ. کاتێ بەنیاز بوو بچێتە دەرەوە، باوکی پێی وت: "سبەی ژوورەکە بەجێدێڵین".

کاتێ هاوڕێکەمان ئەوەی پێ وتین، نزیکەی دە کەسمان کەوتنە چاودێریکردنی حەوشەکە بۆ بینینی ساتی دەرچوونیان.

بینیم دەرگاکە لەپڕ کرایەوە و دوو پیاوەکە دەرکەوتن، ئەوان هێشتا لەم جیهانەدا ماون. رۆمی، کە روومەتی زەردتر لە جاران دیار بوو، رێگەی بەتیشکی پایزانە و ساردی خۆر دا گەمە بە هەردوو گلێنەی چاوەکانی بکات. شەمس کە بۆ یەکەم جار بوو سەرنجی بدەم —چونکە پێش چوونە خەڵوەتیان لە درزی دەرگاوە بینیبووم— بەتەمەنتر هاتە پێش چاوم لەوەی مەزەندەم دەکرد.

هەمووان لەبەردەم مەولانادا چەمانەوە. رۆمی داوای کرد دەستبەجێ حەمام (گەرماو) ئامادە بکرێ. پاشتر پێی وتم ئەو شتەی لە ماوەی ئەو چل رۆژەدا لە هەر شت زیاتر بێتاقەتی بووە حەمام بووە. بەڵام پێش ئەوەی خۆی بشوات و شەمسەکەی لەگەڵی بێنێ بۆ بوخاری حەمامەکە، دەستی شەمسی گرت و بردی بۆ ژوورەکانی ناوخۆ کە ئافرەتان تێیاندا دەژین و کیرای ژنی لەوێ چاوەڕوانی دەکرد. گۆڕانێکی جەستەیی بەسەردا هاتبوو.

کاتێ لە گەرماو دەرچوو جلێکی جیاوازی لەبەردا بوو. شێوەی مێزەرەکەی گۆڕیبوو، جلێکی تازەی بەرینی خەتخەتی پانی لەبەر کردبوو. رۆمی ئەو رۆمییە نەبوو کە من پێش چل رۆژ دەمناسی.

سوڵتان وەلد، کوڕە راساڵەکە، پاشتر شتێکی لەوبارەوە سەبارەت بە باوکی وت:

شێخی مامۆستا بووەتە قوتابیەکی سەرەتایی،
رۆژانە لەسەر دەستی شەمس فێر ئەبێ.
ئەو شێخەی کۆتا بوو،
ئێستا بووەتە سەرەتا.
ئەو مامۆستایەی ئێمە شوێنی دەکەوتین
بووەتە شوێنکەوتە.

هەموو شت زۆر بەخێرایی گۆڕا. وانەکان وەستان. قوتابخانەکە دەمێکی زۆرە داخراوە. نە وانەیەکی تێدا وتراوەتەوە، نە نوێژێك کراوە. تەنانەت باخچەوانەکەیش چیتر گوێ بە ماڵینی بەفرەکە نەدەدا کە

حەوشەی قوتابخانەکەی پڕ کردبوو و بەرزاییەکەی گەیشتبوە دەروازەی ژووری پۆلەکان، کە ئێستا قفڵ دراون.

سەرجەم کتێبەکان لەبەردەم دەرگای قوتابخانەکەدا فرۆشران. قوتابیانی پێشوو کۆبوونەوە بۆ بردن یان کڕینی دانەیەك لەو کتێبانەی مەولانا بەدەسخەتی خۆی پەراوێزی بۆ نووسیبوون. کۆمەڵێکی تەواو کتێبی زانستیی ئاینیمان لەبەردەمی خۆماندا بینی کە بەناڕێکی هەڵدرابوونەوە: "قوت القلوب" و "احیاء علوم الدین" و "الاغاني" و سەد کتێبیتر. زۆربەی کتێبەکان بە ئامێری مۆسیقی ئاڵوگۆڕ کران. رۆژ بەرۆژ بووین بە خاوەنی نای و تەپڵ و ئامێری عودی ولاّتانی بەڵخ و بوخارا و هیند و میسر.

رۆژ دوای رۆژ کتێبخانەکە بەتاڵ کرایەوە، کە جوانترین ژووری ماڵ بوو ئێمە تێیدا بەتاسەوە کتێبەکانی تایبەت بە پزیشکی و فیقە و فەلەکناسیمان دەخوێندەوە. رەفەی دەستنووسەکان لە گەنجینە بەنرخەکانیان خاڵی کران. مۆمدانەکان کە بۆ روناککردنەوەی مێزی خوێندنەوەکە بەدیواردا هەڵواسرابوون ، لێکرانەوە. پاشان پەنجەرەکانی ژوورەکە کە بە پلێتی تەنکی تەختەیی پەردە کرابوون تا کتێبە دەگمەنەکان لە تیشکی خۆر بپارێزێ، کرانەوە، تا لەکۆتاییدا تیشك لێیانەوە بێتە ژوورەوە. تەنانەت مافورەکان گۆڕان. ئەو مافورەی لە خوریی بەرخی چیاکانی زاگرۆس چنرابوو لوول کرا و بەدیاری نێردرا بۆ والی. کاتێ ژوورەکە لە هەموو ئاسەوارەکانی نووسین بەتاڵ کرا، رۆمی داوای لە شەمس کرد تێیدا بمێنێتەوە. لەچاوی مەولانادا، شەمس بەهاتنە ژوورەوەی، ئەو ژوورەی پڕ کرد، کە لە هەزاران کتێب بەتاڵ کرا.

رۆمی ئێستا رۆژەکانی بە فێربوونی ژەنینی رەبابە بە رێنمایی ژەنیارانی لاو بەسەر دەبات، کە قوتابییە خەماوییە لەخۆڕازییەکانی رابردووی بە شادی و زەوقی ئەوان گۆڕیەوە. ئەو پیاوەی لە نوێژ و رۆژوو و ئامۆژگاریکردندا وچانی نەدەدا، ئەو پیاوەی رۆژەکانی لە بەرەبەیانەوە تا شەو بە نوێژ و نزا و پاڕانەوە لە خوا بەسەر دەبرد، ئەو زانایەی لە زانستەکانی فیقهدا دەریایەك بو و لە خوێندنەوەی تەفسیری تەفسیرەکانی تەفسیرەکانی قورئاندا هەستی بە شەکەتی و وەڕسبوون نەدەکرد ، ئێستا جگە لە سەما و خولانەوە و گۆرانی و پێکەنین هیچیتر نازانێ. ئیتر تەفسیرەکانی پێشینان بەلایەوە جۆرێکن لە رابردوو. ئێستا ئیتر کاتی ئاهەنگ و خۆشییە.

کاتێ ئێوارەیەکیان کیرای هاوسەری پرسیاری لە مێردەکەی کرد، رۆمی باسی ئەم وتوێژەی نێوان ئەو و شەمسی کرد، کە باسی ئەو گۆڕانەی تێدا دەکات بەسەریدا هاتووە:

**شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە**

**گریاو بووم، بەیانی بەیانی پێئەکەنیم**

**دەوڵەتی عیشق هات**

بوومە دەوڵەتێکی نەمر

وتی: "بەڵام نا، تۆ شێت نیت،
شایانی ئەمماڵەیش نیت"،
شێت بووم و
زنجیر کرام.

وتی: "بەڵام نا، تۆ سەرخۆش نیت،
برۆ، تۆ لەم جۆرە نیت"،
چووم و ئێستا سەرخۆش بووم
تا پڕ بووم بە کەیف و خۆشی.

وتی: "بەڵام نا، تۆ مردوو نیت،
لە خۆشیدا نوقم نەبووی،
لەبەردەم روویدا کە ژیان ئەبەخشێ،
بەڵکو من مردووم و چەمامەوە".

وتی: "بەڵێ، تۆ زیرەکی،
بە گومان و بیرکردنەوە مەستی،
بەڵام نەزانی، ترسنۆکی،
لە هەموو شت دابڕاوی".

وتی: "تۆ مۆم و
قیبلەی ئەم کۆمەڵەیت،
من قیبلەی ئەم کۆمەڵەیە نیم و مۆمیش نیم،
بەڵکو وەك دوکەڵ ڕەویمەوە".

وتی: "تۆ شێخ و ئیمامیت،
تۆ یەکەمی لەسەر ئەم ڕێیە،

من نه شێخم و نه ئیمامم،
بەڵكو من خزمەتكارتم".

وتی: "تووك و باڵت هەیە،
نه تووكت ئەدەمێ نه باڵ،
هەڵپەی باڵ و تووكەكەی
بەبێ باڵ و بەبێ تووك پەرت و سەرگەردانی كردم".

كیرا ئەم چیرۆكەی دا بە سوڵتان وەلەد و ئەویش دواتر دای بەمن. منیش یەكسەر زیادم كرد بۆ ئەو تێبینیانەی سەبارەت بە گۆڕانە لەناكاوەكەی مەولانا تۆماریان دەكەم. بەستراوە، مەست، روخاو، دابڕاو، پەرت بەبێ تووك و بەبێ باڵ: ئەمە حاڵی رۆمی بوو پاش بینینی شەمس.

هەروەها سەمای كرد.

جگە لە شەمس، رۆمی تەنیا ژمارەیەكی كەم لە ژەنیارانی دیبوو. كاتێ باشترین ژەنیاری رەبابە لە قۆنیە برایە ئەو ژوورەی "كورسی"یەكەی لێ بوو، رۆمی داوای لێكرد هەر بەرێوە شتێك لەبارەی بیرۆكەی "چاوەڕواننەكراو" بڵێ. ئەوانەی ئامادە بوون ژمارەیەكی كەم بووین، چونكە سوڵتان وەلەد ئێستا رێگەی بەهاتنەژوورەوەی چەند سەردانیكەرێك دا. دەرگا بەڕووی غەریب و فزوڵەكاندا داخرا، هەروەها بەڕووی هەر كەسێكیشدا رەخنە لە رۆمی بگرێ و هەموو شتێك لە ئیسلامدا حەرام بكات. دیارە من و زریانوس و ژمارەیەك كەسیتر ئامادە بووین، لەوانە زانای ئاینی "شەرەف" كە بەئەندازەی ناسراوی بە گاڵتەجاڕیەكەی، بە ناشیرینیەكەیشی ناسراو بوو. هەروەها لەناو ئامادەبوواندا موعین سلێمانیش هەبوو، بەڕێوەبەری قوتابخانەی قورئان لە قۆنیە كە پاشتر بوو بە ئەمیری قۆنیە پێش ئەوەی مەغۆل بیكوژن و بیخۆن.

ژەنیارەكە دەستی بە ژەنین كرد. رۆمی خۆی تەسلیمی دەنگی رەبابەكە كرد. داوای لە زریانوس كرد موقدەكە لابداتە كەنارێكی ژوورەكە، ئەویش لایبرد. ئەنجا بەپێوە وەستا، باڵی گرتم، من حوسامەدین و كەوتە خولانەوە، سمكۆڵانی بە پێكانی لەسەر زەوی دەكرد و هەندێ شیعری بەپێوە وت. نەمزانی چی بكەم، بەپێی توانا هەستم راگرت. هەوڵم دا بەرز ببمەوە بۆ ئەو ئاستەی پێی بەخشیم.

لە دە رۆژی رابردوودا، من و زریانوس بەشەرم و سرتەسرتەوە دەستمان بە سەما كردبوو، بەڵام ئێستا مەولانا خۆی لەبەردەم بەڕێوەبەری قوتابخانە و فەقیە و شەمسدا داوام لێدەكات بەشداریی شادییە نوێیەكەی بكەم. كەوتمە باوەگێجە، سەرەتا بە هۆش و بەزۆرلەخۆكردنەوە، بەزۆر هەوڵم دەدا لە هەنگاوەكەمدا نەكەوم تا بەسەر هاوبەشە گەورەكەمدا نەكەوم. پاشان، هێدی هێدی خۆم شل كرد.

جلەو بۆ عەقڵم شل کرد شەیدا ببێ، خۆمم لە عەقڵە عەقڵانیەکەم ڕزگار کرد تا ببمە هیچ جگە لە بارستەیەك لە گەردیلەی سەماکەر. من بوومە خۆر، هەسارەکان، دەنکۆڵە تۆزێك کە لەناو تیشکی روناکیدا مەلە دەکات، کەعبە، حاجیەکان بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە، تۆپ و ئەو ڕێکتەی تۆپەکە دەیهاوێژێ. بوومە خۆشەویستی و خۆشەویست و خۆشویستراو. کاتژمێرێك، شەوێك، سەدەیەك، ساتێك؟ نازانم چەند کات تێپەڕی. ڕەنگە تەنیا سوڕانەوەیەك بووبێ، کە پاش ماوەیەکی کەم گۆڕا بۆ حاڵەتێك لە بوون لە دەرەوەی خۆم و لە دەرەوەی جیهان، جۆرێك لە خەونی مۆسیقی.

کاتێ بیستنەکە کۆتایی هات، زریانوس و سوڵتان وەلەد —وەك دواتر پێیان وتم— دەستیان گرتووم "تا بمگێڕنەوە" و لەسەر زەوی دایاننیشاندم. مەولانا لێم نزیك بوویەوە و بەسۆزەوە دەستی بە پرچمدا هێنا. پێشتر شتی وای نەکردبوو. کەس نەیدیوە ئەو نەرمییە لەبەردەم کەسانیتردا پیشان بدات. لەپڕ وەستا. نیگاکانی کەوتنە سەر شەمس. هەستامە سەر پێ و چووم لە شوێنێك دابنیشم نزمتر لەو شوێنەی شەمس تێیدا دادەنیشێ، تا خۆم واپیشان بدەم سەرباری ئەو چاکەیەی مەولانای گەورە لەگەڵی کردم پلەنزمترم لە پیاوە پیرە باریکەلەکە، چونکە وەك باسم کرد هێشتا تەمەنم نەگەیشتبوە بیست ساڵ. نەمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە کە هەڵیبژاردوم. دەمویست خۆم لە رق لە شەمس لابدەم، چونکە ئەگەر ئەوم لەدەست دا ڕۆمیش لەدەست دەدەم، ئەوەیش ئەو شتە بوو زیاتر لە هەر شتێکیتر لە دنیادا لێی دەترسام.

کاتێ ژەنیارەکە ئامێرەکەی بە پارچە قوماشێکی لە لۆکە و ئاوریشم چنراودا پێچایەوە، بەڕێوەبەری قوتابخانە پرسیاری لە ڕۆمی کرد لەبارەی ئەوەی دەنگی ئەو ئامێرەی پێ جیا دەکرێتەوە، ڕۆمیش وەڵامی دایەوە "ئەوە جیڕەی دەرگای بەرەو بەهەشت چوونە". بەدەر لە عادەتی خۆی شەرەفی فیقهزان لێی پرسی: "ئێمە هەمان دەنگ دەبیستین کە تۆ دەیبیستی، بەڵام ئێمە وەك تۆ هەست بەبڵندی ناکەین، وەك تۆ کەیف ناکەین، بەو شاگەشکەیە ناگەین تۆ پێی دەگەیت. هۆی چییە؟".

ڕۆمی وەڵامی دایەوە "شەرەف، لەبەرئەوەی ئێمە گوێمان لە دەنگی دەرگای بەهەشتە کاتێ دەکرێتەوە، بەڵام تۆ کاتێ گوێت لێدەبێ کە دادەخرێ".

ڕۆمی هەرگیز لە شەمس جیا نەدەبوویەوە، تەنانەت کاتێ دەچوو بۆ شار، ڕێگەی بە چەند کەسێك لە کەسە دڵسۆزەکان دەدا لەگەڵیان بن، من یەکێك بووم لەو بەشانسانەی ئەو خاترەیان بەدەست هێنابوو. تەنانەت شەمس وردە وردە خۆشیدەویستم، ڕەنگە لەبەرئەوەی لەکاتی ئەنجامدانی سەمای بیستندا بۆ دەرخستنی لەخۆبوردەییم شوێنی خۆمم گۆڕی.

دوای چەند ڕۆژێك مەولانا سەرەنجام مەسەلەی شوێنی شەرەفی لەو دیدارانەی دەبەستران حەل کرد. ئەوە بوو ئەمیر قاراتای بانگهێشتی کردم بۆ ئاهەنگی کردنەوەی ئەو قوتابخانەیەی بەناوی ئەوەوە بوو. لەو ڕۆژەدا، جوانیی تاق تاقە لێکئاڵاوەکان و پایە مەڕمەڕینە هەڵکۆڵراوەکان لەپشت پەردەیەکەوە، کە دەرگای

ئەو قوتابخانەی قورئانەی داپۆشیبوو، کەوتە بەرچاو. پیتەکانی ئایەتە قورئانیەکان وەك جلێکی لە بەرد دروستکراو لەیەکتر ئالأبوون، بەدرێژایی رووکارەکە چنرابوون و لوولیان خواردبوو. کاتێ پەردەکە لادرا، مەولانام دی فرمێسکێکی دەسڕی کە بە چاویدا دەهاتە خوارەوە.

ئەمیر سلاّوی لێکردین و بردینی بۆ ژوورێکی گەورە کە گومەزێکی بەسەرەوە بوو ئایەتی قورئان و ناوی یەکەمی پێغەمبەران و ناوی خەلیفەی بەخەتێکی جوانی کوفی بەدەوردا نەخشێنرابوو. ئەمیر چەمیەوە، بەئاماژەیەکی دۆستانە کە ئاماژە بوو بۆ فراوانیی ژوورەکە داوای لێکردین دابنیشین. کاتێ لەسەر زەوی دانیشتم، ئەو هەستەم لەلا دروست بوو کە چوومەتە قووڵایی ئۆقیانووس، چونکە کاشییە شین و فەیروزییەکە کە دیوارەکانی داپۆشیبوو دەریا و جولّەی بێ وەستانی شەپۆلەکانی بیر دەخستەوە. قسە هاتە سەر شوێنی شەرەف، ئاخۆ پێویستە لەکوێ بێ؟ لە چ لایەکەوە؟ هەموو ئاوڕیان دایەوە بۆ لای رۆمی کە وەڵامی دایەوە "بەلای زانایانەوە، لوتکە چەقی مەجلیسە، بەڵام بەلای سۆفیەکانەوە لوتکە سووچ (گۆشە)ی ژوورە. لە ئاینی عاشقاندا، لوتکە نزیکبوونە لە مەحبوب (خۆشەویست)".

هەستا و چوو لەتەنیشت شەمس دانیشت کە سووچی ژوورەکەی بۆ دانیشت هەڵبژاردبوو، واتە خاکیترین شوێن و لە هەموو شوێنەکان نزمتر، ئەو شوێنەی خەڵك پێڵاوەکانیانی تێدا بەجێدێڵن.

سەرجەم ئامادەبووان، فیقهزانان، قازیان، سیاسەتمەداران، زانایان و فەیلەسوفان لەو هەڵبژاردنەی رۆمی بۆ شوێنی دانیشتنی حەپەسان. بەم جولّەیە بەئاشکرا وابەستەیی خۆی بە پیاوە تەورێزییەکە ئاشکرا کرد. تا ئەو کاتە تەنیا هەندێ لەو مورید و میوانانەی سوڵتان وەلەد هەڵیبژاردبوون لە رادەی وابەستەیی مەلاونا بە شەمس گەیشتبوون. لە ئێستا بەدواوە، هەموو شار ئەو شتە دەزانن.

لە بۆنەیەکیتردا، روومان کردە ئەو خانەقایەی وەزیر نەصر بۆ رێزنان لە هاوڵاتیەکی دیار کە بە شێخ دامەزرابوو، دروستی کردبوو. لەکاتێکدا زانایان و مورشیدان و سۆفیان و ئەمیران و خانەدانان بێکۆتا دەربارەی تیۆرەکان و مەسەلە فیقهیەکان قسەیان دەکرد، شەمس یەك وشەی لەزار دەرنەچوو و وەك گەنجینەیەك لە سووچێکدا بێدەنگ و بەبێ جولّە دانیشتبوو. لەناکاو هەستایە سەر پێ و بەتووڕەیی هاواری کرد "تاکەی سواری ئەسپی بێ زین دەبن و بە دەوروخولی پیاواندا دێن؟ تاکەی لە رۆیشتندا بە گۆچانی کەسانیتر دەڕۆن بەڕێوە؟ ئەو شتانەی ئێوە باسیان دەکەن لە قسە و کردارەکانی پێغەمبەر و تەفسیرەکان و فیقه کەسانێك نووسیونیان هی زەمەنێکیترن! ئێوە پیاوانی ئەمڕۆن! ئەی کوان نهێنیەکانتان؟ کوا قسەی ئێوە؟".

ئەم قسانە بەلای منەوە رۆشنگەرانە بوون. سەرەنجام وردە وردە تێدەگەیشتم مانای چییە ئەوەی مەولانا دەیوت: "شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە". لەکۆتاییدا تێگەیشتم لەبەرچی رۆمی، لەسەر

داوای شەمس، وازی لە هەموو خوێندنەوەیەك هێنا بە کارەکانی شاعیرە عەرەبە بەناوبانگەکە و تەنانەت بە کارەکانی باوکیشیەوە. ئیتر ئێستا وا خۆی بەبێ یارمەتی کەسانیتر دەڕوات.

"شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە" لەو رۆژە یان رۆژێکیتردا بوو گوێم لە شەمس بوو پێی دەوت: "هێواش هێواش. لە عاممەی خەڵك نامۆبە، چونکە حەقیقەت نە یاوەری عاممەیە و نە تایبەتە بەوان. نازانم دەکرێ مرۆڤ چی لێ بچنێتەوە. تۆ تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرانت هەیە، تۆ لەسەر رێنمایی ئەوان دەڕۆی. پێغەمبەران زۆر پەیوەندییان بە خەڵکانیترەوە نیە. ئەوان سەر بە حەقیقەتن، تەنانەت ئەگەر عاممە لە رواڵەتدا بەدەوریشیاندا ئەڵقە ببەستن".

لەو رۆژەدا، یان لە رۆژێکیتردا بوو، بیرم نایەت، شەمس لە مەولانای پرسی: "ئەگەر منت دی، بۆچی خۆت دەبینی؟ ئەگەر لەبارەی من قسەت کرد، بۆچی قسە لەبارەی خۆت ئەکەی؟ ئەگەر منت ناسی و بینی، ئیتر بۆچی باسی نەخۆشی ئەکەی؟ ئەگەر لەگەڵ من بی، ئیتر بۆچی لەگەڵ خۆتی؟ ئەگەر هاوڕێی من بی، ئیتر چۆن تۆ هاوڕێی خۆتی؟".

رۆمی بەبێ دوودڵی ملکەچی هەردوو داواکەی شەمس بوو: لە عاممەی خەڵك و لە خۆیشی جیا بووەوە.

ئەگەرچی کوڕەکەی رۆمی زۆر لە ژمارەی ئەو کەسانەی کەم کردەوە کە سەردانی باوکی دەکەن لە ماڵەکەیدا، وردە وردە دەکەوتە بەر دوژمنایەتی و رەفزی کەسانی موحافیزەکار کاتێ ماڵی بەجێدەهێشت. وەڵامی مەولانا بەپێی جیاوازیی ئەوانەی زەمیان دەکرد جیاواز بوو. هەندێکیان بە بەرپەرچدانەوەی سووکایەتیەکان رووبەڕوویان دەبوویەوە، زۆر جاریش هەوڵی دەدا کەسانیتر هێور بکاتەوە و بەرپەرچی لێکدانەوە نەرۆکەکانیانی دەدایەوە، یان هەندێ جار بێدەنگ دەبوو.

رۆژێکیان لەگەڵی چووم بۆ ئاهەنگی سوننەتکردنی کوڕی والی. مێردمنداڵەکە کە هێشتا تەمەنی لە حەوت ساڵ تێنەپەڕیبوو جلێکی لە قوماشی گرانبەها لەبەر بوو. لەسەر شەرواڵێکی لە ئاوریشمی ئەرخەوانی دروستکراو، چاکەتێکی خەتخەتینی رەنگ فەیروزی لەبەر کردبوو، کە لە کەمەردا بە پشتوێنێکی قوماشی پان و چنراو دادەخرا، خەنجەرێکی پێدا هەڵواسرابوو دەسکەکەی لە ئاڵتونی نەخشبەند بوو، ئەوە تاکە شتی بینراو بوو. مەچەکە سپییە بچوکەکەی بە بازنی زمروت رازێنرابوویەوە، گوارەیەك بە نەرمەی گوێکانیدا شۆڕ بووبوویەوە، قژی بە سەرپۆشێك لە ساتانی زێڕبەند داپۆشرابوو، گەوهەرێکی شێوە هێلکەیی لەسەر تەوێڵی دەبریسکایەوە، چاوەکانی بە کل هێڵ کرابوون، لێوەکانی بە رەنگێکی سووری کاڵ بۆیە کرابوون، لەسەر مافورێك دانیشتبوو کە درەختی ژیانی لەسەر نەخشێنرابوو، پاڵی بە دۆشەکێکەوە دابوو کە سێ هێندەی ورکی گەورە بوو. پەنجەرەیەکی گەورەی کراوە لەپشتیەوە بوو بەسەر هەندێ ماڵی کەشخەدا دەیڕوانی، کە گومەزە خەزەفییە شینەکەی قوتابخانەی قاراتای قورئانی و هەروەها مزگەوتی سوڵتان کەیقوبادی لێوە دیار بوو، هەروەها کۆمەڵێ داری سنەوبەر لە دێری ئەفلاتونی مەسیحی کە مەولانا

بۆ ماوەی چل ڕۆژ خەڵوەتی تێدا کێشا. لەدوورەوە ئەو دەشتە پان و پۆڕە دەبینم کە بەدرێژایی سەدەکان شاڵاوەکانی سیمری و لیدی و فارس و یۆنانی و ڕۆمان و خاچپەرستان و لەدووایشدا مەغۆلەکانی بەخۆوە دیوە.

بۆ ساتێك وام بەخەیاڵدا هات ڕەنگی ئاسمان، کە ئاوێتەیەکە لە هەردوو ڕەنگی پەمەیی و شین، جلەکانی ئەو کوڕە پێچەوانە دەکاتەوە. ئەم بیرۆکەیە بیری بردم بۆ لای پاشای پاشاکانی وڵاتی فارس، پادشاه، کە جلوبەرگ و کۆشکەکان و ئەسپەکان و ژنەکان و گەشتەکانی بەپێی ڕەنگی ئاسمان هەڵدەبژارد. والیش بە مێزەرە و نیشانەکانی و پۆشاکە ئاوریشمییە گرانبەهاکانی، بەنەرمی هاوئاهەنگیی ژوورەکە و هەورەکانی سەر شاری قۆنیە و جلوبەرگی کوڕەکەی پێچەوانەوە دەکردەوە. زنجیرە ئاڵتونیەکان یەخە و قەراغی عەباکەیان دەڕازاندەوە، تەزبیحێکی یاقوتیشی بەدەستەوە بوو.

پیاوماقوڵانی قەوم لەدەوری والی ئەڵقەیان بەست، لەناویاندا پیاوێکی ناسراوی ئاینی بوو ناوەکەی ناهێنم. ئەگەرچی ڕێزی مەولانای زۆر دەگرت، هەندێ گومانی لەلا دروست بووبوو و سەرنجێکی زۆری لەسەر هەڵسوکەوتەکانی ئەم دووایییەی هەبوو. لە ساتێکی پشێویدا وتیان بەنزیکترین هاوڕێکانی وتوە "بۆ دەبێ پیاوێکی خوێندەواری ئاوا، پاشایەکی ئاوا، زانایەکی ئاینی ئاوا، کۆڕی مۆسیقا و بیستن ساز بکات؟ بۆچی شتێك دەکات ئاین حەرامی کردوە؟".

کاتێ ئەمە گەیشتەوە گوێی ڕۆمی کە بەدەگمەن پاساوی ڕەفتارەکانی بۆ کەس دەهێنایەوە، چاوەڕوانی کرد تا کاتی لەباری خۆی هات تا زاناکە دڵنیا بکات. خەتەنەکەری منداڵەکە گەیشت. والی منداڵەکەی هەڵگرت و لەسەر کورسیەکی نزم داینا. هەر هێندەی نوکی چەقۆکەی دەرهێنا خەتەنەکردنەکە تەواو بوو. پاشان سەرتاشەکە برینەکەی بە خۆڵەمێشی تەختەی بێژراو کەوی کرد. هاوار هاوار و زریکەی منداڵەکە بەسەر پیرۆزباییکردنی گەورەکاندا زاڵ بوو، "بسم الله" و ئەو دەنگەی جاڕیدا "ئێستا تۆ بوویتە موسڵمانێکی ڕاستەقینە"، لە دەرەوەیش دەنگی تەپڵێدان و ڕاگەیاندنی گەیشتنی سامەپێکەری ورچەکان و پەهلەوانەکان بیسترا، خزمەتکارانیش سینی گەورەی پڕ شیرینی و شەربەتی جۆراوجۆریان هێنا. مەولانا لەو منداڵە نزیك بووەوە کە ئێستا پەشتەماڵێکی لەبەر بوو و ئایەتێکی قورئانی بەگوێیدا چرپاند. بەڵام بەر لەوەی والی بڕوات مەولانا چووە لای پیاوە ئاینیەکە و پێی وت: "یا شێخ! مەسەلەیەکی ئاینی هەیە دەزانم باش خوێندوتە، ئەویش موباحکردنی ئەوەیە خوا خواردنی حەرام کردوە بۆ برسی و تینوو و گیانکەنشت. ئەم کارە کە ئاین پاساوی دەدات و زانایان لەسەری کۆکن توانای مانەوە بەمرۆڤ دەبەخشن. بەڵام سەبارەت بەهەندێ زانا، حاڵەتێکی هاوشێوەی برسێتی و تینوێتی هەیە کە بەبێ سازکردنی کۆڕی بیستن و سەما بەنەشوە و گوێگرتن بۆ دەنگی خۆش چارەسەر نابن. پاشان هۆڵەکەی بەجێهێشت.

بڕوانە، ئەو زیندووە.

# ئاوی تینووان، نانی برسییان

لەو ناوانەیتر لە شەمس نران "خۆری نیوە شەو"، "ئاوی تینووان"، "نانی برسییان" و "شیفادەری نەخۆشان". لەکاتی ئاهەنگی کردنەوەی قوتابخانەی قاراتای-یەوە، کاتێ مەولانا لە تەنیشتی دانیشت و لەبەردەم خەڵکی قۆنیە لەبارەیەوە قسەی کرد، هەموو -نووسەران و پیشەسازان و پزیشکان و سەربازان و درومانان و شازادە خاتونان و شاعیران و ژنە دۆستەکان- هاتن تا بەچاوی خۆیان ئەو پەیوەندییە لە راڤە یاخییەی نێوان رۆمی و ئەو پیرە دەروێشە ببینن.

شەمس لەسەر چەند پشتیەك لەبەردەم دەرگای ئەو ژوورەی مەولانای تێدا بوو بە جیچکانەوە دادەنیشت و هەرکەس لەبارەی مەولاناوە پرسیار بکردایە پێی دەوت: "چ دیاری و بەخشیشێك دەدەی تا پیشانتی بدەم؟".

"چیت هێناوە؟ چی دەدەیت بەرانبەر بینینی؟".

چەندین کەس لەپێناو ئەوەدا مەولانا ببینن پارە و دیارییان پێشکەش کرد. بەڵام شەمس تا دەهات داوای زیاتر و زیاتری دەکرد. خۆشەویستەکەی بە زیادکردنی ئاشکرا دەفرۆشت. رۆمی بۆ ئەو کەسە بوو زیاتر بدات. وادیار بوو مەولانا ئەوەی پێ باش بوو، چونکە کاتێ عەلای کوڕی دووەمی لەو رەفتارەی شەمس کە نەیدەتوانی لێی تێبگات تووڕە بوو، قاقا پێکەنی.

رۆژێکیان، کاتێ رۆمی لە ژوورەکەدا بوو، شەمس لەبەردەم دەرگاکەیدا وەستابوو و سەودای لەتەك سەردانیکەرێك دەکرد کە دەیویست رۆمی ببینێ. کاتێ کابرا بینی شەمس زۆر زیادەڕەوی کرد لە داوادا، تووڕە بوو و لێی پرسی "ئەی تۆ، چیت هێناوە کە داوای ئەو هەمووە دەکەی؟".

شەمس لەو سکە زیوییانە ورد بوویەوە کە سەردانیکەرەکە پێشکەشی کرد و بەدەم ژماردنی ئەو پارەیەی ئەو رۆژە خڕی کردبووەوە وەڵامی دایەوە: "خۆمم هێناوە. بۆ رێگەکەی، سەرم پێشکەش کردوە".

هەندێ لە سەردانیکەران هەر بۆ بینینی مەولانا نەدەهاتن، بەڵکو، بەپاڵنەری فزوڵ بۆ بینینی شەمسیش. رۆژێکیان دوو بازرگانی زەنگین هاتن بۆ لام، کە خۆیانیان بەفەروو پێچابوویەوە، بە شیلان داپۆشرابوون، عەترێکی زۆریان لە خۆیان دابوو، بەڕادەیەك هەر بجوڵانایە، بۆنێکیان لێدەهات وەك ئەوەی شوشەیەك گوڵاویان بەخۆیاندا رشتبێ. وتیان دەیانەوێ "ئاوی تینووان" و "نانی برسییان" ببینن، شەمسی تەورێزی خۆی. هەر کە ویستم یاوەرییان بکەم بۆ ئەو هۆڵەی پێشتر کتێبخانەی مەولانا بوو و ئێستا شەمسی تێدا دەمایەوە، لە دەرگاکەوە بەدەنگی بەرز هاواری کرد وتی: "با سەرەتا پارە بدەن".

سەریان سوڕما، دوو پیاوەکە وایانزانی گاڵتەیان لەگەڵ دەکات. پێویستە بڕێك پارە بدەن تا شەمسی تەورێزی ببینن؟ هەردەبوو ئەوە بکەن. کاتێ بەشەرمەوە داوای بڕێکی کەم پارەم لێکردن، پێیان وتم تۆ قۆڵبڕی.

شەمس کە بەژن درێژتر و جەستە لاوازتر دەهاتە پێش چاو وەستا و بە نەبرەیەکی بێلایەنانە بڕەکەی کردە دوو هێندە. ئەوانیش بێشەرمانە جوێنبارانیان کرد. لە ساتێکدا "نانی برسییان" بوو بە "پیس" و "زبڵ" و "ریسوا". شەمس نوشتایەوە و نەعلەکانی داکەند و تێی گرتن. ئەوانیش یەکسەر رایانکرد و هەڵاتن. کاتێ دیار نەمان، شەمس بەدەنگێکی هێمن پێی وتم: "ئەگەر ئەو پیاوانە تاقی نەکەمەوە، حەقیقەتی خۆیان نازانن. بینیت چۆن لافی ئەوەیان لێدەدا ئەهلی ئیمان و تەقوان؟ بەڵام هەر هێندەی هەوڵم دا —بەهەندێ نەرمی— تاقییان بکەمەوە، هێزی ئیمانیانت بینی؟ زانیت ئەو تاقیکردنەوە چی دەرخست، چۆن لەبەرچاوتا ئاشکرای کردن؟ داوای درهەمێك لەو پیاوە بکە کە لافی هاوڕێیەتیت لێدەدات یەکسەر عەقڵی دەبێتە هەڵم و هەناسەی لەبەر دەبڕێ، سەری بادەدا و لاقەکانی خاو دەبنەوە. گژبەریم کردن تا بچوکی و پڕوپوچییان ببینن".

سەرباری ئەمە، داواکردنی بڕێك پارە لەپێناو بینینی شەمس بۆ من ئەرکێکی قورس بوو، بەڵام پێویست بوو ئەو کارە بکەم، لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتیی دیاریکردنی بڕی پارەی دیدارەکە و دانی ئەو بڕە پارەیە بەخێزانی مەولانا و نەدارانی خستە ئەستۆم. بڕیارم دا چاودێری بکەم بزانم شەمس چۆن چۆنی ئەو کارە دەکات کاتێ مامەڵە لەسەر بڕە پارەیەك لەپێناو دیداری رۆمی دەکات وەك ئەوەی ئەو کارە شتێکی زۆر سروشتی بێ، بەبێ ئەوەی هەست بە هیچ شەرم و شپرزەبوونێك بکات. راستیەکەی من میزاج و راشکاوی و چاوقایمیی ئەوم نەبوو. کاتێ "سەردانیکەر"ەکە راڕا دەبوو ئەو زیاتر لە تەشقەڵەکردن بەیاوەرەکانی ئەو کەسەدا رۆدەچوو، زبر و رەق دەبوو —لەبەرچاوی مەولانا کە پێی سەرسام بوو— لەکاتێکدا من هەوڵم دەدا میوانەکانی هێور بکەمەوە و کێشەکە بەهێمنی چارەسەر بکەم. بەڵام لەرێی لێکدانەوەکانی هاوڕێیانەوە وردە وردە وام لێهات ئەو پارانەم بەتاقیکردنەوەیەکی سەرەتایی دادەنا، کە ئامانجی باشکردنی دەرکی من و رزگاربوون لە شتە باوەکان و لەقاندنی سیستمە ریشە داکوتاوەکەیە.

یەکەمین سەردانیکەر بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە دەرگاکەوە هاتە ژورەوە. یەکێك لە یاریدەدەرانی سوڵتان بوو، دوو شمشێری قەبارە جیاوازی پێبوو کە ناوی سوڵتانی ئێستا —خوا سێبەری بەسەر سەرمانەوە بەردەوامکا—و باوکی و باپیری و دامەزرێنەری خێزانەکە لەسەر دەسکەکەیان هەڵکۆڵرابوو. پێڵاوە درێژەکانی بەڕادەیەك دەبریسکانەوە کە دەمتوانی وێنەی ریشم لەسەر چەرمە رەشەکەی ببینم. پێڵاوەکەی دەنگێکی بیستراوی دەردەکرد کە خۆنواندن و لوتبەرزی دەگەیاند بەمە لە دەنگی ئەسپایی و نزمی نەعلە تەختەکانی خەڵکە ئاساییەکەوە جیا دەبوویەوە. ئەوە هەوڵی من بوو و کەسێکی ئاساییش

نەبوو. دەمزانی شەمس لەپشت دەرگای ژوورەکەوە کە جاران کتێبخانە بوو چاودێری و گوێی شل دەکرد. بەهەڵەداوان چووم بۆ پێشوازی میوانەکە دوای موجامەلە باوەکان "چاومان روون بە دیدارت" و کۆمەڵێ پرسیاری بێکۆتا دەربارەی تەندروستیی سوڵتان و وەزیرەکان و ئەمیر و میوانەکەمان و خێزانەکەی، بەشێوەیەکی نەزانانە و بەپەلە داوای ئەو برە پارەیەم کرد کە دەبوو بیدات: دە هەزار درهەم. بەڵام شەمس خزمەتکارێکی نارد و چرپاندی بەگوێمدا: داوای چل هەزار درهەمی لێبکە.

برێکی زۆرە. بەپەشۆکاوی تەماشای ئەوسەری کتێبخانەکەم کرد کە شەمس لێیەوە چاودێری دەکردم و ئاماژەم دایە کە ئەوە بە من ناکرێ. بۆ پیشاندانی رازینەبوونی توند کۆکی. داوام لە یاریدەدەری سوڵتان کرد ساتێ چاوەڕی بکات و چوومە ژورەکەی شەمس.

پێم وت: "گەورەم، هیچ کەسێك چەندە دەوڵەمەند بێ ئەو برە پارەیە نادات لەپێناو دیدارێکدا کە لە چەند خولەکێك تێناپەڕێ. ئایا دەزانی ئەو کەسە دەتوانێ بەبڕی چل هەزار درهەم قوتابخانەیەکی تەواو دروست بکات و گڕوگیا لە بێستانێکدا نەهێڵێ و یاریگایەکیش دابمەزرێنێ؟".

شەمس بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێك بدات وەڵامی دایەوە "منیش لەبەر ئەوە داوای ئەو برە زۆرە ئەکەم".

"نایدات. خۆ گەمژە نیە. ئەو وای پێ باش دەبێ خۆی قوتابخانەکە نوێ بکاتەوە، بەناوی خۆی و لەپێناو بەدیهێنانی هەیبەت و پێگەی خۆیدا". شەمس ساتێك بیری کردەوە پاشان هەندێ دابەزی و وتی: "سی هەزار. درهەمێك کەمتر نابێ".

گەڕامەوە بۆ لای سەردانیکەرەکە و پێم وت: "بەسی هەزار درهەم دەکرێ رۆحت بەبینینی شەمس زاخاو بدەیت، بەڵام تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت".

سەردانیکەرەکە رازی بوو. یاوەریم کرد بۆ ژوورەکەی شەمس و چاوەڕوانم کرد تا کۆتایی دیدارەکە کە هەستم کرد بەمزوانە تەواو دەبێ، چونکە شەمس کاتێکی زۆری بەدەمەتەقە و لێکدانەوەی دوورودرێژەوە نەدەکوشت. کاتێ دەینووسی دەربڕین و رستەکانی کورت و پوخت بوون و هەندێ جار من و کەسانیتر لێیان نەدەگەیشتین. ساتێك چاوم نوقاند. کاتێك گوێم لە دەنگی پاژنەی پێڵاوەکانی بوو کە لەسەر کاشیی حەوشەکە تەقەی دەهات زانیم دیدارەکە کۆتایی هات. کاتێ رۆیشت هەستم کرد سەردانیکەرەکە گۆڕاوە. مەست و شاگەشکە بووبوو. هەر کە بینیمی کیسێکیتر پارەی دامێ کە دەهەزار درهەم بوو. بەلای ئەوەوە دیدارەکەی شەمس لەوە زیاتری دەهێنا. وا هاتە پێش چاوم ئەو دیدارە شتێك نەبووە بەپارە مەزەندە بکرێ.

بەدوای شەمسدا گەڕام تا لێی بپرسم چۆن پارەکە دابەش بکەم. ئەویش پێی وتم بەهۆی ڕاڕایی تۆوە خۆمان خەڵەتاند ئەگینا دەکرا داوای پارەی زیاتری لێبکەم. لەو کاتەوە ئیتر هیچ کێشەم نەبوو لە داواکردنی پارەی زیاتر، ئیتر ئەستێرەکەمانم پیشانی ئەو کەسە دەدا کە پارەی زیاتر بدات.

وەك تەنێکی ئاسمانی کە بەدەوری خۆردا بسوڕێتەوە، من و بەڕێوەبەری قوتابخانەی قورئان کە پاشتر دەبێتە ئەمیری قۆنیە و غوردجی هاوسەری، هەروەها سوڵتان وەلەد و زریانوس و سەلاحی زێڕنگەر (پاشتر باسی دەکەم) بەدەوری مەولانا و شەمسدا کێش بووین. بەتێپەڕینی کات هەستم کرد لەچەق، لەدڵی کاکێشانەکەمان نزیکترم.

وردە وردە عەلا، کوڕی دووەمی ڕۆمی، لە بەشداریکردن لە سەمای بیستن دوور دەکەوتەوە، نەك هەر ڕقی لە شەمس دەبوو، بەڵکو وای لێهات ڕقی لە سەرجەم دەستوپێوەندەکەی باوکی بوو. هەرچی خۆشی و بەختەوەری بەئێمە ببەخشیایە ئەو پێی قەڵس دەبوو. نەك هەر ڕازی نەبوو لە سەماکردن لەگەڵمان بەشدار بێ، بەڵکو سەماکردنی بەنموونەیەك لەسەر بێئەقڵی و هەڵەشەیی دادەنا، هەروەها جوێنی بە ژەنیاران دەدا و نەفرەتی لێ دەکردن، لەبەرئەوەی، یان باوەڕی وابوو، دەنگی ئامێرەکانیان دەنگی بانگدەر و بانگ و دەنگدانەوەی وشە پیرۆزەکانی دەشاردەوە. لەکاتێکدا ئەو هەستی دەکرد هەڵوێستەکەی شەمس لە پارە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر چڵێسیی ئەو پیاوە، ئێمە بەپێچەوانەوە پێی سەرسام بووین و وردە وردە تێدەگەیشتین ئەوە بەڵگەیە لەسەر تایبەتمەندیی کەسایەتی ئەو کە خاڵییە لە خێر و شەڕ. عەلا بۆ ئەوەی لایەنگر بۆ خۆی بدۆزێتەوە چووە لای هەندێ لەو پیاوانە کە ڕۆمی پشتی تێکردبوون و چیتر ئامادەی وانەکانی نەدەبوون. کوڕەکەی ڕۆمی لەگەڵ ئەوانەدا ئاسوودە بوو، ڕەنگە هانیش درابێ بۆ شکاندنەوە و سەرکۆنەکردنی شەمس بە بەرچاوی خەڵکەوە. کەوتە ئەوەی لە قوتابخانەکانی قورئان و مزگەوتەکان و بازاڕ و گەرماوەکان و شوێنانی تریش دەیبینین، ئەویش لەپێناو ناوزڕاندنی ئەو کەسەی ناوی نابوو "پیاوی ڕیسوا"، کە هەمان ئەو پیاوە بوو باوکی لەبارەیەوە دەیوت هەناسەکانی مەسیحی لێبەرز دەبێتەوە.

لەو دیدارانەدا دەنگیان دژی شەمس بەرز بوویەوە:

بۆچی مەولانا پشتی کردە ئێمە و ڕێگەی بەشەمس دا گومڕای بکات؟ هەموومان سەر بە بنەماڵەی ناسراوین و لەخێزانی خانەدانەوە هاتووین، لەمنداڵیمانەوە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێین. ئێمە خزمەتکارانی ڕاستەقینەی دەنگی مەولانایین و لە هەموو شوێنکەوتوانی ڕاستگۆترین. بینیمان هەندێ موعجیزە دەنوێنێ کەسی تر نەیبینون، هەندێ وشەی حیکمەتمان بیست کەسیتر جگە لە ئێمە نەیبیستوون. وەك هەڵۆ نێچیرمان ڕاو کرد و پێشکەشیمان کرد، ناوبانگیمان لە سەرانسەری دنیادا بڵاو کردەوە، دۆستانیمان خۆشویست و قسەی دوژمنانیمان پوچاندەوە، کەچی ئێستا لە بینینی ڕوخسار و بیستنی دەنگی بێوەری

کراین، هەموو ئەوە بەهۆی شەمسەوە بوو. ئەو سیحرە چییە ئەو پیرە پیاوە بێ ئەسڵ و فەسڵە هەیەتی کە بووەتە سەرچاوەی نەگبەتی بۆ ئێمە و بۆ لەخشتەبردنی گەورەمان بەکاری دێنێ؟

پاشان عەلا بەڵگەنامەیەکی نەناسراوی لە شارەکەدا بڵاو کردەوە، تێیدا دەڵێ: "چۆن دەکرێ دوو باڵندە کە لە هەمان جۆر نین پێکەوە بفڕن و بخۆن؟" دیارە مەبەستی لەو دوو باڵندە نەگونجاوە رۆمی و شەمس بووە.

زۆر بەزەحمەت دانەیەکی ئەو بەڵگەنامەیەم دەستخست کە دەڵێ:

**یەکێکیان بازەو بەئاسماندا ئەفڕێ**

**ئەوی تریان کوندە پەپویەکە لەسەر زەوی**

**یەکێکیان خۆری ئاسمانە**

**ئەوی تریان شەمشەمە کوێرەیەکی پلیشاو**

**یەکێکیان نوورێکی بێگەردە**

**ئەوی تریان سواڵکەرێکی کوێرە لەم دەرگا بۆ ئەو دەرگا ئەسوڕێتەوە**

**یەکێکیان مانگە لە پاڵ سورەیادا**

**ئەوی تریان کرمێکە لەقوڕدا نابینرێ**

**یەکێکیان روخساری یوسف و هەناسەهەڵکێشانی مەسیحی هەیە**

**ئەویتریان گورگە، گوێدرێژە و زەنگی هەیە**

**یەکێکیان بەرەو نادیار ئەفڕێ**

**ئەویتریان وەك سەگ لەناو کادا پاڵ ئەکەوێ.**

دوای ئەوەی بەڵگەنامەکەم خوێندەوە لە باوەڵێکدا لە ماڵەکەی خۆم لە فالیراس شاردمەوە تا نەکەوێتە دەستی بە مرەکەب و زەعفەران پیس بووی شەمس. ئەوەتا ئێستا لەبەرچاوانمە، لە زۆر خوێندنەوەی شڕ و وڕ بووە. کاغەزەکە زەرد بووە، بەڵام وشەکان هێشتا دەبنە مایەی رق و کینەی کوڕێکی خراپ و تێنەگەیشتنی. خستمەوە ناو باوەڵەکە و هەوڵمدا بیر لە نائاسوودەیی سوڵتان وەلەد بکەمەوە بە دەمارگیریی نائومێدییەبەخشان. لەترسی ئەوەی کار لە کار بترازێ و شتەکان لە جڵەو دەربچن برۆکانی تێکنا کە لەسەر لوتیدا بەیەك دەگەن، برۆکانی دوو تیری ئامادە بوون بۆ دەرچوون و ژمارە حەوتیان دروست کردبوو. وتی: "هەموویان تینووی خوێنی شەمسن. هەر کە چاویان بکەوێتە سەری بەپەلە دەست لەسەر

مشتەی خەنجەرەکانیان دادەنێن و پڕ جوێنی دەکەن. هەموو دەیانویست یان شارەکە بەجێبێڵێ یان بمرێ".

نەمویست ئەوە بۆ سوڵتان وەلەد باس بکەم، بەڵام دەزانم عەلای برای لەو هەرایەی رووی داوە بێئاگا نەبوو، رۆژێك تێنەپەڕیوە هەوڵ نەدات لەڕێی بڵاوکردنەوەی قسە و قسەڵۆك سەبارەت بە شەمس و رۆمی تووڕەیی بێزاران زیاتر بکات.

رۆژێکیان عەلام لە بازاڕی ئاسنگەران بینی، لە دوکانی چەقۆسازێکی کارامەدا دانیشتبوو، کە یەکێك بوو لە موریدانی پێشووی مەولانا، لەبەردەم ریزێك چەقۆ و شفرە و مقەسدا. لە سوچێکدا لە بەشی بەرانبەری کۆڵانەکەدا خۆم حەشاردا بەشێوەیەك بتوانم گوێم لە قسەکانیان بێ، کە لەوێ کرێکارێك ئەسپێکی دەلاواندەوە و بەپۆزەوە دەیوت "سێ سەد و سی نەخۆشی شارەزایە کە تووشی ئەسپ دەبن". بۆ بزواندنی غیرەی پیشەوەرەکە عەلا، وەك منداڵێك یاریەکەی لێ زەوت کرابێ، پێی وت: "جارێکیان باوکم مەدحی شەمسی کرد –ئیشەڵا هەزار سەگ.... بە ریشیدا دەکەن– منیش رامکرد تا ئەم وشانە بۆ کەسی مەدحکراو بگێڕمەوە. بەڵام بەساردیەك وەڵامی دامەوە، من هەزار هێندە لەوە زیاترم".

کاتێ ئەوەم بیست، زانیم عەلا مانای وەڵامەکەی شەمسی شێواندوە کە بەوردی و بەتەواوی نەیگواستۆتەوە، چونکە شەمس وتبوی: "سوێند بەخوا، سوێند بەخوا من هیچ نیم جگە لە دڵۆپێك لە ئۆقیانوسی ویقار و زانستی باوکتدا. بەڵام من هەزار هێندە لەوەی وتوێتی زیاترم".

جا بۆ ئەوەی زیاتر رقی چەقۆسازەکە بجوێنێ، عەلا وتی: "باوکمم دۆزیەوە و بۆم گێڕایەوە هاوڕێکەی چی پێ وتوە، ئەویش وتی: بەڵێ، شەمس مەزنی خۆی ئاشکرا کرد و ئەو سەدقات زیاترە لەوەی ئیددیعای دەکات".

لەڕێی هەردوو لاقی پشتەوەی ئەسپەکە کە ناڵسازەکە ناڵی بۆ دادەنان، تالاوی هەموو دنیام لەڕووی پیشەوەرەکەدا بینی، هەروەها دیم چەقۆیەکی گرتوە و دەمەکەی تیژ دەکرد.

عەلا وتی: "بەشێوەیەکی نائاسایی، وا رێکەوت باوکم لەنێو ژمارەیەك لە هاوڕێکانی پێشووی بوو، یەکێکیان پێشنیاری کرد رابمێنن و سەریان لەسەر ئەژنۆیان دابنێن. دوای چەند ساتێك، یەکێکیان هەستا و وتی: "دەتوانم لوتکەی ئاسمانەکان ببینم"، یەکێکیتر وتی: "بینینی من لە لوتکەی ئاسمانەکان و فەزا تێئەپەڕێ. من لە بۆشایی گەردوون رائەمێنم". هاوڕێیەکیتر وتی "من پشت هەردوو بورجی گا و نەهەنگ ئەبینم! هەروەها ئەو فریشتانە ئەبینم کە پاسەوانییان دەکەن". کاتێ گوێی لەوە بوو "پیاوە ریسوا" بێ باوك و دایکەکە –هەی هەزار...ی کەر بە....ی– بەدەم تەماشاکردنی راستەوخۆی دەموچاوی باوکمەوە وەڵامی دایەوە و هەوڵیدا گاڵتە بە دیتنە ئاسمانییە غەریبەکان بکات کە هاوڕێکانمان دەیانبین و وتی: "بەڵام من، لە هەر شتێکدا کە ئەیبینم، جگە لە لاوازیی خۆم هیچ نابینم".

منیش حوسام، که خۆم له دوکانی ئاسنگەرەکەدا حەشار دابوو، هیچم نەدی جگه له نوکی چەقۆ بە هەساندراوی و تیژکراوی که بەدەستی چەقۆسازەکەوە دەبریسکایەوە. عەلا هەموو شتێکی بەشێوەیەکی هەڵە لێکدەدایەوە. کەسێکی دەبینی له دەرەوە خۆی بینی سەیری ناوەوە دەکات، پڕ له رق، نەیدەتوانی له ئیزدیواجیەتی شەمس تێ بگات کاتێ بۆ نموونه وتی ئەو لەگەڵ سواڵکەران زۆر لەخۆبوردە و لەگەڵ ئەوانیتر لوتبەرز و خۆبەزلزانە.

رۆژ بەڕۆژ مەترسی زیاتر دەبوو. شەمس نەیدەتوانی بەئاسانی له قۆنیه بجولێتەوە بەبێ ئەوەی تووشی سووکایەتی پێکردن ببێ، بەشێوەیەك ئەو پشێوییە کاریگەری تەنانەت بە ماڵەکەیشەوە دیار بوو. له هەموو شوێنێك چپەچپ و روو گرژی و نیشانەی تووڕەیی دەبینرا. وام لێهاتبوو دەترسام لەوەی چێشتلێنەرەکە بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو بێزارییە گشتییە و هەوڵ بدات ژەهر بکاتە خواردنەکەی شەمس. بۆ ئەوەی ترس و نیگەرانی زیاتر نەکەم، هەواڵی ترس و نیگەرانیەکەم بەکەس نەدا، بەڵام من لەکاتی هەر ژەمێکی خواردندا بنەما رەچاوکراوەکانم فەرامۆش دەکرد و رامدەکرد پارووییەك له خواردنەکەی شەمسم وەردەگرت و بەپەله قووتم دەدا. دوای ئەوەی دەیان خواردنم بەو شێوەیە تاقیکردەوە، دڵنیا بووم لەوەی مەرگ له مۆبەقەوە نایەت.

ساڵێك بەسەر دیدارەکەیاندا تێپەڕی. پایز هات. زۆر ساد بوو. مەولانا رێگەی بە ئاهەنگێڕان بۆ ئەو رووداوە نەدا لەترسی ئەوەی نەوەك باڵندەکە، واتە شەمس، دوای ئەوەی دەزانێ ماوەیەکی زۆرە لەسەر هەمان لق نیشتۆتەوە، لەپڕ بفڕێ. بەگوێمان کرد. له٢٦ی جەمادی دوایی ساڵی ٦٤٣ کۆچی بێدەنگیەك باڵی کێشا. بەڵام ئێمه هەیەکەمان لەدڵی خۆیدا بەشێوەی خۆی ئاهەنگی بۆ یادی دەرکەوتنی "نانی برسییان" و "ئاوی تینوان" گێڕا.

بەشوێن نیشانەیەکدا گەڕام ئاماژە بێ بۆ خۆشی لەسەر رومەتی زەردی رۆمی بەڵام نەمدۆزیەوە، چونکه رازی نەبوو لەو رۆژەدا –که دەبوو رۆژی ئاهەنگگێران بێ– هیچ هەستێك دەربڕێ. هەردوو کەوانی لێوی سەرووی بەخاوکراوەیی مانەوە.

پاشان بڕیارم دا سەردانی شەمس بکەم، بەبێ بوونی ئومێدێکی گەورە چوومە کتێبخانەکەی جاران، که زۆربەی جار شوێنی خەڵوەتی هەردووکیان، ئەو و مەولانا، بوو. لەبەر ئەوەی شوێنەکەم باش دەناسی چیتر بۆنە بۆگەنەکیم بەلاوە سەیر نەبوو که ئەو ژوورە بەخۆیەوە نەدیبوو، کاتێ شەمس لەترسی ئەو کزەبایانەی لێیانەوە هەڵی دەکرد سەرجەم دەلاقەکانی داخست. لەم شوێنە سەرنجڕاکێشەدا، ئەگەرچی قەپاتیش بوو، بەشێوەیەکی سەیر بۆ ساتێك دوودڵ بووم. بەخۆمم وت بریا بەردەکانی ئەم ژوورە بیانتوانیایە قسەکانی ئەو دوو پیاوە تۆمار بکەن، ئەوکاتە پێش سەرجەم نووسینەکانی سۆفیەکانیان دەدایەوە، بە نووسینەکانی عەتار سەنائیشەوە. لەکاتێکدا ئەو ژوورەم دەپشکنی که نهێنیەکانی بەغیرەوە پاسەوانی دەکرێن،

کاغەزێکم دی لەسەر مێزێکی نزم کەوتبوو. فزولم پاڵی پێوە نام بیکەمەوە. دەسخەتی شەمس و بۆنی مرەکەبەکەم ناسیەوە کە هێشتا تازە بوو. تێیدا خوێندنەوە: "تیر چییە؟" وتوێژ. سندوق چییە؟ جیهانی حەقیقەت. کەوان چییە؟ هێزی حەقیقەت. تیر بێ کۆتاییە. لەو سندوقەی جیهانی حەقیقەتە هەندێ تیرم هەیە ناتوانم بیانهاوێژم. ئەو تیرانەی دەیانهاوێژم دەگەڕێنەوە بۆ سندوقەکە".

ئەوە تاکە بەڵگەنامە بوو بەدەسخەتی خۆی نووسرابوو لەو ڕۆژەدا، یادی دیدارەکەیان.

لە کەڕی زستاندا بووین. لە بەرەبەیانی ڕۆژێکی خۆرەتاودا، یاوەریی مەولانام کرد بۆ شارەکەم. بونیە و بەهێزیم یارمەتیدەر بوون بۆ دوورخستنەوەی سەرنجی فزولیەکان. لەناکاو، ڕۆمی بڕیاری دا بچێ بۆ کاروانسەرای زیا (الضیاء). کاروانسەرای وەزیر (ضیاء) کە ژنێکی تێدا دەژی ناوی تافوسە. ئەو ژنە سەماکەر بوو، هەروەها گۆرانی دەوت و گیتاریشی دەژەنی. بەبێ ئەوەی دوو لێوە بترەکێنم شوێنی کەوتم. کاتێ گەیشتینە شوێنی خانەکە بینینی ئەستێرە و تاق تاقەکان کە لاکانی هەیوانەکەیان ڕازاندبووەوە، سەرسامیان کردم.

وەك هەموو کاروانسەراکان، کاروانسەرای (ضیاء) لە دوو نهۆم پێکهاتبوو، لە قاتی خوارەوەدا تەویلە و دوکان و وەرشە و هۆڵی نانخواردنی تێدا بوو، کاتێ ئامادەبووان کە خەریکی نانخواردن بوون، ڕۆمییان بینی لەبەردەمیدا چەمانەوە و داوایان لێکرد لە نان بەکونجیەکەیان بخوات کە هەر ئێستا لە فڕنی نانەواچییەکە دەرهێنرابوو. بەئاماژەیەکی دەستی، مەولانا خوڵکەکەیانی ڕەت کردەوە و ڕووی کردە پلیکانەیەکی دەرەکی و سەرکەوت بۆ نهۆمی سەرەوە کە هەندێ ژووری لێبوو بەسەر داڵانەکەدا دەیانڕوانی. بەرانبەر ژوورەکەی تافوس وەستا. منیش وەك نەریتی هەمیشە بە دوورخستنەوەی فزولی و هەوادار و سەرچڵەکانەوە سەرقاڵ بووم. ئیتر وردە وردە ئەزموونم لەو جۆرە کارانەدا پەیدا دەکرد، ڕێك وەك چۆن لەکاتی دیاریکردنی ئەو بڕە پارەیەی پێویستە بۆ دیداری شەمس بدرێ، پەیدام کرد. جارێکیتر هێمنی باڵی کێشایەوە.

مەولانا لەسەر کاشییە ساردەکە دانیشت و منیش لەتەنیشتی وەستام. دوای ساتێك، لەپڕ دەرگای ژوورەکە کرایەوە و بۆن و بەرامەی یاسەمین هەڵیکرد، پاشان ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ هاتە دەرەوە، برۆکانی بەبۆیەی شین ڕەنگ کردبوو، کلەکە جوانیی چاوەکانی دەرخستبوو، ددانەکانی سەدەف سپی کردبوو، بەجوینی ڕووەکی تەنبول لێوەکانی سوور کردبوو. لەپشت ئەو چارشێوە ئاوریشمییە نیمچە شەفافەی کە لامسەلایی دابووی بەسەریدا، چەند پەلکێکی درێژ بەسەر پشتێکی باریکدا شۆڕ بووبووبەوە. هەر جوڵەیەکی دەکرد بازنە شوشەییە ڕەنگاوڕەنگەکانی دەزرینگانەوە.

بەدەم هەڵگرتنی گیتارەکەی بەدەستێکی سپیکەڵەی نەرمەوە هاتە پێشەوە و لەبەردەم مەولانادا چەمایەوە و –بەوپەڕی بوێری– بانگی کرد بۆ ژوورەکەی. بەسەرسوڕمانی هەمووان ڕۆمیش داواکەی قبوڵ کرد. من تاکە کەس بووم بەلامەوە سەیر نەبوو.

لە ماوەی سیازدە مانگی ڕابردوودا جارانی جار تاساوم و سەرسام بووم و دەمارم گرژ بووە. لەبەرئەوە هەرگیز بێزار نەبووم کە گەورەترین شێخی سۆفی بچێتە ژووری ئافرەتێکی بەدناو.

کاتێ خاوەنی کاروانسەراکە منی بینی لە دەرەوەی ژوورەوە بەپێوە وەستاوم تا بە تیشکی خۆری بەیانیان گەرمم بێتەوە، بانگی کردم بۆ ژووری ئەمبارەکە کە بەسەر سەربانی کاروانسەراکەدا دەیڕوانی و نموونەی ئەو کاڵایانەی تێدا ئەمبار دەکرا کە لە سەرتاسەری دنیاوە دەهێنران: شوشە لە حەلەبەوە، بەهارات لە زەنجبارەوە، عەنبەر لە هیندەوە، بلور لە میسرەوە، فەروو لە ئازربایجانەوە، ئاوریشمی چین و لۆکەی ئێرانی. چاوم لە کاڵایەکەوە دەچووە سەر کاڵایەکیتر. کاتێ دەستم دا لە قوماشە فارسیەکە، لەپڕ خۆمم لەوێ، لە نیسابور بینیەوە، لە دوکانی بۆنفرۆش و شاعیرەکە، عەتار. وام هەست دەکرد وەك ئەوەی لە پەرەسەندنە ڕۆحیەکەیدا ئامادە بم، لەو ڕۆژەدا بەدەروێشێك دەیبینم، ئەگەر بیەوێ، دەتوانێ دەستبەجێ بکەوێ و بمرێ.

توانیم عەتار ببینم لە دوکانەکەیدا دانیشتوە. لەپڕ پیاوێك بە جلوبەرگی شڕ و کۆنەوە لەبەردەم دوکانەکەدا وەستا و کەوتە پشکنینی گژوگیا و دەرمانە پیشاندراوەکان. عەتار بەشەرمێکەوە پێی وت: "ئەگەر کارێکت نیە لەوێ مەوەستە، یەڵا بڕۆ، بچۆ بەلای کارتەوە"، پیاوە هەژارەکە بەسادەیی وەڵامی دایەوە: "بڕوانە چۆن دەڕۆم"، مێزەرەکەی لەسەر زەوی دانا، سەری نایەسەری و گیانی سپارد.

ئەوە لەدوورەوە دەبینم. جارێکیتر دیمەنەکە دەبینم. من لە دوکانەکەی عەتارم بەهۆی ئەو مێزەرە لۆکەییەی لە خوراسان دروست کراوە، دەتوانم ئەو پیاوە ببینم لەو ساتەی دەمرێ.

دەستلێدانی پارچە ئاوریشمیەکەی شای سوچو لە وڵاتی فارس دوورم دەخاتەوە و دەمبات بۆ چین. دەمگێڕێتەوە بۆ زیاتر لە پێنج سەدە لەمەوبەر. ئەم جارەیان دەتوانم ژنەدۆستی شاهانە، یانگ غویفی ببینم، لەوکاتەی دەکوژرێ. جەللادەکە بەپشتوێنەکەی دەیخنکێنی بەبەرچاوی ئیمپراتۆر کسوانزنگەوە کە بە قوڵە دەڵپەکەی رووخساری خۆی دەشارێتەوە تا ئەو ئازارەی لەسەر رووی ئەو ئافرەتە نەبینێ کە شێت و شەیدای بوو و لە هەر شتێکیتر لەسەر رووی زەوی خۆشتری دەویست، دەکێشرێ.

ئێستا خۆم لە مەیخانەیەکدا دەبینم لە ماوی کە بەپاسەوانی ئیمپراتۆری دەورە دراوە. کات بەخێرایی تێدەپەڕێ و پێویستە تاکەکانی بەخێرایی لە یاخیبووان هەڵبێن. بەڵام سەرەڕای پشێوی و پەلەپەلی، وادیارە سەرکردەکانی سوپا کە بەرپرسیارن لە کوشتنی (یانغ غویفی) دڵنیان، لەبەرئەوەی ئێستا ڕزگاریان بووە لە سەرچاوەی هەموو کێشەکان و خراپە و دیاریکردنە جێگومانەکان. پێش ئەوەی مەیخانەکە

بەجێبێڵم کوڕی ئاسمان دەبینم پشتوێنە ئاوریشمیەکەی دەگێڕێتەوە کە بەهۆیەوە مەعشوقەکەی لەم جیهانەوە بۆ جیهانەکەیدی گواستەوە.

خۆم دەبینم لە نووسینگەی خاوەن خانەکە دانیشتووم. خۆبەخۆ، لەفە ئاوریشمەکەی گرت و کردی بە کراسەکەمدا، وەك یادگاریەکی ژنەدۆستە کوژراوەکە.

یەکێکیان شەرابی ئاوی گوڵ و پارچەیەك شیرینیی بادامی بۆ هێنام، لەپڕ دەنگی گیتارێك گەیشتە گوێم. هەموو بێدەنگ بوون. کەس نەبزوت. خاوەن خانەکە و یاریدەدەرەکەی فاتورەکەیان بەجێهێشت. ئەسپەوانان ئەسپەکانیان بەجێهێشت، ڕێبواران جانتاکانیان بەجێهێشت. ئاوازەکان لە ژووری تافوسەوە دەهاتن کە گەورەم لەوێ گوێی دەگرت، تاکە جەماوەری گوێگری بوو. تافوس خێرا ئاوازی گۆرانیەکانی بۆ ناسکیی مۆسیقاکەی زیاد کرد، پاشان ئامێرەکەی بەجێهێشت و دەستی بە ساما کرد —بەهەندێ جوڵە کە ڕەنگە جوانترین و شەنگترین بێ— وەك لە دەنگی خڕخاڵەکەیەوە بۆمان هەڵکەوت.

هەموو تاقی بەیانیم بەو حاڵە بەسەر برد. مەولانا هێشتا لە ژوورەکەیدا بوو. بۆنی برژان بەرەو ژووری خواردنەکەی بردم کە تێیدا هەندێ گەنج گۆشتی برژاو و شیر و شیرینی و خواردنەوەی جۆراوجۆریان لە سینی مسینی گەورەدا پێشکەش دەکرد. دانیشتم تا خواردنەکەم بخۆم، ئەو هەستەم لەلا دروست بوو ڕۆمی تا ماوەیەکی زۆر لەوێ دەرناچێ. نانی نیوەڕۆ پێشکەش کرا، هەروەها نوێژی نیوەڕۆیش لە نوێژگەکەی ناوەڕاستی حەوشەکەدا لەتەنیشت نافورەکە ئەنجام درا. ماوەی قەیلولە تێپەڕی و هیچ ئاماژەیەك لە ڕۆمیەوە دەرنەچوو. تافوس لە ژەنین و گۆرانی و سەماکردن بەردەوام بوو. وردە وردە ئێوارە هات. هەر کە ویستم کەسێك بنێرم بۆ ماڵ تا خێزانەکە دڵنیا بکەمەوە، لەپڕ مۆسیقا وەستا. ڕۆمی دەرکەوت و ژنە ژەنیارەکە یاوەری بوو، کە بەدەستی پارچەیەك مۆزلینی گرتبوو، کە پارچەیەك بوو لە مێزەرەکەی مەولانا وەك هێمایەك بۆ دەربڕینی پێزانینی پێشکەشی کردبوو، پارچە قوماشێك کە بەر ناوچەوانی ڕۆمی کەوتبوو.

دەروازەی خان هێشتا نەکرابووەوە، بینیمان گەنجینەداری سوڵتان چووە ژووری ئەو ئافرەتە. سەری بەمێزەرێکی سەوزی نەخشێنراو داپۆشرابوو، پاڵتۆیەکی مەخمەڵی شینی تاریکی لەبەر بوو کە ژمارەیەك دوگمەی لەسەرەوە بوو کە بەدەزووی ئاڵتونی دوورابوون. لە ناوەڕاستیدا دوو شمشێر دەبریسکانەوە، پاسەوانەکانی بەشوێنیەوە بوون.

ئاسانە خەیاڵ بکرێ چی لەنێوانی هەردووکیاندا رووی داوە، کاتێ گەنجینەدارە توندەکە بینی بە بازنەی پاسەوانانی مەولانا دەورە دراوە، لەبەردەم جوانیەکی نوێدا ڕاچڵەکا، جوانتر لەپێشتر. ئێستا دڵنیایی زیاتر لەسەر ڕوومەتی تافوس دەرکەوت و درەوشانەوە و شۆخ و شەنگیی زیاتر بوو. لێی پرسی و زانی ڕۆمی بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵ ئەودا بەسەر بردوە. بەتاساوی، ویستی دەستبەجێ ئەو ئافرەتە بخوازێ کە ئەو

دیاریەی مەولانا پێشکەشی کردبوو لە مەچەکی بەستبوو، ئەو شیتێکی بچوکی مۆزلین بوو لە مێزەرەکەی بڕی. بۆ زیادکردنی نیعمەت بۆ ئەو دەستە، بە پەنجا هەزار دینار پڕی کرد، تا ساڵانێکی زۆر شار ئەم چیرۆکەی دەماودەم دەگێڕایەوە. پاشان تافوسی نارد بۆ گەرماو و ڕۆژی دواتر مارەی کرد. بۆ ئامادەبوون لە ئاهەنگی زەماوەندی ژنە گیتارژەنەکە و گەنجینەداری سوڵتان هەموومان خوڵك کراین: ڕۆمی و شەمس و سەلاحی زێڕنگەر، سوڵتان وەلەد، زریانوسی یۆنانی و من، حوسام.

سەرجەم خەڵکی قۆنیە دەیانپرسی: چۆن دەکرێ ئەو پیاوە دەمارگیرە ئاسۆ تەسکە تافوسی بێڕەوشت بخوازێ؟ من و ڕۆمی تاکە کەس بووین دەمانتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە.

دوای ئەوەی ئەمڕۆمان لە خانەکە بەسەر برد، کە مۆسیقاکەی تافوس نوقمی کردبووین، کاتێکی دێر گەڕاینەوە بۆ ماڵ. چەند فانۆسێك حەوشەکەیان ڕووناك دەکردەوە و چەند مۆمێك لە ژوورەکەی شەمسدا تروسکەیان دەهات، کە لەسەر دەرگاکەی بەدەسخەتی مەولانا نووسرابوو: "ماڵی خۆشەویستی خدر"، وەك ئاماژە بۆ ئەوەی شەمس شوێنی ڕۆمی کەوتوە وەك کە مووسا شوێن خدری زیندە کەوتبوو.

هاتە ژوورەکە، هیوای خەوێکی خۆشی بۆ خواستین و بەپەلە دەرگاکەی داخست. پاشان گوێم لێ بوو ئەو بەیتانەی شەمسی دەوتەوە:

**من وەك گیتارێکم، خۆم بەدەستەوە داوە و سەرم دانەواندوە**

**تۆ، بەدەستەکانت، ئەمژەنی و یاریم پێ ئەکەی**

دوای هەفتەیەك، چوارسەد و هەشتا و شەش ڕۆژ دوای دیدارەکەیان، شەمس قۆنیەی بەجێهێشت.

# فڕینی ئازیز

له دواین ڕۆژەکانی ژیانی له شارەکەدا، ئەو تۆمەتانەی دوژمنانی ئاراستەیان دەکرد ورده ورده مەترسیان زیاتر و توندتر دەبوو. عەلا کوڕه بچوکی ڕۆمی لەسەرووی ئەو نارازیانەوه بوو. کەوتنه وەسفکردنی شەمس بەهەندێ دەستەواژەی وەك "جادوگەر" و "ویژدان دز" ئێسته لەبەرچاوییان بۆته "سیحربازێکی خراپەکار". بڕیاریان دا بابەتەکه کۆنترۆڵ بکەن. توندڕەوترینیان پێشنیاری کوشتنی شەمسی کرد. بەڵام میانڕەوەکانیان ویستیان پەنا بۆ شەریعەت ببەن بۆ شاربەدەرکردنی، هەندێکیتر ئاواتەخواز بوون ژیانی لێ تێکبدەن و ناچاری بکەن شارەکه بەجێ بێڵێ. ئەم کۆمەڵەیەی دوایی سەرکەوتن.

پێش ئێوارەی ئەو ڕۆژەی شەمس تێیدا ئۆغری کرد، واته پێش فڕینی، هاتم بۆ سەردانی، ئەم جاره ڕێگەی پێدام بچمه ژوورەکەی. کاتێ له دەرگاکه دەپەڕیمەوه چیرۆکی هەڵهاتنی باڵندەیەکیترم بیر کەوتەوه، چیرۆکێك عەتاری شاعیر گێڕایەوه که ئەبو یەزید دەڵێ: "یەکێتیم بەدیهێنا و بۆ پێگەیشتنی کەوتمه ڕێ. بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەم شیوەدا دەگەڕام، بەدەم ڕێوه رادەمام، تا بوومه باڵندەیەك، جەستەی یەکێتی و پەڕەکەی نەمری بوو، پاشان بەناو هەوای "چۆن"دا فڕیم و بەخۆمم وت من دوای ئەوەی لەچاوی مەخلوقاتەکانی تر ون بووم پێویسته بگەمه خالق. پاشان له شیوی زاتی ئیلاهیدا دەرکەوتم و کاسەیەکم خواردەوه که تینوێتیمی بۆ نەمری نەشکاند، بەدرێژایی سی هەزار ساڵ لەئاسمانی یەکتایی خوادا فڕیم. بەدرێژایی سی هەزار ساڵ لەئولوهیەتیدا فڕیم، سی هەزار ساڵیتر له زاتیدا فڕیم. کاتێ نەوەد هەزار ساڵ تێپەڕی ئەبو یەزیدم بینی. هەمووی ئەوەی دیم خۆم بووم. پاشان چوار هەزار بیابانم بڕی و گەیشتمه کۆتایی. کاتێ سەیری چوار دەوری خۆمم کرد خۆمم لای یەکەمین هەنگاودا بینی که پێغەمبەران ناویانه".

شەمس له ژووره زۆر لەبارەکەیدا لەسەرما هەڵدەلەرزی. پەنجه درێژەکانی سوور دەردەکەوتن، چەمیمەوه و دەستەکانیم گرت و بەرزم کردنەوه بۆ لێوەکانم وه هەولم دا بەهەناسەکانم گەرمیان بکەمەوه. باسی کۆمەڵێ شتی جیاوازی بۆ کردم، پاشان پێی وتم: "کاتی ئەوه هاتووه بڕۆم. له هەموو ساتێکدا دابڕان (فیراق)ێك هەیه. لەهەموو ساتێکدا هاتنێك هەیه. لەهەموو ساتێکدا چوونێك هەیه".

بەردەوام له خۆم تووڕه بووم لەبەرئەوەی نەمتوانی، لەو وشه زۆر ڕۆشنانەدا، نیازێکی ئاشکرا بۆ ڕۆیشتن ببینم.

بەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆمی ژوورەکەی شەمسی بەچۆڵی بینی، دەستبەجێ چەند پیاوێکی نارد تا له هەموو خانەکان و له هەموو دەرگایەك لەدەرگاکانی شار بەشوێنیدا بگەڕێن، تا باڵندەکه دوور نەفڕێ، بەڵام

هەوڵەکانیان شکستی هێنا. خۆی لە شێوەی دەروێشێکی نەناسراودا شاردەوە، ئەو پیاوەی بەناوبانگترین زانایان هەوڵ دەدەن پێی بگەن، ئەمیر و سوڵتان داوای دەکەن، توانی بەبێ ئەوەی کەس بیناسێ شارەکە بەجێ بێڵێ.

بەدرێژایی ساڵێك بێدەنگیەکی نوتەك باڵی بەسەر کون و قوژبنی ماڵەکەدا کێشا. چیتر دەنگی دەفلێدان نەدەبیسترا، خۆشی لە دڵەکان تۆرا، کۆڕەکانی مۆسیقا و بیستن وەستان. مەولانا چیتر کەسی نەدەبینی، چیتر پێنەدەکەنی، چیتر نەدەچوو بۆ گەرماوی گشتی، هەروەها چیتر خەریکە بڵێین نانی نەدەخوارد. واهاتە پێش چاو تاکە بەسترانەوەی بەژیانەوە لە ئومێدی ئەوەدا بێ کەسێك زانیارییەکی لەبارەی شەمسەوە بۆ بێنێ کە دیار نەماوە: ئەو لەکوێیە؟ بۆ چ شارێك چووە؟ لەگەڵ کێدا بینراوە؟.

هەرکات سەردانیکەرێکی نەناسراو داوای بینینی مەولانای بکردایە لەڕێی میانجیگەرێکەوە کە یەکێك بوو لە ئێمە لەبارەی دۆخی ڕێگەوبان، لەبارەی چەتەکان، لەبارەی هۆکانی حەوانەوەی بەردەست لە خانەکان و باری ئاسایشی شارەکان، پرسیاری لێدەکرد. کاتێ سەردانیکەری بێچارە تێنەدەگەیشت ئەم هەموو پرسیارەی بۆچی لێدەکرێ، هەوڵی دەدا بەپێی توانا لە وەڵامەکانیدا ورد بێ، هەمیشە دیدارەکە بەم پرسیارەی خوارەوە کۆتایی پێدێنین کە سەد جار دووبارە دەبێتەوە:

"ئایا ڕێکەوتوە لەکاتی گەشتەکانتدا پیاوێکت دیبێ تەمەنی نزیکەی شەست ساڵە، بەژن درێژ و باریکەلە و هەستیار بەرامبەر سەرما، کڵاوێکی ڕەشی کەتانی بەسەرەوەیە، وشك و تنە تەبیاتە؟ غەریبەکەش عادەتەن وەڵام دەداتەوە کە پیاوێکی لەو جۆرەی نەکەوتۆتە بەرچاو. بەڵێ، پیاوانێکی بەساڵاچووی بێزاری دیوە. بەڵێ پیری جۆراوجۆری دیون،. بەژن درێژ؟، بەڵام باڵابەرز نین، هەروەها پیاوانێکی لەڕ و لاواز، کە هەڵێشدەلەرزن. دەتوانی ئەمانە لە هەموو ڕێگەکانی سەفەردا ببینی.

ئێمە دەگەڕاینەوە بۆ لای مەولانا و ئەم تەفسیرانەمان پێشکەشی ئەو پیاوە دەکرد، کە ئیدی خۆی بە "ئەو یەکەی چاوەڕوان دەکات" دەناساند.

"چوار سەد و هەشتا و شەش ڕۆژ" ڕۆمی بەبێ ماندووبوون بەوردی ئەو ڕۆژانەی دەژمارد کە بەیاوەری شەمس بەسەری بردوون.

لە چەند مانگی دوای ئەوەدا ئەو پیلانگێڕانە بێئومێد بوون کە گومانیان وابوو فڕینی باڵندەکە ساردیی ڕۆمی بەرامبەریان دەگۆڕێ. ڕۆمی نەك هەر ڕازی نەبوو بیانگێڕێتەوە ناو بازنەکەی، بەڵکو باوەڕیشی وابوو ڕەفتاری دزێوی ئەوان هۆی ڕاستەقینەی ڕۆیشتنی شەمس بووە، لە ماڵەکەی و لە دەستوپێوەندی خۆی دەریکردن، ئەو موریدانەی پێشوویش کە ئومێدیان وابوو مەولانا دەست بەوانەکانی دەکاتەوە، ڕژانەوە ناو حەوشەکە.

"ئەم شوێنە لەپیس و چەپەڵیان پاك بکەرەوە" مەولانا وتی "تا سێبەریان نەکەمە ئامانج".

لە زمانی فارسیدا دەستەواژەی "کردنەئامانجی سێبەری کەسێك" هەڕەشەیەکی توندە، بەو مانایەی تەنیا جەستەی مرۆڤ، بەڵکو سێبەریشی دەکاتە ئامانج، واتە بەتەواوی لە بوون بیانسڕێتەوە. وای لێهات رۆژانە دەیان جار ئەم دەستەواژەیەم بەرگوێ دەکەوت، ئەو رۆمییە بەسەبر و ناسك و نەرم و نیانە گۆڕابوو بۆ کەسێکی بێ چیکڵدان و پەست و زوو تووڕە. بووبوو بە شەمسی تەورێزی خۆی.

هەرچی عەلای بەدئاکاری دووەم کوڕی مەولانا بوو، فەوتاو دەهاتە پێش چاو. ئەویش ئومێدی وابوو — دوای ئەوەی شەمس دەکەوێتە ئەودیو شوورەکانی قۆنیە— رۆمی بگەڕێتەوە سەر سروشتی جارانی پێش ئەوەی کۆڕەکانی مۆسیقا و بیستن ئەنجام بدرێن، ببێتەوە بەو پیاوەی هەزاران مورید لەدەوری ئەڵقەیان دەبەست، ئەو پیاوەی شەوانە رۆژ لە نزا و نوێژکردن نەدەوەستا، بەڵام پاش ماوەیەك عەلایش ناچار بوو ماڵ بەجێ بێڵێ، چونکە باوکی رازی نەبوو تەنانەت سەیری چاوەکانیشی بکات.

کات زۆر بەهێواشی تێدەپەڕی. چیتر مەولانا کۆڕی مۆسیقا و بیستنی ئەنجام نەدەدا و یەك بەیتە شیعریشی نەدەنووسی. ساڵێك لە بێدەنگیەکی نوتەك تێپەڕی. لەو زستانەدا بەفربارین نەوەستا و گومەزی قوتابخانە بچوکەکەی قۆنیە بەدرێژایی چەندین مانگ سپی بوو. بۆ چەندین ساڵ هەندێ بەفرمان ئامادە دەکرد بۆ دروستکردنی شەربەتی میوە کە مەولانا زۆر حەزی لێدەکرد. لەو شەوە زۆر ساردانەدا، من و زریانوس چەندین خشتە سەهۆڵمان دروست دەکرد و رێگەمان دەدا ئاوەکە هەڵبقوڵێ تا گۆمێکی تەنك دروست بکات. لەبەرئەوەی من و ئەو لەناو موریدەکان لەڕووی جەستەوە بەهێزترین بووین کرابووە ئەرکی ئێمە خشتە سەهۆڵەکان بە تەور و زەنگن پارچە پارچە بکەین. پاشان بارستە سەهۆڵەکانمان لەسەر شانە پانەکانمان —ئەوکاتە سینگم لە پایەکانی مزگەوتەکان دەچوو نەك داڵانەکانیان— دەمانبردن بۆ ئەشکەوتەکان کە تاقی بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکراویان تێدا بوو.

بەیانیەکیان لەکاتێکدا سەرقاڵی کار بووین، غەریبەیەك هاتە حەوشەکە و وتی بازرگانە و لە دیمەشقەوە هاتووە. وەك ئەوانەی پێشتر هەمان کۆمەڵە پرسیارم لەویش کردەوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئاخۆ پیاوێکی پیری باڵا بەرزی باریکەلەی دیوە کە هەڵدەلەرزێ، وەڵامی دایەوە چەند جارێك لە بازاڕی شارەکەیدا پیاوێکی دیوە تەواو لە شەمس دەچێ. کاتێ گوێم لەوە بوو بارستە سەهۆڵەکەم لەدەست بەربوویەوە و ئامادە بووم وازی لێبێنم بتوێتەوە و تەواوی کاری ئەو رۆژەم بەفیڕۆ بڕوات، دوو پێم هەبوو دوویترم قەرز کرد و بەفڕکان رامکرد تا زوو هەواڵەکە بگەیەنمە مەولانا. لە کتێبخانەکانی جاراندا لەبەردەم وێنەکێشێکی بەناوبانگی کۆشکدا وەستابوو، وێنەکێشەکە هەوڵی دەدا لەسەر داوای ئەمیرە غوردجی خوشکی سوڵتان کە یەکێك بوو لە ژنە موریدە دڵگەرمەکانی مەولانا بوو، تابلۆیەکی وێنەی مەولانا بکێشێ، تا لە گەشتەکانیدا یاوەری رۆحیی بێ.

نەمویست تەرکیزی وێنەکێشەکە تێکبدەم کە چاوەکانی لەنێوان رووی مەولانا و تابلۆکەدا دەهێنا و دەبرد و فڵچەکەیشی بەدەستەوە بوو. بە فڵچەکەی وێنەی دەکێشا و بەدەستەکەیتریشی رەنگی دەکرد. رۆمی باسی وردیی پێغەمبەر و وێنەکێش (مانی) دەکرد کە لە قەبارەی هێندەی هێلکەیەکدا وێنەی "چارەکە ئاوەدانەکە"ی زەوی واتە "وشکانی بەسەرجەم شارەکانیەوە" و "سێ لەسەر چوارە چۆڵەوانیەکەی" کێشاوە. بەڵام وەك مەولانا وتی، لەوە گەورەتر عەباکەی مانی بوو، کە کاتێ لەبەری دەکرد دیار بوو، کاتێکیش دایدەکەند دیار نەدەما.

کاتێ وێنەکێشەکە وێنەکەی تەواو کرد، هونەرمەندەکە دوا سەرنجی رۆمی و تەواوی تابلۆکەی دا. بەڵام سەری سوڕما کە لەپڕ ئەو تابلۆیەی کێشابووی هەر لێکچوونێکی بەو وێنەیەی مەولاناوە کە کێشابووی لەدەست دا. بەپەشۆکاوی جارێکیتر هەوڵی دایەوە، بەڵام ئەم جارەیشیان سەرکەوتوو نەبوو. بەدڵنیاییەوە خەفەتی زۆری بەوە خواردوە. دەستی کرد بە دەستکاریکردنی هێڵێك لێرە و کاڵکردنەوە یان باشکردنی رەنگێك لەوێ، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك. سەرەنجام، نەیدەزانی چی بکات. لە گەرمەی بێئومێدی و حیرەتەکەیدا بڕیاریدا واز لە هەوڵەکەی بێنێ. کاتێ مەولانا نیشانەی بێئومێدی لەسەر رووی وێنەکێشەکە بینی، قەسیدەیەکی وت. کەوتمە گوێلێگرتنی و تەماشای تابلۆکەیشم دەکرد. وا هاتە پێش چاوم وێنەی ئەو پیاوەی قسەی دەکرد وا لەبەرچاوم دروست دەبوو و دەتوایەوە:

بەبێ هیچ رەنگێك
بەبێ هیچ نیشانەیەك!
من، کەی توانای ئەوەم ئەبێ
دواجار خۆم ببینم
وەك کە هەم لەڕاستیدا؟

ئەڵێی: "نهێنیەکانت بێنە
لەبارەیانەوە قسەم بۆ بکە،
لە چەقدا دایانبنێ
بەڵام کێ ئەتوانێ بڵێ
چەق لەکوێیە
ئەو چەقە کە منم؟

کەی جۆگەلەی رۆحم

دائەمرکێ و ئۆقرە ئەگرێ؟
منم کە بە ئارامی ئەمێنێ،
ئەو رۆحەی ئەچێ کە منم

ئۆقیانوسم، ئایا
ئەویش نوقمبوونە.
ئای چەند سەیرە، ئەو ئۆقیانوسە
بێ کەنارە، ئەوە منم

لەم جیهانەدا بۆم مەگەڕێ
لەو جیهانەدا بۆم مەگەڕێ
چونکە هەردووکیان فەوتان
لەم جیهانەدا، لێرە، من!

وەك عەدەم من رەهام
لە زیان و لە قازانج
ئای چ شتێکی نامۆ و تاکانەیە
بەبێ قازانج یان زیانم، من!

وتم: "ئەی نەفەس، تۆ وەك
جەوهەری ئێمەیت"، پێی وتم:
"ئەی ئەبێ ئەم جەوهەرە چی بێ،
لەم بینراوەدا، کە منم؟"

وتم: "بڕوانە تۆ کێیت".
وتی: "ئۆهـ، بێدەنگبە،
زمان نەگەیشت،
بڕوانە قسە بۆ کێ ئەکات
بەبێ یەك وشە،

ئەوە منم".

وتم: "ئەگەر زمان ئەڵێ:
بۆچی نەگەیشتی؟
بڕوانە قسە بۆ کێ ئەکات،
بەبێ وشەیەك، ئەوە منم!".

هەروەها من، بەبێ دوو پێم وەك مانگ،
رووم کردە عەدەم
سەیری خزمەتکارەکەت بکە کە ئەڕوات
بەبێ دوو پێ، کە منم!

دەنگێك هات و پرسی،
"بەڵام بۆچی ئەڕۆی؟
بڕوانە ئێرە ئەم بینراوە،
نەبینراوە کە منم!"

دیم، شەمسی تەورێزی
بەم شێوەیە بوومە
تاکە ئۆقیانوس، گەنجینە و
کانە بەردەکانیش، کە منم!.

"بینیم، شەمسی تەورێزی". نەمتوانی پرسیاری لێبکەم تا وەڵامێکی باشترم دەست بکەوێ. دەستەواژەکەم بەنزیکەیی دەقاودەق دووبارە کردەوە: "بازرگانێك لە دیمەشقەوە هاتووە شەمسی تەورێزی دیوە".

بەبێزاریەوە تەماشایەکی ئەو شوێنەی کرد کە من تێیدا وەستابووم و ئاو تەڕی کردبوو و وەك حەوزێکی میزی لێهاتبوو. چەند راڤەیەکم لەبارەی پارچە سەهۆڵەکان کەوا دیارە بەهۆی بەرکەوتنی پێستم و رۆچوونیان بەناو جلەکانمدا، دەستیان بە توانەوە کردووە، خستەڕوو. سەرنجی هەردوو دەستمی دا کە هێشتا لە توندیی سەرما و ماندوێتیدا خوێنیان لێ دەتکا. پاشان بەسەفایەکی تەواوەوە داوای لێکردم

مژدەکە جارێك و دوو جار و سێ جار دووبارە بکەمەوە... "بازرگانێك لە دیمەشقەوە هاتووە شەمسی تەورێزی دیوە". وا هاتە پێش چاوم دەیەوێ درێژە بەو خۆشیە بدات کە پەیدا بووە، پاشان داوای لێکردم و ئەو بازرگانە بێنم، رایشیسپاردم جلوبەرگی رەسمی پێشکەش بکەم".

ژوورەکەم بەجێهێشت تەماشای ئەو ئاسەوارەم کرد کە شلەکە لەرێی رۆیشتنمەوە بەجێی هێشت. گەرامەوە بۆ گۆرەپانە بە بەفر داپۆشراوەکە کە کابرای هەواڵهێن چاوەرێی دەکرد. پیاوەکە شپرز بوو کە ئومێدی نەبوو تەنانەت دیدارێکی سادەی لەگەڵ رۆمی بۆ هەڵبکەوێ، کەچی ئێستە خۆی دەبینێ بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ وەك ئەوەی چاکەیەکی گەورەی بۆ مەولانا کردبێ. شەمس فەرمانی بە وێنەکێشەکە کرد وێنەیەکی شەمس بکێشێ، جەختی لەوە کرد کە ناتوانێ وێنەی ئەو هەناسەیە بکێشێ کە ژیان لە روخساریدا پەخش دەکات. هونەرمەندەکە دەستبەجێ دەست بەکار بوو. هەر زوو سیمای باڵندەکە وردە وردە بە مرەکەبی رەش دەرکەوت. هەر هێندەی تابلۆکە تەواو بوو بازرگانەکە هاواری کرد "خۆیەتی! من دڵنیام ئەوە ئەوە. ئەو پیاوەی لەبازاری دیمەشق بینیم ئەوە خۆیەتی".

لەو ساتەدا زەردەخەنە جارێکیتر لەسەر رووخساری مەولانا درەوشایەوە. بینیم خەم دەگۆرێ بۆ خۆشی. ژیان جارێکی تر گەرایەوە بۆ ماڵەکە. خزمەتکارێك زەویەکەی بەگوڵاو ئاوپژێن کرد و چراکانی داگیرساند، چێشتلێنەران جۆرەها شیرینی و خواردنەوەیان ئامادە کرد، پیاوان جلە تاریکەکانیان گۆری کە تا ئەو کاتە ئامادە بووە بۆ خەمباری و جلی ئاڵ و والآیان پۆشی، من و زریانوسیش بارستە سەهۆڵەکانمان بەجێهێشت. دوای ئەو هەموو مانگە لە گرفتاری، رۆمیم بینی دەستی بەنووسین کردەوە. چەند پیاوێکی جێمتمانەمان نارد بۆ دیمەشق بۆ گەران بەدوای خۆشەویستەکەی و پێدانی نامەیەك.

دوای هەفتەیەك یەکەم وەڵام لە شەمسەوە گەیشت، "دەمەوێ بەمەولانا بڵێم کە من خەریکی نزا و پارانەوەم و پەیوەندیم لەگەڵ هیچ مەخلوقێکی زیندوودا نەماوە".

زۆر بیرمان لە مانای نامەکە کردەوە، لەکۆتاییدا وامان لێکدایەوە کە ئامادەن بۆ گەرانەوە، بۆ لابەندی (وەلا)، بۆ زەماوەندێك لە ئایندەدا، هەر دەبێ دەستەواژەی "پەیوەندیم لەگەڵ هیچ مەخلوقێکی زیندوودا نەماوە" بۆ دڵنیاکردنەوەی رۆمییە، کە تا ئەو کاتە باوەرم نەدەکرد لەوانەیە غیرە بیگرێ. ژەنیاران لە گۆرەپانی قوتابخانەکەدا کۆبوونەوە و خۆیان بۆ ژەنینی جوانترین و بەجۆشترین ئاواز ئامادە کرد. ئێمە، من زریانوس و سەلآحی زێرنگەر و سوڵتان وەلەد چاومان لە سازکردنی کۆری مۆسیقا و بیستن بوو. گوێم لە دەنگی سنوج بوو لە ژوورەکانی ئافرەتانەوە دەهات.

رۆمی پەری قەڵەمەکەی هەڵگرت و وەڵامێکی بۆ نامە تەمومژاویەکەی شەمس نووسی، قەسیدەیەك بوو رێگەی پێدام بیخوێنمەوە. بەرزم کردەوە و نام بە لێوەکانمەوە، پاشان بەرزم کردەوە و نامە سەر چاوەکانم. دوای چەند دەربرینێکی ستایش، خوێندمەوە:

**لەو ساتەوە تۆ ئۆغرت کردوە،**

**لێت جیا بوومەوە،**

**وەك چۆن مۆم،**

**لە هەنگوین جیا ئەبێتەوە.**

**هەموو شەوێك،**

**وەك مۆمێك ئەسووتێم،**

**بەئاگری داخ ئەبم،**

**لە دۆستایەتی مەحروم ئەبم.**

**لە دووریی جوانیت لە ئێمە**

**جەستەم**

**وێران و رۆحم،**

**تێیدا وەك کوندەپەپووە.**

**دەی رەشۆی ئەسپەکەت راکێشە**

**بۆ ئەم رێیە**

**لوتی فیلێك پڕکە لە عیشق**

**تا لێوەکان**

**بەبێ تۆ، بیستن حەڵاڵ نیە،**

**وەك شەیتان کە گۆرانی وت و رەجم کرا**

**بەبێ تۆ ، یەك غەزەل نەوتراوە،**

**تا پێشوازی ئەم نێردراوەم کرد، نیشانەی شەرەف.**

**پاشان کە بەبیستنی نامەکەت دڵخۆش بووم**

**پێنج یان شەش غەزەلیاتم نووسی.**

**خوا بەتۆوە شەومی وەك بەیانی روناك کردەوە،**

**ئەی ئەو کەسەی شکۆی دیمەشق و ئەرمینیا و رۆمات تێدایە.**

نێدردراوێکیتر ئەم قەسیدەیەی برد بۆ شەمس، شەمسی باڵندە. رۆمی چەند نامەیەکیتری لە شەمسەوە بەدەست گەیشت.

نامەگۆڕینەوە سێ مانگ بەردەوام بوو. رۆژێکیان هەستی کرد ماوەی دابڕانەکە ئەوی گەیاندوە و ئێستا ئیتر سەرەنجام دەتوانێ میوەکە لێبکاتەوە، لەبەرئەوە داوای لەو باڵندەیە کرد کە بۆ قۆنیە فڕی، بگەڕێتەوە. زریانوس نێردرا بۆ دیمەشق و داوای لێکرا شەمس قایل بکات بە گەڕانەوە، لەگەڵ خۆیشی قەسیدەیەکی برد:

بڕۆن هاوڕێیان،
هاوڕێکەم بێنن،
لەکۆتاییدا مەعشوقە هەڵاتووەکەم،
بۆ بێنن.

بەعوزری شیرین و
سرودی هاوسەنگ،
ئەو مانگە روو جوانە،
بێننەوە بۆ ماڵ.

ئەگەر بەڵێنیدا و وتی:
بەم نزیکانە دێم،
چونکە هەموو بەڵێنێکی،
فێڵێکە ئێوەی پێ ئەخەڵەتێنێ.

هەناسەکانی گەرمن
بەجوانیەکانی و بەسیحرەکەی
ئەتوانێ ئاو گرێ بدات و
هەوا مۆر بکات.

لە وەڵامەکەی شەمسدا هیچ لاریبوونێکمان بۆ بیرۆکەی گەڕانەوەی نەبینی. مەولانا داوای لە سوڵتان وەلەد و بیست کەس لە شوێنکەوتە دڵسۆزەکانی کرد دەستبەجێ بچن بۆ دیمەشق و "مەعشوقی هەڵاتوو" بهێننەوە. لە بەرەبەیانی رۆژێکی بەهاردا، یاوەریی کوڕە راساڵەکە و یاوەرانیم کرد تا دەروازەی شار. هۆزە

تورکەکان پێش هاتنی هاوین خێوەتەکانیان دەکردەوە و ماڵاتەکانیان جەم دەکرد. حەپەی سەگ وەڵامی هاواری لەقلەقەکانی دەدایەوە کە پاش گەڕانەوەیان لە کۆچێکی درێژ باڵەکانیان بەسەر لاقە بەرزەکانیاندا پەخش دەکرد. ئەم قسە میللیەم بیر کەوتەوە کە دەڵێ لەقلەق سەر منارەکان دەکاتە ماڵی خۆی و هەموو ساڵێك بەسپیپۆشی حەجی مەککەی پیرۆز دەکات. مەولانا هەمیشە دەیوت هاواری لەقلەق "لاك لاك" ئاماژەیەکە لە زمانی عەرەبیدا باوەڕ بە یەکتاپەرستی دەگەیەنێ.

دوای ئەوەی لە دەروازەی شار ماڵئاواییم لە سوڵتان وەلەد و دەست و پێوەندەکەی کرد و بەچاوەکانم لە ڕێگەیاندا بۆ دیمەشق بەڕێم کردن، دەمتوانی بێنمە بەرچاو کاتێ دەگەڕێنەوە بەنرخترین دیارییان لەگەڵ خۆیان هێناوەتەوە، شەمسی تەورێزی.

بەتێپەڕینی کات، وادیار بوو چاوەڕوانکردنی دیداری ئەو دووانە کاریگەری هەبووە باشکردنی رواڵەتی ڕۆمیدا. ڕوومەتە زەردەکەی سوورایی بۆ گەڕایەوە.

ڕۆمی گەڕایەوە سەر ئەنجامدانی ئەڵقەکانی مۆسیقا و بیستن. وەك نەریتی خۆی بەدەم جوینی پارچەیەك بەفرەوە سەمای دەکرد. ڕۆحی بۆ گەڕایەوە. ئاخر چ بۆنەیەك لەمە باشتر وای لێدەکات دەست بە بیستن و خولانەوە بکات. ڕۆژێکیان لە ناوەڕاستی بازاڕ پیاوێکی تورکی بینی پێستی ڕێوی دەفرۆشت و بەزمانی دایك هاواری دەکرد "دلکو، دلکو" (واتە ڕێوی، ڕێوی). دەستبەجێ مەولانا لە شوێنکەوتوانی جیا بوویەوە و لەسەر هەمان ئاهەنگ کەوتە خولانەوە و نرکەنرك. "دل کو، دل کو" بەزمانی فارسی بەمانای "دڵ لەکوێیە" دێ؟. دڵ لەکوێیە؟ شوێن جوڵەکانی کەوتین و لەسەر ریتمی ئەم وشەیە بەدەم گەڕانەوەمانەوە بۆ قوتابخانە سەمامان دەکردن.

ڕۆژێکیتر، لەکاتێکدا لە سەمادا نوقم بووبووین، مەولانا بەدەم خولانەوەوە جلەکانی بەسەر سرودبێژاندا دابەش کرد تاخەریك بوو هیچی لەبەر دا نەمێنێ و رووت ببێتەوە. خانەخوێکەی کە بەم شێوەیە بینی زوو رایکرد بە عەبایەك لە قوماشی سوور و فەروی بەور و مێزەرێك لە لۆکەی میسری داپۆشی، بەڵام ڕۆمی لە خولانەوەی بەردەوام بوو بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات کە ئایا رووتە یان پۆشتە. کاتێ کۆڕی بیستنەکە تەواو بوو و لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵ، گوێی لە دەنگی ژەنینی رەبابە بوو لە مەیخانەیەکی ئەرمەنیەوە بەرز دەبوویەوە. لەپڕ وەستا، ئەنجا ئەو کەسانەی ئەڵقەیان لەدەوری دابوو کۆیکردنەوە و لەگەڵیان کەوتە سەما. لە بەرەبەیاندا جلە قەشەنگەکانی دایە کابرای ئەرمەنی و بەنیمچە رووتی گەڕایەوە ماڵ.

هەندێ جار لەکاتی سەمای بیستنەکەدا بەباڵم دەمگرت و بەپاڵتۆکەم دامدەپۆشی دوای ئەوەی خۆی لە هەموو جلەکانی رەها دەکرد و نەشوە دەیگرت. چۆن دەکرێ ئەم پیاوە کە بەرێز و گەورەیە لەلامان، ئەم پیاوە کە دەنگی خوایە، یەکگرتنی هەردوو جیهانە، ببینین بە نیمچە رووتی لەبەردەمماندا سەما بکات؟

رۆژێکیان لە حەمام بینیم بەدڵپڕی لە جەستەی ورد دەبووەوە. کاتێ بینی من لە ژوورۆچکەکەدام وتی: "لە هەموو ژیانمدا هەستم بەشەرم نەکردوە، نازانم چییە، بەڵام ئەمڕۆ شەرم لە بینینی جەستەی لەڕ و لاوازم دەکەم. جەستەم قسەی لەگەڵ کردم، جەستەم لێم دوور کەوتەوە، سکاڵای هێنایە لام، سەرزەنشتی کردم لەبەرئەوەی یەك رۆژ پشووم پێ نەبەخشیوە".

جەستەی زۆر لاواز بووبوو. جەستەی وەرزشیی خۆم، بەبەراورد بە جەستەی ئەو، وا هاتە پێش چاوم وەك ئەوەی لە ماددەیەکی تەواو جیاواز دروست کرابێ. بیرم دێ یەکەم جار کە سێ ساڵ لەمەوبەر بینیم، پاڵتۆیەکی سپی رەنگ شیری لەبەردا بوو، مێزەرێکی بەرێکی پێچراوەی بەسەرەوە بوو. ئەوکاتە ماسولکەکانی وەك ئەوە بوو لە بەرد هەڵکۆڵرابن. بەرێگادارۆیشتنی مرونەتێکی پیشان دەدا کە لە سەماکەیدا دەرکەوت. دوای ماوەیەکی کەم لە بەجێهێشتنی شەمس زیاتر بەرەو کزی و لاوازی چوو، لەبەر نیگەرانی زۆریشی بەشێکی زۆر لە هێز و کێشی خۆی لەدەست دا، چونکە نەیدەزانی دۆستی دێرینی بۆ کوێ چووە. بگرە ئیشتیای خواردنیشی نەمابوو، و چیتر حەزی لەو خواردنە خۆشانە نەبوو کە کیرای هاوسەری ئامادەی دەکردن بۆی: زەیتون لە هیندەوە، هەڵوژەی وشککراوی بەلخ، سێوی سوریا. دوای چەند مانگێك لە خۆ پشتگوێخستنی، سەرەنجام دەرکی بە جەستە ئازارچەشتووەکەی کرد کە سست و بێهێز بووبوو.

ئیوارەی هەموو پێنجشەممەیەك سەردانی کۆمەڵێك ئافرەتی دەکرد، کۆڕی بیستنی ساز دەکرد و لەبارێکدا بەئەڵقە گوڵ دەورە درابوو و لە ئاوی یاسەمیندا نوقم بوو، دەخولایەوە، تا بەرەبەیان لەگەڵ خاتوونانی قۆنیە کە مۆسیقایان دەژەنی و گۆرانیان دەوت، دەخولایەوە. بەتەنیشت هەر درەختێکدا تێبپەڕیایە سڵاوی لێدەکرد. هەندێ وتیان بینویانە درەختەکان لەوەڵامی سڵاوەکەیدا بۆی چەماونەتەوە، قسەی لەگەڵ ئەو سەگانە دەکرد کە لەدەوری ئەڵقەیان دەبەست، دەوەڕین و سەریان دەلەقاند. وا خۆیان پیشان دەدا کە لە بەرچاو رۆشنیی ئەو تێدەگەن. جارێکیان چوو بۆ سەردانی پەرستگایەکی کۆن کە وێران بووبوو پارچەیەکی بەشەکر شیرینکراوی دایە سەگێك کە پاشماوە و شتی پیسی دەخوارد. ئایا ئەقڵی لەدەست داوە؟ کاتێك پێڵاوەکانی لەقوڕدا چەقین دایکەندن و بەپێی پەتی رۆیشت. ئامادەبوو جلەکانی داکەنێ و عەبا و مێزەرە و کراس و پێڵاوەکەی بداتە سواڵکەرێك. بۆ سزادانی جەستەی ترێی رێوی (عنب الثعلب) دەمژی، ئەویش وەك جارێکیان پێی وتم، بە مورتوربەکردنی لیکە شیرینەکەی بەو مادە تاڵە تیژە بریندارکەرە. لە ناوبانگەکەی بێزار بوو کە بە زنجیری ئاسنی دەشوبهاند، لەبەرئەوەی هەموو غەریبان لافی ئەوە لێدەدەن دۆست و خۆشەویستی ئەون.

جارێکی تر باشترین قورئانخوێنانی خۆی بانگ کرد، کە حەمزەی پشتکووڕ (قەمبور) و شیرین تەبیات و ژەنیاری مەزنی نای بوو، تا لە کۆڕی بیستن و سەمادا یاوەری بێ. هەندێ مورید ئیددیعای ئەوەیان دەکرد

و دەياننوسی و شايەتييان دەدا كە لە يەكێك لە كۆڕەكانی مۆسيقا و بيستندا لەكاتێكدا كابرای پشتكووڕ گەيشتۆتە قۆناغی شاگەشكەبوون و بەسەر ئامێرەكەيدا چەماوەتەوە، مەولانا كە گۆرانی مەستی كردبوو، دەستی بەسەر كووڕييەكەی پشتی ژەنيارەكەدا هێنا، پاشان داوای لێكرد هەستێتەوە و بوەستێ، دەستبەجێ چاك بوويەوە و كووڕييەكەی نەما و بەقيت و قنجی گەڕايەوە ماڵەوە. ژنەكەی كە سەرەتا باش لە سيمای ورد نەبووبوويەوە رازی نەبوو دەرگای بۆ بكاتەوە.

هەرچی حەمزەی ژەنياری نايە من خۆم ،حسام، شتێكی نائاساييم لەبارەی ئەوەوە دی. رۆژێكيان پێيان راگەياندين ئەو ژەنيارە بەتوانايە لەپڕ مردوە، مەولانا دەستبەجێ رووی كردە ماڵەكەيان و منيش بەدوايدا چووم. مەولانا چووە ژووری نوستنەكە كە تەرمی مردوەكەی تێدا راكێشرابوو، بۆ ماوەيەكی زۆر لەوێ مايەوە. پاش ماوەيەك –خۆيشم بەتەنها نەبووم– گوێم لە دەنگی نای–يە جياوازەكەی حەمزە بوو. مەحاڵە ئەوە رۆمی بووبێ دەيژەند، چونكە ژەندنی نای پێويستی بە هەناسە و كارامەيی ژەنيارێكی پرۆفيشناڵە. كاتێ ژەنينەكە وەستا، گوێم لێبوو رۆمی دەيوت: "ئێستا، مرد".

ئەی كێ بوو نای دەژەنی؟ نەمتوانی يەكلای بكەمەوە.

هەندێ لە دڵسۆزان، هەمان ئەو كەسانەی حەزيان لە زۆربلێييە، قەناعەتيان بەگێڕانەوەكەی من نەهێنا و لەسەرتا سەری قۆنيەدا بڵاويان كردەوە كە رۆمی حەمزەی نای ژەنی بۆ ماوەی سێ رۆژ و شەو گێڕاوەتەوە بۆ ژيان و لەو ماوەيەدا لە نای ژەنين بۆ رۆمی نەوەستاوە.

جارێكيتر بينيمەوە وەك نەريتی خۆی بەشداريی ياريی منداڵانی دەكرد. مەولانا رۆژێكيان سوڵتان وەلەدی كوڕی بينی ميزاجی تێكچوە و خەمبارە. لێی پرسی بۆچی خەمباری؟ كاتێ هۆيەكی قايلكەری پێ نەگوت، مەولانا لە ژوورەكە چووە دەرەوە و خۆی لە تەوقی سەری تا نوكی پێی بەپێستی گورگ داپۆشی خۆی كرد بەژووری كوڕكەيدا و هاواری دەكرد " هوو هوو هوو"، كاتێ سوڵتان وەلەد گەورەی گەورەكانی بينی لاسايی گورگ دەكاتەوە دايە قاقای پێكەنين. منيش كە شەرەفی بينينی ئەم ديمەنە پێكەنيناويەم بەنسيب بوو، لە پێكەنيندا لەهۆش چووم. ئەگەر لەو كەسانە بوومايە كە چيرۆك لەبارەی رۆمی هەڵدەبەستن دەمگوت پێكەنينەكەم سێ رۆژ و سێ شەوی خاياندوە.

جارێكيتر بينيم بۆ ماوەيەكی زۆر پاڵی دابوو بە ديواری قوتابخانەكەوە و " الله الله! ! "ی دەوتەوە. ئەوانەی حەزيان لە ئەفسانەچنييە دەربارەی رۆمی، كە هەميشە هەمان كۆمەڵە كەسن، باسيان لەوە دەكرد گوايە رۆمييان ديوە دەمی كراوەتەوە بەبێ ئەوەی لێوەكانی بجوڵێن، هەروەها گوێيان لە پاڕانەوەكەی بووە لەناو سنگيەوە بەرز بووەتەوە.

هەركەس لە حاڵەتی رۆچوونی لە ئەويندا لەوكاتەی گوێی لە رەبابە دەگرت پێی ببڕيايە سەركۆنەی دەكرد. خۆم گوێم لێبوو سەركۆنەی پياوێكی كرد كە لەكاتی رەباب ژەنيندا هاتبووە ژوورەوە تا پێی بڵێ

کاتی نوێژی عەسرە، ئەویش دەیقیڕاند بەسەریدا و دەیگوت "ئەمەیش نوێژە. بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەت یەکێکیان داوای خزمەتکردنی بینراو دەکات، ئەویتریان بانگەواز بۆ نەبینراو دەکات".

لەسەر ئەو دیوارەی نووسی "قەدەغەیە لەو کەسەی خۆی لە خۆراکی رۆح مەحروم بکات"، لە کتێبەکانیشیدا هەندێ شتی تۆمار کردوە وەك "فرمێسکەکانی مەحبوب بەڵگەن لەسەر دڵخۆشیی حەبیب". هەروەها گۆرانی دەڵێ:

حەزت لەوە بێ حەزی لێتە،

بەدوای ئەوەدا بگەڕ بەدواتدا ئەگەڕێ.

جارێکیتر، رێك وەك پێش لەوەی شەمس ئۆغر بکات، بەڵێنی بەهەندێ لە موریدان دا ئێوارەیان لەگەڵ بەسەر ببات و داوای لێکردن بۆ پێشوازیکردنی ئامادە بن. سیراج تەتەری هاوڕێمیان لەناودا بوو کە دەکرێ لەڕێی دوو سمێڵە درێژەکەیەوە بناسرێتەوە. بۆ ئەو بۆنەیە باشترین جلەکانی لەبەر کردبوو: چاکەتێکی ئاوریشمینی سووك لەسەر شەرواڵێك لە ساتان و لە شوێنی خەوتنی قوتابخانەکە چاوەڕوانی کرد. کاتێ دواجار رۆمی دەرکەوت و پێی وت: "جلی خەوتنەکەت لەبەر بکە".

هاوڕێکەم دەستبەجێ داواکەی رۆمی جێبەجێ کرد و خوازیار بوو مورشیدەکەیشی ئەوە بکات. بەڵام رۆمی کە لە نوێژێکی بێکۆتادا نوقم بووبوو ئەوەی نەکرد کە ئەو کردی. هاوڕێکەم، بەدەم لوولدانی سمێڵیەوە، تکای کرد "ئەی سوڵتانەدین، ئایا بۆ ساتێك خۆت ئاسوودە ناکەی؟ هەڵهاتنی سپێدە نزیك بووەتەوە و منیش لە شەیداییمدا بۆ خوا ئەمرم".

رۆمی وەڵامی دایەوە "ئەی سەراج، ئەگەر بخەوین ئەی کێ ئاگای لە خەوتوان بێ؟".

سیراج بۆ وەڵام نەگەڕا، هەردوو لای سمێڵی، هێندە لوولی کردبوون، وەك دەزوویەکی رزیویان لێهاتبوو.

هەندێ هاوڕێیتر کۆمەڵێ چیرۆکی هاوشێوەیان بۆ گێڕامەوە. تێیاندا رۆمی بەڵێنی پێدابوون شەویان لەگەڵدا بەسەر ببات، بەڵام داخی گرانیان، هیچی نەکرد جگە لەوەی شەوەکەی بە رامان و نوێژ بەسەر برد. یەکێك نەبوون لە هاورێ بێئومێدەکان، سەڵاحی زێڕنگەریش بەهەمان شێوە، کە وا دیار بوو یەکێکە لەو کەسە کەمانەی دەتوانن بۆشایی نەبوونی شەمس پڕ بکەنەوە.

یەکێك لە هاورێ نزیکەکانم چۆن چۆنی مەولانای بەتەنیا لە ژووری دیدارەکاندا دیوە. مووریدە لاوەکە لەبەردەمیدا چەمایەوە و لەسەر زەوییەکە دانیشت. رۆمی پێی وت: "نزیك بەوە"، لاوەکە خۆی دا بەسەر باڵەکانیدا و کەمێك لە رۆمی نزیك کەوتەوە. رۆمی دووبارەی کردەوە و وتی: "زیاتر نزیك بەوە، زیاتر نزیك بەوە". کاتێ زۆر لێی نزیك کەوتەوە، رۆمی پێی وت: "دابنیشە بەشێوەیەك ئەژنۆت بەر ئەژنۆم بکەوێ". هاورێکەم بەگوێی کرد، پێی وتم: "کاتێ بەریکەوتم، لاشەم موچرکەی پێدا هات".

لەو کاتەدا، مەولانا دەستی کرد بەباسکردنی شەمسی تەورێزی تا موریدەکە کە لە قووڵایی وشەکانیدا نوقم بووبوو، لەهۆش خۆی چوو. گوێی لە مەولانا بوو بەسەرزەنشتەوە پێی دەوت:

**لەم بازاڕی عەتارانەدا بەسستی وێڵ مەبە**

**لای ئەو کەسە دابنیشە شەکری لەلایە.**

ئەو هاوڕێیە عەزمی جەزم کرد لە ماڵی مەولانا بژی و شەو و ڕۆژ خۆی لەو شەکرە بئاخنێ کە لەوێ بینی.

جارێکیتر ڕۆمی گاڵتەی بەو کەسانە دەکرد کە حەزیان لە ئەنجامدانی وەرزشی دەروونە، ئەوانەی دەقیان بە ژیانی خۆشگوزەرانیەوە گرتوە و نەیانتوانیوە درێژە بەو گژبەرییە بدەن کە بۆ خۆیانیان داناوە. ئەوە حاڵی بەرپرسێکی گەورە بوو کە ویستی لە قوتابخانەکەی مەولانادا خەڵوەت بکێشێ. ڕۆمیش ڕازی بوو، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك برسێتی بەسەر ئەو زاهیدەدا زاڵ بوو، چیتر نەیتوانی بەرگەی بارودۆخی سەختی خەڵوەت بگرێ، لە تاریکیی شەودا ڕایکرد و چوو بۆ ماڵی هاوڕێکەی و سکی بەخواردنی مراویەك کە بەڕۆن و برنج و بەهاراتێکی زۆرەوە لێنرابوو، ئاخنی. کاتێ تێر بوو، پسکە پسك دزەی کردەوە ناو حوجرەکەی.

ڕۆژی دوای ئەوە، وەك دابی خۆی لەوکاتەوە هەواڵێکی لە شەمسەوە پێگەیشتبوو، ڕۆمی هات بۆ لای دەرگای ژوورەکە و پەنجەکانی لەسەر دانا و بۆنی کرد، ئەنجا وتی: "ئای چ شتێکی سەیرە. ئەم ژوورە بۆنی مراوی و برنجی لێدێ و بۆنی زوهد و سەرکوتکردنی شەهوەتی لێ نایەت"، پیاوە بێچارەکە لەبەردەم پێکانی مەولانادا خۆی دا بەزەویدا و وتی: "وەحی و ئیلهامی زۆرت بۆ دێ!، بەڵام بۆ دەبێ لە ژوورێکدا کەنارگیر بم کەس قسەم لەگەڵ نەکات؟".

هەوڵم نەدا بزانم چۆن گەورەم بۆنی ئەو مراوی و برنجەی کرد کە ئەو پیاوە شەوی ڕابردوو لە ماڵێکیدی خواردبوونی. گوێم بەوە نەدا. خەیاڵم هەر لەسەر چاودێریکردنی هەڵسوکەوت و دەربڕینەکانی پیاوێك بوو کە خۆشەویستی، لە مامۆستایەکی گەورەوە کە هەندێ جار پێویستی بە ئیلهام بوو، گۆڕی بۆ شاعیرێکی بێهاوتا. من چاودێریی ئەو کائینەم دەکرد کە لەپڕ گۆڕان و جوڵە و عیشقی خوایی و شادومانی و جۆش و خرۆش و هەناسەی بەرجەستە کرد و گوێم بۆ شل دەکرد.. چاودێریی جوانترین قەسیدەم دەکرد کە بەبەرچاومەوە زیندوو لە زاریەوە دەردەچوون.

دوای ئەوەی خەڵوەتەکەی تەواو کرد، ڕازی بوو بە ئەنجامدانی کۆڕی مۆسیقا و بیستن، هەروەها هاوەڵیکردنی کەسانی ئاسایی لە هاوەڵیکردنی ئەهلی عیرفان بەباشتر دەزانی. قەت توورەبوونی ڕۆمیم لە پیاوێك کە گاڵتەی بە هاوەڵەکانی کرد، لەیاد ناچێ.

"شوێنکەوتوانی دڵسۆزی رۆمی کەسانی نامۆن. زۆربەیان کەسانی ئاسایی و پیشەوەر و خزمەتکارن. وای لێهاتووە بەدەگمەن خەڵکانی خوێندەواری لەدەور ببینی. ئەو کەسانی درومان و چنیار یان بەقاڵ قبوڵ دەکات و بەدڵسۆزتریان دادەنێ". کاتێ مەولانا ئەم سووکایەتیەی بیست هاواری کرد بەسەریدا "ئەی برای سۆزانی! (یانی خوشك سۆزانی). ئەی مەگەر حەلاف لۆکەی شی نەدەکردەوە؟ ئەبوبەکری بوخاری درومان نەبوو؟ ئایا پیشەکانیان توانای تێگەیشتن و دەرککردنیانی کەم کردەوە؟". ئەو پیاوە کە پاش فڕینی باڵندەکە بەکەمی قسەی دەکرد، گەڕایەوە بۆ زمانپاراوییەکەی جارانی. وەك رابردوو، هاوشێوەی هاونیشتمانیەکانی لە خەڵکی خوراسان کەوتەوە بەکارهێنانی ئەو جوێنەی دەمێك بوو بەکاری دەهێنا: "برای سۆزانی".

لەکاتێکدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی شەمس، سپێدەی شەمسەکەی خۆی، دەکرد، کە دڵنیا بوو دەگەڕێتەوە، بە داوایەکی گەورەترین پیاوماقوڵانی بۆ سازکردنی کۆڕێکی مۆسیقا و بیستن لە ماڵەکەیدا، رازی بوو. ئەویش موعین سلێمان، بەڕێوەبەری قوتابخانەی بەناوبانگی قورئان بوو، کە خەریك بوو ببێتە یەکێك لە گرنگترین کەسایەتیەکان لە قۆنیە، پاشان خۆی کردە پیاوی مەغۆل. لەنێو سەرجەم موریدەکانی پێشوویدا موعین سلێمان یەکێك بوو لەو کەسانەی بۆ یەکەم جار لە گۆڕانەکەی مەولانا تێگەیشت. هەر هێندەی زانی —دوای ئەوە هەردوو پیاوە بۆ ماوەی چل رۆژ خەڵوەتیان کێشا— وانەکان دەوەستن، هەروەها تێگەیشت لە شوێنێکیتر و بەشێوەیتر بەردەوام دەبن، سەمای قبوڵ کرد کە تێیدا مرۆڤ دەگاتە قۆناغی عیشقی سۆفی وەك هەنگاوی یەکەم لەم رێچکە نوێیەدا. رۆژێکیان هەندێ کەس بینییان دەخولێتەوە و لاسایی خولانەوەی بێکۆتا دەکات کە بەرهەمی یەکگرتنی نێوان رۆمی و شەمس بوو. هاوئاهەنگی نێوان جلەکانی و مێزەرەکەی سەرنجی منی رادەکێشا، هەر جارێ بمبینیایە. رەنگەکانی جلوبەرگەکەی هەستکردنێکی راستەقینە بەجوانییان حەشار دابوو، چونکە رەنگی سەرجەم جلەکانی و کەلوپەلی ماڵەکەی رەش و سپی و قاوەیی بوو. تەنانەت دەم و چاویشی رەنگدانەوەی ئەو رەنگانە بوو، چونکە ریشی رەش و پێستی زۆر سپی بوو، بەڵام زۆر دووبارەکردنەوەی جوڵەیەك لەوانیتری جیا دەکردەوە. زۆربەی جار جومگەی یەکەمی پەنجەی شایەتومانی دەخستە دەمی، بەزمانی تەڕی دەکرد، پاشان بەرزی دەکردەوە بۆ لووتی و بۆنی دەکرد، یان بەو شێوە دیار بوو.

لەیەکێك لەو شەوە درێژانەی زستاندا پێش گەڕانەوەی شەمس موعین سلێمان رۆمی خوڵك کرد بۆ ماڵەکەی. وەك باو بوو هەر سەردانیکەرێك وەك دیاری کۆمەڵێ دیاری لەشێوەی مۆمدا لەبەر دەمیدا دادەنا کە کێشیان لە سێ رەتڵ زیاتر بوو. وەك باو بوو مەولانا دواین کەس بوو بێتە ژوورەوە، ئەوەی بە بەڵگەیەك لەسەر رێزگرتن دەبینی، چونکە دوای ئەوەی رۆمی دێتە ژوورەوە رێگە بەکەسانی کەم بایەختر نادرێ بێنە ژوورەوە.

مەولانا هاتە ژوورەوە و مۆمێکی بەدەستەوە بوو، لەسەر زەوی دانیشت. وەك هەمیشە، مۆمەکەی لەبەردەمیدا لەسەر کاشییە رەش و سپییە شەش لاکە دانا. پیاماقوڵانی شار، وەزیر و قازی و موفتییان و سەرجەم ئامادەبوان بەسەرسوڕمانەوە تەماشای یەکتریان کرد و دەیانپرسی: دەبێ ئێستا مەولانا چی بکات؟ دەبێ شێت بووبێ. کاتێ هەستی بەگومانەکانیان کرد، رۆمی وتی: "نەفەسی سەرجەم ئەو چرایانە لەم مۆمە کزەی منەوە دەردەچێ".

کاتێ ئەم وشانەی وت، هەندێ لە پیاوەکان سەریان خوار کردەوە بۆ پیشاندانی گومانەکانیان. مەولانا فووی کردە گڕی مۆمە بچوکەکە و کوژایەوە... لەهەمان ساتدا سەرجەم چراکانیش لەگەڵیدا کوژانەوە. لە تاریکایی ئەنگوستەچاودا مینگەمینگی ئامادەبوان بەرزبوویەوە کە ئاماژە بوو بۆ سەر سوڕمان. بیسترا موعین سولێمان جومگەی یەکەمی پەنجەی شایەتومانی بەزمانی تەڕ دەکات. ئایا ئەمە بەڵگە بوو لەسەر تێنەگەیشتنی؟

هەرگیز نەمتوانی ئەم شتە سەیرە لێکبدەمەوە. بەڵام حیکایەتگێڕەوەکان وەك باوە ترش و خوێیان بە چیرۆکەکەدا کرد و رازاندیانەوە و هێندەیتر نامۆ و موعجیزەئامێزیان کرد. باسیان لەوە کردوە گوایە رۆمی پاش ئەوەی سەرجەم مۆمەکانی کوژاندۆتەوە، هەناسەیەکی هەڵکێشاوە مۆمەکان جارێکیتر داگیرساونەتەوە، پاشان چراکان یەك بەدوای یەك کوژاونەتەوە. بەڵام مۆمە بچوکەکەی مەولانا بەتەنها لە ماڵە رەش و سپیەکەی موعین سلێماندا بەداگیرساوی مایەوە.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی گەڕانەوەی شەمس، رۆمی جارێکیتر مەیلی بۆ گاڵتەوگەپ گەڕایەوە، رۆژێکیان کەسێك هات بۆ لای و باسی لە کەراماتی وەلیەك دەکرد. پێی وت: گەورەم ئەو پیاوە خواناسە دەتوانێ ئاوی پاك بگۆڕی بۆ خوێن. ئەتوانم شایەتی لەسەر ئەوە بدەم. خۆم لەوێ بووم ئەو کارەی کرد. تۆ رات چییە؟"

گوێم لە رۆمی بوو وەڵامی دایەوە: "ئەوە گۆڕین نیە بەڵکو پاشماوەیە".

گەڕایەوە سەر رۆحی گاڵتەکردنی بە نەیارەکانی، کە پاش دیارنەمانی شەمس نەمابوو. رۆژێکیان کاتێ بەبەردەم کوشکی شێخێکی بەناوبانگدا تێدەپەڕی کە ناوی ناسر بوو، گوێی لێ بوو باسی ئەوی دەکرد و لەبەردەم قوتابیەکانیدا ناوبانگی لەکەدار دەکرد. دەیوت: "تەماشای رووی گەورەکەیان، مەولانا، بکەن، بڕوانن چەند تاریکە! تەماشای ئەو رێگەیە بکەن شوێنی دەکەوێ چەند تەسکە. نازانم رووی چۆن دەردەکەوێ یان تەریقەتەکەی چییە، یان ئەو جلەی لەبەری دەکات چۆنە. نووری تێدا نابینم، هیچ نابینم".

لەوکاتەدا گوێم لێ بوو مەولانا لەدوورەوە بەدەنگی بەرز هاواری بەسەردا کرد و وتی "ئەی تۆ، تۆ ئەی نێرباز، چۆن هەڵدەبژێری؟".

نه ناسر و نه قوتابیەکانی نەیانوێرا وەڵامی ئەو توندیەی مەولانا بدەنەوە. ئێمە و هەموو ئەوانەی لەگەڵمان بوون بەشوێن رۆمیدا درێژەمان بە رێگەکەمان دا، کە کەوتە باسکردنی هەندێ مەسەلەیتر. سەرەنجامی ناسری عارف و شێخ و زانای گەورە ئەوە بوو لە خراپترین گەڕەك لە گەڕەکەکانی قۆنیەدا بژی و بەدوای هەر گەنجێکی بەدکاردا بگەڕێ کە بە کرێیەك ئارەزووەکانی تێر بکات، دەڵێن تووشی نەخۆشیەکی زایەندی بووە کە تووشی پیران دەبێ، هاوڕێکانم دەڵێن گوایە تا مەولانا لەو رۆژەدا جوێنی پێنەدا، شازییە سێکسییە سەلبیەکەی لێ دەرنەکەوت.

جارێکیتر رۆمی گەڕایەوە بۆ ئامادەکردنی چارە بۆ خەواڵوو و تەوەزەلەکان. هەندێکیان لە خەوتنی دوور و درێژ چاك بوونەوە، بەڵام هێشتا هەندێکیان بەدەست خەوزڕانەوە دەیانناڵاند، سەردانی مەولانایان دەکرد تا دەست بەسەریاندا بێنێ. دوای ئەوەی چاك دەبوونەوە، سەبارەت بەو کەسەی چارەسەری دەکردن دەیانوت ئەو بوو نەهامەتیەکەیانی گۆڕی بۆ خۆشی، لە نەخۆشیەوە بۆ لەشساغی و لە نەزانیەوە بۆ تێگەیشتن گواستنیەوە و لە دوژمنەوە گۆڕینی بۆ برا.

مەولانا رقی لەو بازرگانانە بوو کە شوێن نەریتێك کەوتن پاش ئەوەی مەترسیی مەغۆل زیادی کرد بڵاو بووەوە، ئەویش بەوەی هاتن سامانەکانیان دابەش کرد و چاویان بڕییە ئەوەی ببنە سۆفی. لەوێ بووم کاتێ رۆمی بۆ هەڵاتن لە بیستنی تکا و پاڕانەوەی ئەو بازرگانانە، مەسینەیەکی هەڵگرت و چوو بۆ ئاودەست و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە. لەبەرئەوەی من حیکایەتخوان نیم ناڵێم سێ رۆژ و شەو لەوێ مایەوە، بەڵکو ماوەیەکی هەندێ زۆر لەوێ مایەوە.

بازرگانەکان بێزار بوون و پرسیاریان لە سیراج تەتەریی هاوڕێم –کە شەوێکی تەواوی لەگەڵ رۆمی بەسەر برد و هێندە سمێڵیدا لوول دابوو وەك قەیتانی پێڵاوی لێ کردبوو– کرد تا لای مەولانا تکایان بۆ بکات. سیراج کە لە مەولانا نزیك کەوتەوە پێش ئەوەی دەمی بکاتەوە و قسەی لەگەڵدا بکات، رۆمی کە لەنزیك ئاودەستەکە وەستابوو شتێکی وت و داوای لێکرد بیگەیەنێ بە بازرگانەکان، "من لەکوێ و جیهان لەکوێ؟ بەلای لوتی منەوە، بۆنی پیسایی باشترە لە بۆنی ئەو شتانەی لەم جیهانە و دانیشتوانی ئەم جیهانەوە بەرز دەبێتەوە".

جارێکیتر رۆمی بە هەڵسوکەوتی سەیری تووشی حەپەسانی کردین. ئێمەیش یەکبین پرسیارمان لێدەکرد تا هۆکەی بزانین. بۆ نموونە تەمومژاویترین کەسەکانی خۆشدەویست، کەسێك کە بە وەحشیەت و ئەنجامدانی کاری دزێو بەناوبانگە، بەڵام رۆمی خۆشیدەویست و رێزێکی گەورەی بۆ دەردەبڕی. رۆژێکیان زریانوسی هاوڕێم، تاوانباری پێشوو کە مەولانا رزگاری کرد، زۆر بێزار بوو. مەولانا بە رێزنانی لەو تاوانبارە هەموومانی حەپەساند. ئاشکرایە ئەو یۆنانییە تاکە کەس نەبوو کە ئەم هەڵوێستەی مەولانای بەلاوە جێی پرسیار بوو، کە روونیکردەوە، یەکێك لە قوربانیەکانی دەستی ئەو تاوانبارە پیاوێکی لەخواترس بوو

تامەزرۆی ئەوە بوو رۆحی رزگاری ببێ و قەفەسی جەستەی بەجێ بێڵێ. ئەو تاوانبارە بەکوشتنی، خەونی ئەو زانایەی بەدیهێنا، کە یەکێك بوو لەوانەی خوا هەڵیبژارد.

جارێکیتر، بردینی بۆ سەرسورهێنترین و دژیەیەکترین شوێن. رۆژێکیان چووینە خانێك سۆزانیەکی جوانی تێدا دەمایەوە، کە بە ژمارەیەك کچۆڵەی جوانی وەك خۆی دەورە درابوو. هەر هێندەی رۆمی لەبەردەمیدا بینی، خۆی لەبەر پێکانیدا بەزەویدا دا و لەخۆبوردوویەکی زۆری پیشان دا. پاشان مەولانا بەدەنگێکی بەرز کە هەموو ئەوانەی لەوێ بوون گوێیان لێی بێ، ئەو ژنەی بە رابیعەی عەدەوی و سۆزانیەکانی بە ژنە پاڵەوانە ئەفسانەییەکان بەراورد کرد. پیاوێکی ناودار کە لەوێ بوو لەسەر ئەو موجامەلەکردنەی لە قسەکردن سەبارەت بەو کائیناتە ناخاوێنانە سەرکۆنەی کرد. رۆمیش ئاماژەی بەو ژنە سوژدەبردووەی بەردەمی دا و وەڵامی دایەوە "ئەو، ئەو لەژێر یەك رەنگدا دەرِوات، ئەو خۆی چۆنە هەروایش دەردەکەوێ بەبێ هیچ فێڵ و چاوبەستێك، بەڵام تۆ، ئەگەر لافی ئەوە لێدەدەیت پیاوێکی راستەقینەیت، وەك ئەو بکە، واز لە دوو رەنگی بێنە، تا دەرەوەت وەك ناوەوەت بێ".

پیاوە ناودارەکە هیچ وەڵامێکی نەبوو. هەرچی سۆزانیەکە بوو رۆژی دواتر بینیم چاوەڕوان دەکات —لە بەیانیەوە چاوەڕوانی دەکرد— تا دەرگای ژووری مەولانای بۆ واڵا بکرێ تا ژنێکی باوەڕداری تۆبەکار بچێتە ژوورەوە، چونکە شەوی رابردوو وازی لە پیشەکەی هێنا و ماڵەکەی بەجێهێشت دز و جەردە تاڵانی بکەن و ئەو کچانەی ئازاد کرد کە کاریان لەگەڵ دەکرد. ئێستا ئیتر بووەتە موریدێکی دڵسۆز لە موریدەکانی مەولانا بەشێوەیەك رێنماییەکانی ئاوێتەی ناخی بووبوون و غیرەی لای خاتوونە شازادەکان دروست کردبوو کە لافی ئەوەیان لێدەدا دڵسۆزترین ژنە موریدەکانی مەولانان.

جارێکیتر لە دیمەشق و لە مەککەی موکەڕەمە و لە چل شوێنی جیاواز لەبەردەم موریدەکانیدا دەرکەوت لەکاتێکدا ئەو لە ماڵەکەی خۆی لە قۆنیە نەترازابوو، کاتێکیش ئەوانەی وا خەیاڵیان کردبوو بینیویانە، لێیان دەپرسی، وەڵامی دەدایەوە "من وەك ماسیەکم لە ئۆقیانووسدا، هەرکات بمەوێ سەرم بەرز دەکەمەوە".

جارێکیتر، هەندێ مەسەلەی شەرعی یەکلا کردەوە هیچ فیقهزانێك نەیتوانیبوو چارەیان بکات. لەوانە بۆ نموونە خاوەن باخێك داوای لە دزێك کە بۆ دزینی بەروبومەکەی چووبووە سەر یەکێك لە درەختەکانی، کردبوو داببەزێ، بەڵام دزەکە رازی نەبووبوو دابەزێ و سوێندی خواردبوو "ئەگەر لەم دارە بێمە خوارەوە تەڵام کەوتبێ".

سێ رۆژ تێپەڕی —سێ رۆژ و سێ شەویتریش— دزەکە رازی نەبوو سوێندەکەی بخات. برسێتی، تینوێتی، بایەخدانی فزولیەکان و ئاژەڵە کێوییەکان لە شەودا هیچیان نەیانتوانی راکەی پێ بگۆڕن. کاتێ پرس بە مەولانا کرا کە رووەکی ترێی رێوی دەمژی، وتی: "با بگوێزێتەوە بۆ سەر درەختێکیتر ئەوکاتە

دەتوانێ دابەزێ، ئەگەر ئەو درەختەیش درەختی لەتەنیشت نەبوو، دایبەزێننە سەر پشتی ئەسپێك و لەوێوە بۆ سەر زەوی".

چۆنی وت وا کرا و پیاوەکە رازی بوو.

جارێکیتر رۆمی سوعبەتی لەگەڵ کیرای ژنی کرد. کیرا دەیویست بزانێ سروشتی خەڵکی بەهەشت چۆنە. رۆمی پێی وت: "گەمژەن، ئەگەر وانەبوونایە بەبەهەشت و جۆگەلەکانی رازی نەدەبوون"، پاشان قەسیدەیەکی نووسی، کە کیرا دای بە خۆم:

**ئەگەر بمتوانیایە لە دۆزەخدا پرچت بگرم،**

**ئەوا شەرمم لە خەڵکی بەهەشت ئەکرد.**

**ئەگەر بەبێ تۆ بانگ بکرێم بۆ مێرگوزاری بەهەشت،**

**ئەوا مێرگوزار لە دڵمدا ئەبێتە تەنگەبەر.**

جارێکیتر، ئامۆژگاری دەکردین کە پێویستە لە ناو ناخی خۆماندا بۆ جیهان و بۆ خوا بگەڕێین. دەروێشێك کە خوازیار بوو ئەم جیهانە بەجێ بێڵێ و بچێ بۆ جیهانەکەی ئەودیو، پرسیاری لێکرد ئایا دەبێ بۆ کوێ بچێ تا بەخوا بگات، رۆمی وەڵامی دایەوە "چۆن ئەزانی خوا لێرە نیە؟".

**هەمووی ئەوەی لە گەردووندایە لە دەرەوەی تۆ نیە.**

**لەناختدا بۆ ئەوە بگەڕێ کە ئەتەوێ، لەبەر ئەوەی ئەوە تۆی.**

جارێکیتر کەوتە ئامادەکردنی کۆڕی رۆحی، کە هەموو کەسێك تێیدا گوزارشت لە هزر و تیۆرەکانی دەکات. پرسیاری لە یەکێك لە شوێنکەوتە دڵسۆزەکانی کرد کە زۆر لێی نزیك کەوتبووەوە (لەو کاتەوەی شەمس رۆیشتبوو چیدی دەستی بەرووی هەندێ لە موریدانەوە نەدەنا) بۆچی ئەم موریدە لەم کۆڕەدا گوزارشتی لەوە نەکرد کە لە مێشکیدا دەسوڕایەوە، هاوڕێکە وەڵامی دایەوە "سەرجەم پیاوانی مەزن ئامادەن"، رۆمی جەختی کرد بۆی "هەمووی ئەوەی لەسەرت بوو بیکەی ئەوە بوو دەمت بکەیتەوە. قسەکەر من ئەبم".

لە بۆنەیەکی تردا رۆمی بەهاوڕێیەکی وت کە لە دیداری موعین سلێمان بەڕێوەبەری پێشووی قوتابخانەی قورئان کە بوو زاری شەترەنجی دنیای مەغۆل سڵی دەکردەوە، چونکە ئەو هاوڕێیە دەترسا نەزانیی خۆی بەسۆفیگەری دەربخات، ئەگەر رووبەڕوو پێی بگات کە ئەویش ئەو هاوڕێ لەخۆبوردە و لاوازەیە، دەمی کردەوە. پێی وشە ئەو وشانەی دەریاندەبڕێ وشەی ئەو دەبن، وشەی رۆمی. پێیان وتم دیدارەکە لە شاری قەیسەریە رووی داوە و ئەو هاوڕێیە پاش ئەوەی مەولانا هانی داوە زۆر راستی مەعریفی ئاشکرا کردووە. ئەو بەرپرسەی جگە لە رەنگی قاوەیی یان رەش یاخود سپی، هیچ رەنگێکیتری لەبەر

نەدەکرد، بێدەنگ وەستا. پەنجەی شایەتومانە تەڕەکەی بۆ لوتی بەرز کردەوە. پێم وابێ بەڵێنەکەی مەولانا بەئاشکراکردنی هەندێ مەعریفەی پەنهان لەڕێی هاوڕێکەمانەوە، لەنێو شەپۆلی گومان و بێئومێدی و ریسوایی نارۆشندا نوقمی کرد.

جارێکیتر لەگەڵ پشیلەکەی قسەی کرد کە لەسەر هەردوو لاقەکانی پشتەوەی وەستابوو خۆی بۆ یاریکردنەکەی لەگەڵی شل کرد. کاتێ مەولانا هەناسەی تامەزرۆیی هەڵکێشا پشیلەکە بەدەنگێکی خەمگین لاسایی کردەوە.

جارێکیتر گەڕایەوە بۆ جوینی سیری کاڵ لە هەموو ژەمێکی خواردندا. دوای ئەوەی سەمای کرد و ئارەقێکی زۆری کرد، سەرمای بوو، خوێنبەردانی بەکار هێنا و حەمامێکی گەرمی کرد. جا کەوتنە دووبارە وتنەوەی ئەوەی سەرما چارەسەرە بۆ وەهم.

جارێکیتر لە حەمام بوو بانگی سەرتاشەکەی کرد داوای لێکرد ریش و سمێڵی کورت و رێك بکات بەئەندازەیەك مرۆڤ بتوانێ جیاوازی لە نێوان پیاو و ئافرەتدا بکات. هەروەها وتی وا باشە مرۆڤ ریشێکی درێژ بەرداتەوە، بەڵام لەکاتێکدا پێویستە چاوەڕوان بین تا سۆفی لەبایەخدان بەڕیشی و چەندین جار شانەکردنی دەبێتەوە، پیاوی بەئیلهام کاتی پێویستی دەبێ بۆ گەیشتن بەخوا، جا چ ریشی هەبێ یان نا.

جارێکیتر بایەخدانی خۆی بۆ ئێمە، شوێنکەوتە و موریدەکانی تەرخان کرد، رۆژێکیان کاتێ سەرجەم هاوەڵانی لە ماڵ کۆ بووبوونەوە پێی وتین: "بزانن تەنیا یەك کەس لە جیهاندا هەیە، ئەو کەسەیش لەگەڵتاندایە، لەپێناو ئێوەدا هەیە، کار بۆ بەرژەوەندیی ئێوە ئەکات و حەزی لێتانە". ئەنجا بەشیعر وتی:

بەپاڵنەری بەزەیی لە بەندینخانەی جیهاندا مامەوە

من لەکوێ ئەم بەندینخانەیە لەکوێ؟

کە دزیم؟

جارێکیتر رێزی لە کیرای هاوسەری نا (چووە لای)، کە لەو کاتەوە شەمس چووبوو بەجێی هێشتبوو، هەموو کاتی خۆی لە نوێژ و رۆژوو و خواپەرستیدا بەسەر دەبرد. هێندە دەچووە لای، کیرا وای لێهاتبوو لە نەوسنیی مێردەکەی هەڵدەهات کە جارێکیتر بەخەبەر هاتبوو. بەوەی بەزۆری پەنای دەبردە بەر پەنجەرەکە. لە یەکێك لە هاوڕێکانی کیراوە زانیم بەر لە راگەیاندنی گەڕانەوەی شەمس، واتە لە ماوەی گومان و نارۆشنیەکەدا، بەردەوام سکاڵای لەوە دەکرد رۆمی پشتگوێی خستوە و ئەو حەزەی جاران ئەمی دەوروژاند نەیماوە. کاتێ گۆڕانەکە بەسەر مەولانادا هات ئیتر واباسی دەکرد وەك ئەوەی شێرێکی سەرخۆشی تووڕە لە شەوێکدا حەفتا جار لەگەڵی سەرجێیی کردبێ.

لەوانەیە حیکایەتخوانان بیانوتایە ئەوە لە ماوەی سێ رۆژ و سێ شەودا، بەڵام ئەو وتی: "لە یەك شەودا، کێ باوەڕ بەوە دەکات؟".

جارێکیتر، دەستی کرد بەوەی بایەخێکی بە بەڕێوەبردنی قوتابخانە وماڵەکە دەدا و کەوتە پشکنینی ژوورەکان، نەخاسمە ژوورەکەی شەمس، تا دڵنیا بێ لە بوونی هەرچی پێویستە و گۆڕینی ئەوەی پێویستە بگۆڕێ. لە ماوەی یەکێك لەو گەشتانەیدا، بەو دارتاشەی وت کە ژوورەکەی شەمسی چاك دەکرد و بزمارێکی پێدا دادەکوتا: "ماڵەکەمان شوێنی ئەولیایە، ئەمەیش ژووری شەمسە. ئەو بزمارەی چەقاندت بەم دەرگایەدا، دڵم کون ئەکات". لەسەر ئامۆژگاریی مەولانا، نەجارەکە کشایەوە کە نەیویست ئەو شوێنە پیرۆزە پیس بکات.

شەمس دەگەڕێتەوە.

ڕۆژێکیان لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ٦٤٥ کۆچی (ئایاری ١٢٤٧)، دوای پازدە مانگ لە فڕینی باڵندەکە و دوای مانگێك لە دەرچوونی سوڵتان وەلەد بۆ گەڕان بەشوێنیدا، نامەیەکمان لە کوڕە راساڵەکەوە پێگەیشت، تێیدا هەواڵی گەیشتنی کاروانەکەی داینێ، کە شەمس میوانە شەرەفە تێیدا.

"بەبێ ترس بیابانەکانم بڕی. چیاکان هەر لەوە دەچوون چەند گردێك بن لە پوش و پەڵاش. متکەکان[٣] بەدرێژایی رێگەکە وەك ئاوریشم بوون، گەرمی و ساردی وەك شەکر و خورما بوون. لە دیمەشق چاوم بە شا شەمس کەوت لە یەکێك لە خانەکاندا کە لەگەڵ گەنجێکی وڵاتی فەرەنجە تاوڵەی دەکرد. لە دەرەوەی دەرگاکەوە وەستام و لەدوورەوە چاودێریی ئەو لوغزەی خوام دەکرد، کە لەناو پیاواندا دانیشتبوو، ئەو دیدارەی دوادەخست کە دەمێك بوو خەونمان پێوە دەبینی. شا شەمس بەردەوام دەیبردەوە و داوای پارەی لە هاوگەمە لاوەکەی دەکرد، ئەویش پارەکەی دەدا بەڵام وادیار بوو تادەهات بێزاری زیادی دەکرد. کاتێ بۆ دواجار زارەکەی فڕێدا و دۆڕاندی، هەستایەوە و زللەیەکی دا لە دوو رکابەرەکەی و زللەی دا لە شەمسەکەمان. من و بیست هاوڕێکەم خوازیار بووین دەستبەجێ بچینە ژوورەوە و لەو غەریبە دڵڕەقە بدەین کە جەسارەتی بەخەرجدا و دەستی لە شەمس بەرز کردەوە. دەنگی پاشاکەمان رایگرتین و رێگەی لەو کەسانە گرت کە دەوری ئەو یاریزانەیان دابوو و دەیانویست لێی بدەن و پێی وتن: "ئەم منداڵە قوتبە، بەڵام باش لە خۆی تێناگات، لێی دوور بکەونەوە". ئەوانیش شەمس و گەنجەکەیان لەبەردەم مێزە هەڵگەڕاوەکەی یاریەکەدا بەجێهێشت: غەریبەکە کەوتە کۆکردنەوەی بەردەکانی یاریەکە و شەمسیش چەمایەوە نەعلەکەی لەپێ بکات. چوومە ژوورەوە و بیست هاوڕێکەیشم بەدووامدا هاتن. لەبەردەم شەمسدا پێکەوە چەماینەوە. سەرجەم ئامادەبووان، بەتایبەت لاوە غەریبەکە، تووشی حەپەسان بوون کاتێ ئەو رێزگرتنەیان لە دەرویشێکی پیری لاواز بینی، کە مێزەرێکی بەسەرەوەیە و عەبایەکی لە قوماشی هەرزانبایی بەسەرشانەوەیە، زۆربڵێ نیە، کاتێکیش قسەی دەکرد، قسەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد.

---

[٣] متك: بە درەختی نزم و بچوك دەوترێ.

"شەمس لێم نزیك كەوتەوە، ماچی كردم و بەگەرمی بەخۆیەوە گوشیم و لەبارەی هەواڵی باوكم پرسیاری لێكردم، ڕێز و پاڕانەوەی مەولانام پێگەیاند پاشان لەباتی ڕۆمی پێڵاوەكەیم گرت و كیسێكی پڕ لە ئاڵتونم تێخست، هەروەها وتم كە سەرجەم موریدەكان دەستی ماچ دەكەن و خەمباری خۆیان پشان دەدەن بۆ ئەوەی لە رابردوو لێیانەوە رووی داوە. بەڵێنیان دا واز لە حەسوودی بێنن و دۆستایەتی قبوڵ بكەن. شەمس تەماشای پێڵاوە پڕ لە درهەمەكەی كرد و پێی وتم "بۆچی باوكت ئەیەوێ بە ئاڵتون رامبكێشێ، من تەنها ویستی ئەوم بەسە". رازی بوو لەگەڵمان بێ. لاوە ئیفرنجییەكە بەحەپەساوی سەری دەرهێنا، پارەكانی فڕێ دا و لە شەمس پاڕایەوە وەكو شوێنكەوتەی خۆی قبوڵی بكات. شەمس وەڵامی دایەوە "بگەڕێوە بۆ وڵاتەكەی خۆت بەسەردانەكەت ڕێز لە هاوڕێكانت بنێ، ببە بەقوتب (گەورە)یان و لە نزاكانتدا لەبیرمان مەكە".

گەنجە غەریبە چاو شینە پرچ زەردەكە سوژدەی برد و لە شوێنی خۆیدا وەستا، تا شوێنەكەمان بەجێهێشت. كاتێ خانەكەمان بەجێهێشت ئەسپەكەم پێشكەشی شەمس كرد و لەخۆبوردوانە بڕیارم دا بەپێ بگەڕێمەوە، لەتەنیشت ئاوزەنگەكەیەوە دەچووم. شەقامە چەوڕێژكراوەكانی شارەكەمان بڕی، بە بازاڕە گەورەكەدا تێپەڕین و كەمێك وەستاین بۆ كڕینی ئاوریشم بۆ ژنەكانمان. لە بازاڕ دەتتوانی گوێت لە هەموو زمانەكان بێ. گوێم لە ئەرمەنی و عەرەبی و فارسی و توركی و یۆنانی و هیندی بوو، هەروەها چەند زمانێكتری نەناسراو هەبوون، لەوانە زمانی ئایبیرییەكان و زمانی ئیفرەنج، ئەمە جگە لە زمانی ساكسۆنیەكان. لە ڕێگەماندا بەرەو دەروازەی دیمەشق. دیواری رووپۆشكراو بە مەڕمەڕی ڕەنگاوڕەنگم دی، هەروەها بێستانی درەختی فستق، كە ژمارەیەكی زۆر نافورە و زۆنگاوی تێدا بوو. چەندین بیابان و روبار و دۆڵمان بەدرێژایی مانگێكی تەواو بڕی. دەمانزانی كاروانەكەمان، جگە لە كاڵای جۆراوجۆر، لوغزی خوای ناو پیاوانیشی هەڵگرتوە. سبەی لە قۆنیە یەكتر دەبینین".

دوای گەیشتنیان، زۆرم لە سوڵتان وەلەدی هاوڕێم كرد باسی دیدارەكەیم لەگەڵ شەمس بۆ بكات. هەموو شتێكم سەبارەت بە ڕۆمی تۆمار كرد، بگرە من ویستم شایەت بم لەسەر ئەو رووداوە تاكانانە. بەڵام سوڵتان وەلەد بەئەنقەست دەیوست سەرەسوڕێم پێ بكات. بەبڕوای ئەو، ئەو نامەیەی ناردویەتی هەموو شتێكی تێدایە كە ویستویەتی بیڵێ. شتێكیتری نەگوت. كاتێ پێداگریم كرد ملی دا و وتی: "گوێ بگرە، زۆر بەزەحمەت توانیم قەناعەتی پێ بێنم بگەڕێتەوە بۆ قۆنیە. پڕكردنی پێڵاوەكەی لە ئاڵتون هەڵەیەكی گەورە بوون تۆ ناتوانی خەیاڵ بكەیت چەند تووڕەی كرد. دەتوانم چیت لەبارەیەوە پێ بڵێم جگە لەوەی پێی وتم ئەو وڵاتی شامی خۆشویستوە كە تێیدا دەژیا؟، بەتایبەت شاری حەلەب كە لە هەموو شارەكانی پێ باشترە، تەنانەت لە قۆنیەیش. وتی ئەو ماڵەكان و شەقامەكان و نۆكەندەكان و شوورەكان و بێستانەكانی خۆشویستوە"..

بەئاستەم توانیم بێنمە بەر خەیاڵ شەمسی تەورێزی تەقدیری جوانیی تەلارسازی شارێك بكات. بەڵام متمانەیەكی كوێرانەم بە سوڵتان وەلەد هەیە كە هەرگیز درۆیەك بەزاریدا نەهاتووە. كەواتە بەم شێوەیە، شەمسی چاوەڕواننەكراو، بێبار، میزاجی دەتوانێ جوانی لە باڵەخانەیەكدا ببینێ، سوڵتان وەلەد ئەو قسانەی بۆ گێڕامەوە كە شەمس لەكاتی گەڕانەوەیان لە حەلەب كردبوونی: "تەنیا رۆمی دەتوانێ وام لێبكات ئەم شارە بەجێبێڵم. ئەگەر پێیان بوتمایە باوكت لەگۆڕ هەستاوەتەوە و هاتووە بۆ تەل باشر تا بتبینێ و جارێكیتر دەمرێتەوە، وەرە بۆ بینینی، پێم دەگوت: بمرە، چیت بۆ بكەم؟، هەروەها لە حەلەبەوە نەدەهاتم، بەڵام هاتم بۆ ئێرە". هەروەها وتی "بەهەشت لێرەیە".

لەگەڵ ئەوەیشدا شەمس بەهەشتی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ دیداری رۆمی.

"سبەی لە قۆنیە یەكتر دەبینین"، ئەو چەند وشەیە كە سادە دەردەكەون و لە خوارووی نامەكەی سوڵتان وەلەدەوە نووسرابوون، ماڵەكەیان هەستاندەوە و دایاننەنیشاندەوە. دەستبەجێ باخچەوانەكە هەستایە سەرپێ و كەوتە پشكنینی هەموو گوڵێك لە هەر دارگوڵێكدا. بەرزیی دەرچوونی ئاوی نافورەكەی رێك كرد تا هیچ عەیبێكی نەمێنێ. چێشتلێنەرەكە دەستی كرد بە دانانی سیری كوتراو لەناو پارچە بەفردا تا، تامی دوو شتی جیاواز كۆ بكاتەوە كە رۆمی حەزی لێی بوو. ئافرەتان ژوورەكانی خۆیانیان بەجێهێشت و چوون بۆ گەرماوی گشتی، خۆیانیان شۆرد و پرچیان شانە كرد وەك ئەوەی یەك ئافرەت بن، وەك ئەو ئافرەتەی تایبەتە بە شەمس. ژەنیاران بۆ چەندین سەعات ئامێرەكانیان رێكوپێك دەكرد. دەنگی تەپڵ و نای و عود لەگەڵ دەنگی سرودبێژاندا ئاوێتە بوو كە پرۆڤەیان بەدەنگیان دەكرد. موریدەكان رایانكرد بۆ بازاڕ بۆ لەبەركردنی جلوبەرگی تازە، وەك ئەوەی ساڵی نوێ بێ. هەندێكیش بەپەلە چوون بۆ پشكنینی ژوورەكان بۆ لابردنی هەر شتێك كە لەوانەیە ببێتە هۆی بێزاركردنی شەمس.

من و زریانوس هەوڵمان دا هەموویان رازی بكەین. گوێدرێژەكان بۆ گواستنەوەی ئافرەتان، بەفر بۆ چێشت لێنەر، پایە نەبینراوەكان بۆ پاڵپشتیكردنی بازاڕی گوڵان، زەنگەكان و كۆمەڵێ قەسیدە، لەوانە قەسیدەیەكی عەتار دەربارەی گۆرانیبێژێك كە لەپڕ هەموو گەنجینە هونەرییەكەی لەبیر كردوە، هەروەها رێگەیەكی دیاریكراو بۆ بەستنی مێزەرەی هاوڕێیەكمان كە هەموو توانای دەخستە گەڕ تا بەجوانترین شێوەی دەربكەوێ، تاقێك بۆ داگیرسێنەرانی چراكان و چەندین شتی تر.

هەرچی مەولانایە بۆ ماوەی چەندین كاتژمێر بە تەنیا لەگەڵ سەلاحی زێڕنگەردا مایەوە. سەرباری ئەم هەموو كارانە هێشتا چاودێریی ژوورەكەیانم دەكرد، بەبەردەوام پرسیارم لەخۆم دەكرد ئاخۆ دەبێ لەگەڵ نزیك كەوتنەوەی مەعبودە هەڵاتووەكەدا هەریەكەیان چی بەویدی بڵێ، پاشتر لە رۆمی خۆیەوە زانیم كە خەڵوەتێكیان بۆ رۆمی و شەمس لە ماڵی سەلاح ئامادە دەكرد، بەڵام تۆبەكردنی رواڵەتیی گومانكاران، دوژمنانی پێشووی شەمس، مەولانای رزگار نەكرد لە گومانی ئەوەی لە ئایندەدا هەڕەشەیتر پەیدا ببن.

مەولانان خوازیار بوو، بەرۆیشتن بۆ ماڵی زێڕنگەرەکە لەگەڵ هاوڕێ ئازیزەکەیدا لەچاوی فزوڵییان دوور بکەوێتەوە، بەتایبەت چاوی عەلای کوڕی.

لەو رۆژەدا کە پڕبوو لە ئومێد و فەوزا کوڕە بچوکەکەی مەولانام نەبینی. ئایا لەماڵ بوو یان ئەویش بڕیاری دابوو دوور بکەوێتەوە و خۆی بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو گەڕانەوەیەی بەرگە ناگیرێ، ئامادە بکات؟ هەرگیز ئەوەم نەزانی. دیارە دەبێ لەوانیتر خۆی دابڕیوە، چونکە لایەنگرەکانی پێشووی، کە کۆمەڵێ لە پیاوانی نائومێد بوون خۆیان –لانیکەم ئێستا– وا پیشان دەدا، کە بوونەتە دڵگەرمترین و خۆیان کرد بەناو خۆشییە دەستەجەمییەکەدا.

ئەو ئێوارەیە پێش ئەوەی قوتابخانە بەجێبێڵم شەکەت بووم بۆ دواجار نیگایەکم گرتە دەرگای ژوورەکەی مەولانا کە کەمێك لاواز کرابووەوە، بیچمە لاوازەکەی و هەردوو باڵی و سەری بەرەو ئاسمان بەرز کرابوونەوە لەبارێکدا کە سوپاس و منەتباری دەگەیاند.

رۆژی دواتر هەمووومان پێش وادەی دیاریکراو گەیشتین. نانی بەیانی زوو پێشکەش کرا، باخچەکە لە بەرەبەیاندا ئاو درا، نوێژی بەیانی لەکاتێکی نائاساییدا ئەنجام درا، کەڵەشێر پێش وەختی خۆی خوێندی. تەنانەت خۆریش وا دەردەکەوت پێش وادەی خۆی هەڵهاتبێ. لە باخچەوانەکەوە تا نەجمول نەهار هەموو ئاواتەخوازبووین تاسە و شەوقەکەمان گەیشتنی شەمسی تەورێزی خێرا بکات.

لەدەوروبەری نیوەڕۆ هەواڵی گەیشتنی کاروانەکەیمان پێگەیشت. ژەنیاران ئامێرەکانیان بەدەستەوە گرت و یەکێك لەو ئاوازانەیان ژەنی کە شەمس حەزی لێیەتی. سرودبێژانیش هەندێ قەسیدەی سەنائی و عەتار و هەندێ قەسیدەی رۆمییان دەوتەوە کە لەم دواییەدا بۆ ئەو بۆنەیە نووسیبونی. بەڕیز لەنزیك دەرگای قوتابخانە وەستاین تا یەك بەیەك پێشوازی لەو پیاوە بکەین کە غیابی میزاجی گەورەمان، مەولانای تێکدا.

کاروانەکە گەیشت.

شەمس رۆمی بینی، لەئەسپەکەی دابەزی و پێی وت: "تۆم بینی، تەنیا تۆ. تۆ. ئەوانیتر بەشتێکەوە سەرقاڵ بوون و بەدۆخی خۆیانەوە رازی بوون. پیاوە عابیدەکان بە گیانیانەوە سەرقاڵ بوون، هەندێکیتر بەعەقڵیانەوە، هەندێکیتر بە گیانیانەوە. تۆم بینی، تۆ، نە کەسیتر جگە لە تۆ. هەموو هاوڕێیان شوێن حەزەکانیان کەوتن و بەجێیان هێشتی، بەتەنیا". گوێم لێبوو گەورەم بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

خۆر و مانگم گەیشتن،
هەردوو چاو و گوێم گەیشتن،
رووی زیوینم گەیشت،
کانی ئاڵتونم گەیشت.

مەستیی سەرم گەیشت

درەوشانەوەی عەقڵم گەیشت

ئەگەر تۆ حەزت لە شتێکیترە؟

ئەوا ئەو شتەیتر گەیشت

دزەکەم و

تێکشکێنەری پەشیمانیم گەیشت

یوسفی روومەت زیوین

لەپڕ لە تەنیشتمە

ئەمڕۆ لە دوێنێ باشترە

ئەی هاوڕێی ئەبەدی

دوێنێ مەست بووم

کاتێ لێیم بیست

ئەوەی دوێنێ بۆی گەڕام

لەبەر تیشکی چراکە

ئەمڕۆ، چەپکێ گوڵە

لە ڕێگەمدا دەرکەوت.

بۆچی لە مردن ئەترسی؟

ئاوی زیندەگی لێرەیە

ترسان لە لۆمەکردن بۆچی؟

وا قەڵغان هات

هەردوو پیاوەکە دەستیان کردە ملی یەکتر و سوژدەی سوپاسگوزاریان بۆ خوا برد، ئەژنۆ و نێوچاوانیان توند نیشتبووە سەر زەوی. زۆر لەو هاوڕێیان لەو ساتەدا گەیشتن، کاتێ هەردوو پیاوەکە

بووبوونه یەك پیاو. من، حوسام بینیم سێبەری شەمس و مەولانا تێکەڵ دەبن، دەبنە یەك. من جەخت لەوە دەکەم. شایەتی دەدەم.

## شێخ و موریدم

لەو ماوەیەدا ئاهەنگ و کۆڕی بیستن و سەماو گێڕانەوەی حیکایەت و دیداری عاتیفیی زۆر ساز کران.

وا دەهاتە پێش چاو کە ئاشتی هێلانەی لەسەر لقەکانی درەختی بوندوق کردوە، کە قوتابخانەیان پڕ کردوە. سەرباری ئەم سەفایە مەولانا بڕیاری دا، وەك پێشتر بڕیاری دابوو لەگەڵ شەمس بگوێزێتەوە بۆ نیشتەجێبوون لە ماڵی سەلاحی زێڕنگەر. داوای لێکردم کەلوپەلەکانیان بۆ ئامادە بکەم: هەندێ جلوبەرگ و مێزەری زیادە و دوو سێ کتێب لە کتێبەکانی عەتار و نای-یەك.

خەریك بوو ئیرەییم بە سەلاح دەبرد کە لە ماڵەکەیدا میوانداری کردبوون، هەستێك کە پێشتر قەت نەیگرتبووم، بەپێی توانا هەستی بێزاریەکەم شاردەوە، بەڵام نەمتوانی لە هۆی ئەوە تێبگەم وای لە مەولانا کرد بڕیاری گواستنەوە بۆ ئەو هیچوپوچە بدات -کە هەرچی تێیدا بوو رەنگدانەوەی پیشەکەی بوو وەك زێڕینگەرێك- و نەیگواستەوە بۆ ماڵەکەی من، کە ئاسوودەییەکی راستەقینە دەستەبەر دەکات و پڕە لە کتێب و کەرەستەی وەرزشی، وەك ئەو کەوانانە کە زنجیر و هەڵگری بچوکیان لەگەڵدایە بە "کبادە" و "تەختە شینا" ناسراون. سەلاح هەمیشە خۆی وا پیشان دەدا دڵسۆزترین موریدە، یەکێك بوو لەو کەسە کەمانەی توانییان لەکاتی غیابی شەمسدا لە خەمی مەولانا کەم بکەنەوە. بەڵام بە ملهوڕی و لەخۆڕازیبوونێکی گەنجانە پرسیم ئاخۆ دەبێ هۆی چی بێ مەولانا ئەو هەموو محیبەتە بۆ ئەو زێڕنگەرە نەزانە پیشان دەدات. لەڕاستیدا سەلاح نەیدەتوانی بیرۆکەکانی دەرببڕێ، لەکاتی دەمەتەقێکاندا نەیدەتوانی بچوکترین بیرۆکەی عیرفانی چەندە سادە بووایە، دەرببڕێ. رۆژەکانی لە دوکانەکەیدا بە داڕشتنی ئاڵتون بەسەر دەبرد. ئەوە هەموو کارێك بوو بتوانێ بیکات. سەرباری ئەوەیش، کەسە رێزدارەکەی لای مەولانا بوو.

گواستنەوەی هەردوو خۆشەویست کە جارێکیتر بەیەك گەیشتنەوە بۆ ئەو ژوورە -رۆمی و شەمس بە دوو خۆشەویستەکە ئاماژەیان بۆ خۆیان دەکرد- شەپۆلێکیتری بێزاری لای حەسودان وروژاندەوە. سەرباری غیرەکردنم لە سەلاح و بێزاریم لە هەڵبژاردنەکەی مەولانا، تەواو نەمدەتوانی لۆمەی ئەو دووانە بکەم. ئامانجمان جیاواز بوو، لەکاتێکدا ئەوانیتر حەسودییان بە شەمس دەبرد کە من زۆر خۆشم دەویست، من -ئای لە هەڵەشەیی گەنجان!-هەستم بە تووڕەیی لە زێڕینگەرەکە دەکرد. دوای چەند ساڵێك، دوای مردنی رۆمی، سوڵتان وەلەد کوڕە راساڵەکە شتێکی بۆ ئاشکرا کردم کە باوکی دەربارەی شەمس و سەلاح و من وتبووی. لە دانیشتنێکدا کە من ئامادەی نەبووم بەشوێنکەوتەکانی وتووە "لەبەردەم سەلاحدا باسی شەمس مەکەن، لەبەردەم حوسامیشدا باسی سەلاح مەکەن. ئەگەرچی یەکگرتن لە دڵی نووریاندا هەمەکی و تەواوە، بەڵام غیرە لە خواوەیە و پێویستە نەیوروژێنین".

ماڵی سەلاح زۆر لە ماڵی مەولانا بچوکتر بوو، بەڵام وادیار نەبوو هیچ شتێك سەفای نێوان ئەو دوو خۆشەویستە یەکگرتووەی لێڵ کردبێ. ئەوە خەڵوەتێکی راستەقینە نەبوو، چونکە دەگەڕانەوە بۆ قوتابخانە، لەوێ ئێمە کە لە بازنەی یەکەمدا بووین، شایەت بووین لەسەر ژیانیان پێکەوە و دەگمەنترین جۆرەکانی فێرکردنمان وەردەگرت. بەڵام کاتێ لە ماڵی زێڕینگەرەکەدا مانەوە جگە لە –جارێکیدی– سەلاح و سوڵتان وەلەد رێگە بەکەس نەدرا سەردانیان بکات. سوڵتان هەندێ هۆیتری ماقووڵی هەبوو بۆ سەردانی ماڵی سەلاح، ئەوەیش بەبەردەوامی و پێداگریی زۆرەوە دەکرد، چونکە بەتەمای ئەوە بوو هەندێ کات لەگەڵ کچەکەی سەلاح بەسەر ببات و بە بوونی زۆر شادومان دەبوو. هەردوو باوکیش هیچ هەڵەیەکیان لەوەدا نەدەبینی، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە، بەئومێدی ئەو یەکگرتنە بوون.

ژیانی شەمس و رۆمی بەو شێوەیە نەبوو کە بۆ یەکەم جار یەکترییان بینی، کاتێ بۆ ماوەی چل رۆژ و شەو لە ژوورەکەدا خەڵوەتیان کێشا. ئێستا هەندێ جار هەریەکەیان بەجیا دەردەچوون. کاتێ شەمس ویستی بەتەنیا بچێتە دەرەوە مەولانا داوای لێکردم یاوەری بکەم، چونکە دەترسا کەسێك هێرش بکاتە سەر شەمسەکەی. هەروەها دەترسا باڵندەکەی جارێکیتر لەناکاو بفڕێتەوە.

وادیار نەبوو بوونم لەتەنیش شەمس بێزاری بکات، بەڵکو وام بەخەیاڵدا دەهات زۆر خۆشی دەوێم. من دڵم دەدایەوە، چێژی دەبینی لە یادخستنەوە و تووڕەکردنم، ئەویش لەبەر راڕایی و شەرمکردنم کاتێ فەرمانی پێدەکردم داوای پارە لەو کەسانە بکەم کە دەیانویست سەردانی مەولانا بکەن. لە مەقامی مەولانادا دامنا: مەقامی قودسی. ئایا دەکرێ حەسودی بەخوا ببەم لەبەرئەوەی لەگەڵ زاتی ئەوم، بۆ هەڵبژاردنی هاوەڵێتیی ئەو بەسەر هاوەڵێتیی مرۆڤدا؟ غیرەم رووی لە شوێنێکیتر دەکرد، لە بڕیاردانیان بە مانەوە لە ماڵی سەلاحی زێڕنگەر، نەك لە ماڵی من.

رۆژێکیان لەکاتێکدا بەناو کۆڵانەکانی قۆنیەدا تێدەپەڕین، بەنێو ئاپۆرای خەڵکدا رێگەمان دەبڕی و لەناو هەراوهۆریا و جەنجاڵی شاردا پیاسەمان دەکرد، خۆمان لەو بارگیرانە لادەدا کە لەژێر بارە شمەکدا نقەیان دەهات و بەرەو بازاڕ ملیان دەنا، لەگەڵ ئافرەتانی باڵاپۆشی خێراڕۆدا بەیەکماندا دەدا، خۆمان لەو سەگە وێڵانە لادەدا کە بەدوای پاشماوەی گۆشتدا موشەموشیان بوو، زڵەی دەنگی منداڵان دەگەیشتە گوێمان کە ئایەتەکانی قورئانیان دەخوێند، بەلای ئەو دەروێشانەمان تێدەپەڕین کە بەهێواشی دەڕۆیشتن و پەلەیان نەبوو بۆ گەیشتن بەهەر شوێنێك، ناوبەناویش پارچە پارەیەکمان فڕێ دەدایە ناو جامی درێژکراوی سواڵکەرێك، چێژمان دەبینی لە بینینی نیشانەکانی رەزامەندی بەڕوومەتی رێبوارێکەوە پاش ئەوەی ژەمێك خواردنی چەوری لە خانەکەدا خواردبوو، یان لە دواین نیگا کە پیاوێکی قۆز دەیگرێتە ئاوێنەیەکی هەڵواسراو لە دەروازەی دوکانی حەلاقێکدا، کە هەر ئێستا لە سەرتاشین و رێککردنی ریشی بووەتەوە.

لەپڕ سوارێکی مەغۆلی لەبەردەمماندا قوت بوویەوە کە بەپڕتاو بەئەسپەکەی غاری دەدا، خەڵك دوور کەوتنەوە و ڕێگەیان بۆ چۆڵ کرد و پشتیان نووساند بەدیوارەکەوە. تەپوتۆزێکی چڕ لەدوای ئەسپەکەیەوە بەرز بوویەوە کە چاوی کوێر دەکرد. کاتێ ئەو جەنگاوەرە لە کۆتایی شەقامەکەدا ون بوو، من بەدەم پرواندنی چاوەکانمەوە کە تەپوتۆزەکە کزاندنیەوە کەوتمە بۆڵەبۆڵ لەو بەربەرییانە، کە بەو شێوەیە مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن وەك ئەوەی وجودێکمان نەبێ. ئەوکاتە شەمس ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە:

"ماوەیەکی کەم لەمەوپێش لە شاری حەلەب لەنزیك دوکانێکی بچوك چەند کەسێکم دی لەترسا دەلەرزین و هەوڵیان دەدا هەڵبێن. کاتێ لێیان نزیك کەوتمەوە هاواریان کرد و وتیان: مەچۆ ئەوێ! لەناوەوە ئەژدیهایەکی لێیە دەتوانێ بەیەك پاروو گەردوون قووت بدات. قسەکەیان نەیترساندم، چووم بەرەو دەرگایەکی ئاسنین کە درێژتر و پانتر بوو لە هەر دەرگایەك لە ژیانی خۆمدا دیبێتم. کڵۆم درابوو. کڵۆمەکە بارستاییەکەی زیاتر لە سێ هەزار ڕەتڵ دەبوو، یەکێك لەوانەی خڕ بووبوونەوە هەوڵی دا ئاگەدارم بکاتەوە و وتی: ئەو لەوێیە، ئەژدیهایەکی حەوت سەر! لەو دەرگایە نزیك نەبیتەوە. ورەم دایە بەر خۆم و کڵۆمەکەم شکاند و چوومە ژوورەوە، لە کرمێکی زەوی زیاترم نەدی".

ئەو حیکایەتەی شەمس بۆی گێڕامەوە تابڵێی شەفاف و روون بوو. لەو سەردەمەدا، هەروەك ئێستا، بەردەوام لەژێر هەڕەشەی بەردەوامی مەغۆلدا دەژیاین، سەرەنجام وای لێهات سوڵتانەکانمان بوونە شوێنکەوتەی خانی گەورەی چین. دەترسان، گوێ لەمست بوون، سەرباری هەموو شتێك هەوڵیان دا هەندێ لە شارەکانیان، لەوانە قۆنیە، لەبەردەم ئارەزووی سەرکەشی مەغۆل بۆ وێرانکاری، بپارێزن. بەڵام دۆخەکە هێشتا پڕ مەترسی بوو. ساڵی ١٢٤٣ ساڵێك پێش لە دەرکەوتنی شەمس، مەغۆل سوڵتان کەیخوسرەویان شکاند، توکات و قەیسەریە و چەندین شاریتر وێران کران. تاڵاوی ئەو بەدقدومانە باڵی بەسەر سەری هەمووماندا کێشا. لە هەموو مەغۆلیەکدا بە داگیرکەر، خنکێنەر، ملپەڕێن و وێرانکەرێکت دەبینی. مەحاڵ بوو بۆم بیر لەوە بکەمەوە ئافرەتانمان شوو بەو جۆرە پیاوانە بکەن، کەچی کردیان. کاتێ لە چیرۆکی ئەژدیهاکە بووەوە، لەبارێکدا دەمزانی شەمس خۆی لە چەندین سەفەریدا بەدەست دڕندەیی مەغۆلەوە ناڵاندویەتی، هەروەها سیحری تۆقێنەری مشك لەبەردەم مار و ئەو ترسە تۆقێنەرەی تووشی جیهان دەبێ کاتێ ئەوانە دەردەکەون، کە ئەوە هەموو مەخلوقێك لەناو خۆیدا هەستی پێدەکات، لە شەمسم پرسی: بۆچی بەو شێوەیە رەفتارمان کرد؟ بۆچی شەمسی تەورێزی بۆچی؟ ئەویش بەدەم ڕۆیشتنمانەوە وەڵامی دایەوە:

هەموو گەردوون لەناو مرۆڤدا حەشار دراوە. کاتێ ئەم مرۆڤە هەست "بەخۆی" دەکات، ئەوا هەست بەهەموو شت دەکات، مەغۆل لەناوتدان. مەغۆل تووڕەیی خۆتە". پاشان بەجوامێرییە ناسراوەکەیەوە

هەندێ وردەکاریی پێکەنیناوی سەبارەت بەئەزموونی خۆی لەتەك ئەو مەغۆلە شاڵاوبەرانە کە لە دەشتەکانەوە هاتوون، بۆ باس کردم، وتی: حەوتسەد پیاو بووین. تەنیا حەوت مەغۆل هێرشیان کردە سەرمان. جلەکانیان بردین، لەبەرانبەر ئەوەدا خراپیان کوتاین".

پاشان، بەبێ پێشەکی، لە گاڵتەوە گۆڕا بۆ تووڕەیی، بەدەنگی بەرز کەوتە هاوارکردن، بەشێوەیەك بینیم رەگەکانی ملی ئاوسان و وێنەی ژمارە هەشتیان لەسەر ناوچاوانی نەخشاند. چیتر قسەی لەگەڵ نەدەکردم، بەڵکو قسەی لەگەڵ کەسێك دەکرد کە جارێکیان بۆ برایەکی گریاوە مەغۆلەکان کوشتبوویان و شەمس لۆمەی ئەو شیوەنگێڕەی دەکرد:

"بۆچی دەگریت؟ مەغۆلەکان بەشیرەکانیان ژیانی ئەبەدییان بەخشییە براکەت. ئایا بەسەریدا دەگرت و لێی دەپرسی: ئەم هەڵاتنە بۆچی؟ مەغۆل زیندانەکەیان شکاند و تۆیش دەگریت و دەپرسی بۆچی ئەو دەلاقەیان لە دیوارەکەدا دروست کرد. تۆ هەنسك دەدەیت و روومەتت دەرِنی و لەخۆت دەپرسی کە بۆچی قەفەسەکەیان شکاند و باڵندە بەندکراوەکەیان ئازاد کرد. بۆچی برینێکیان کردەوە و پیسی و زوخاوەکەیان لابرد. تۆ شیوەن دەکەیت و لەخۆت دەپرسی بۆچی ئەو پیساییە لابرا".

نۆرەکانی تووڕەبوونی لەناکاوی توندی شەمس ئاراستەی مەلاونا بوو، وەك ئەوەی بۆ ئاڵۆسکاندن و گژبەریکردنی بن.

رۆژێکیان لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵانیتر یاوەریم کردن بۆ ماڵی نای ژەنێکی بەناوبانگ بۆ گوێگرتن لە نایەکی دیاریکراو کە لە جۆرێکی تایبەتی تەختە دروست کرابوو. کەش و هەوا خۆش بوو، هەستم کرد شەمس کە هەموو دەم سەرمای بوو، بەجوانیی کەشەکە ئاسوودە بوو، بەوە چەمانەوەکەی پشتی کەم بووبوویەوە و بەژن درێژتر دەردەکەوت. رۆمی کە بەردەوام سکاڵا لە رەنگزەردیەکەی دەکات روومەتی خۆی دایە بەر تیشکی گەرمی خۆر، بەئومێدی ئەوەی گۆڕانکاریەك بەسەر رەنگی روومەتیدا بێ، بەبێ سوود. چ زستان و چ هاوین، چ شەو و چ رۆژ مرۆڤ دەتوانێ بڵێ رۆمی بەئاوریشمێکی زەرد روومەتی داپۆشیوە.

دوای ئەوەی نای ژەنەکە لە دەروازەی ماڵەکەیدا، کە وەك هەموو ماڵەکان بە سەقفێکی لەخشتی سوور دروستکراو داپۆشرابوو و رووکارەکەی بەبەردی لکلکێن رەسیف کرابوو، پێشوازی کردین، چووینە ناو حەوشە لاکێشەییەکە کە درەختە ئارەوەنەکانی تێدا بوون. لەپڕ شەمس وەستا، رۆمی بەبێ ئەوەی یەك وشەیش بڵێ هەمان شتی کرد. نای ژەنە هەژارەکەیش لە شوێنی خۆیدا وەستا. ئەو دوو پیاوە بۆچی وەستان؟ نازانم.

چەند ساتێك تێپەڕین وەك زەمەنێکی درێژ دیار بوو. پاشان شەمس جارێکیتر چەند هەنگاوێکی بۆ پێشەوە نا. بەسەر پلیکانە دەرەکیەکەدا بۆ نهۆمی یەکەم سەرکەوت، کە ریزە ژوور و هۆڵێکی مۆسیقای

تێدا بوو. مەولانا و موریدەکانیتر بەدووایدا چوون. هۆڵەکە ژەنیاریتری تێدا بوو چاوەڕوانی ئێمە بوون. کاتێ چووینە ژوورەوە وەستان و لەبەردەمماندا نوشتانەوە. شەمس کە یەکەم کەس بووە چووە هۆڵەکە وەڵامی سڵاوەکەی نەدانەوە، ڕۆمیش بەهەمان شێوە. لەکاتێکدا دەیویست بەرەو خانەخوێکانی پێشڕەوی بکات، لەپڕ لەجێی خۆیدا چەقی. خەریك بوو دەمی بکاتەوە و قسە بکات، بەڵام لێوەکانی قەپات بوون. خانەخوێکە و میوانەکانی، کە بەم ڕەفتارە پەشۆکان، گەڕانەوە جێگەکانی خۆیان بەدرێژایی ژێرخەرە نزمەکان کە بەدرێژایی دیوارە پەنجەرە دارەکان درێژ بووبوونەوە، دەستی بەژەنینی تابلۆیەك کرد کە دابڕان (فراق)ی دەگەیاند. ڕوناکیەکی کز لە درزەکانی تەختە قلّیشبووەکە لە بەشی خوارەوە پەنجەرەکان و شوشە سەوزەکەی سەریەوە دزەیان کرد و زەخرەفەی سەقفەکەیان دەرخست، کە سەرنجی ڕاکێشام.

لەکاتی ژەنینەکەدا شەمس پێکەنینێکی گەورەی کرد. ڕۆمیش کە لە تەنیشتی دانیشتبوو بەهەمان شێوە. پاشان شەمس لەپڕ وەستا و ڕووی گرژ بوو. ڕووی ڕۆمیش گرژ بوو. دەبێ دان بەوەدا بنێم کە من زۆر بێزار بووم و بیرم بەو شەرمەزارییە کرد کە بەو هۆیەوە ژەنیاران دادەگرێ. بەڵام ژەنین نەوەستا.

کاتێ ئاهەنگەکە تەواو بوو، مەولانا سوپاسی سەرجەم ژەنیارانی کرد وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ. کەوتە خوێندنەوەی هەندێ شیعر کە ئەوانیش باسیان لە فیراق دەکرد. ژەنیاران دوای ئەو بایەخپێدانە گەورەیان لەلایەن مەولاناوە ئەو پشێویەیان لەیاد کرد کە ڕووی دا. پێیان وتین هەرگیز بەو جوانییە نەیانژەندوە. ژەمێك سلّق پێشکەش کرا کە بە سرکە و نەعنا خۆش کرابوو. دوای ئەوەی خواردمان بە پلیکانەکەدا هاتینە خوارەوە، لە حەوشەکە تێپەڕین و چەند ژوورێکم لە نهۆمی زەمینیدا بینی کە کۆمەڵێ قامیشی گەورەیان تێدا ئەمبار کرابوو، لە چاوەڕوانی ئەوەی بکرێنە نای. وەك سوپاسگوزاریەك، ڕۆمی بۆ پیرۆزکردنی فووی بە نای خانەخوێکەماندا کرد.

کاتێ گەڕاینەوە قوتابخانە، شەمس هەرچی تووڕەیی لە سنگیدا پەنگی خواردبووەوە هەڵیڕشت. ڕووی گرژ کرد لەو پیاوەی گوایە بەخۆشەویستی خۆی دادەنێ. هەرگیز بەخەیاڵمدا نەهاتووە کەسێك بتوانێ ئەو جۆرە وشانە بە ڕۆمی بڵێ.

"پێویستە دۆخمان ڕوون بکەمەوە. ژیانمان پێکەوە لەسەر چ شتێك دادەمەزرێ؟ لەسەر برایەتی و پاڵپشتی؟ لەسەر پەیوەندیی نێوان گەورە و مورید؟ لەنێوان مامۆستا و قوتابی؟ ئێستا مەعریفەی من لەسەروو مەعریفەی خۆت دادەنێی. ئەگەر هۆیەك هەبێ بۆ جیابوونەوەمان، ئائەمەیە. تۆ هیچم فێر ناکەی. ئەگەر بۆ ئەوە نەبووایە لێرە، لە قۆنیە فێر بم دیمەشقم بەجێ نەدەهێشت، پاشان وەك ئەوەی قسە لەگەڵ کەسێکی نەبینراو بکات وتی "تەنیا و ئازاد، هەموو شوێنانم تەی کرد، هەر دوکانێکدا بێتە ڕێم لەبەردەمیدا ئەوەستم. ناتوانم لەگەڵ خۆم ڕایبکێشم، عارفەکە، بۆ هەر شوێنێك. لەبەرئەوەی ناتوانم بۆ هەرکوێ بڕۆم بیبەم لەگەڵ خۆم".

سەرەڕای ئەم تەقینەوەیە مەولانا بێدەنگ بوو، بگرە بە تەسلیمبوونەوە گوێی بۆ شل دەکرد. لێیان دوور کەوتمەوە تا گوێم لە بیستنی ئەو وشە ئازاربەخشانە دوور بگرم. لەگەڵ ئەوەیشدا گوێم لە شەمس بوو درێژەی بە داشۆرینەکەی دەدا.

"ئەگەر، ئەگەر تووڕە بم تووڕە دەبی. ئەگەر پێبکەنم پێدەکەنی. ئەگەر سڵاوم لە کەس نەکرد تۆیش سڵاوی لێ ناکەی. ئەزانم تۆ دنیایەکی تایبەت بەخۆت هەیە، جیا لە دنیاکەی من، ئازاد لە جیهانەکەی من. تۆ وشەکانت بە وشەکانی من بەراورد ئەکەی. بەڵام من، نووسینەکانت تەنانەت بەقورئانیش بەراورد ناکەم. شتێکیتر هەیە، کاتێ ئەڵێی بنووسە، تۆ چی لەبارەی نووسین ئەزانی؟".

لە وەڵامی ئەم تۆمەتانەدا کە وام دەبینی هەندێکیان پەیوەندییان بەیەکەوە نیە، مەولانا هەندێ قەسیدەی بۆ شەمس خوێندەوە کە من بە ئیلهامبەخشترین شیعریان دادەنێم لەناو سەرجەم ئەو شیعرانەی لە دنیادا وتراون:

تۆ ئەو نوورەی بەمووسای وت:

من خوام! من خوام! من خوام!

شێخ و موریدم! دەرد و دەرمانم!

ئەم وشانەم راگەیاند: "شەمسم و خودام!"

دوای ماوەیەك، دوای ماوەیەکی زۆر لە ونبوونی شەمس، کاتێ رۆمی بوو بەو شاعیرە مەزنەی دەیناسین، گوێم لێبوو ئەم غەزەلە دەڵێ:

تۆ نوحی، تۆ روحی

تۆ سەرکەوتوو و دۆڕاوی

تۆ ئەو دڵەی کرایەوە

بەسەر دەرگای نهێنیەکاندا بۆ من کرایەوە

تۆ نوور و شادیت

تۆ بەختەوەریی سەرکەوتووی

تۆ باڵندەی لەسەر شاخی توور

دەنوکت برینداری کردم

تۆ دلۆپ و ئۆقیانووسی

تۆ نەرمی و تووڕەییت

تۆ شەکر و ژەهری

لەوە زیاتر سزام مەدە

تۆ ژووری شەمسی

تۆ ماڵی ڤینۆسی

تۆ باخچەی ئومێدی

هاوڕێم، ڕێم بدە بێمە ژوورەوە

تۆ ڕۆژ و ڕۆژووی

تۆ بەرهەمی هەژاریت

تۆ ئاو و کتریت

ئەم جارە ئاوم بەرێ

تۆ تۆو و تەڵەی

تۆ مەی و جامی

تۆ کاڵ و تۆ کوڵاوی

بەم شێوەیە بەکاڵی بەجێم مەهێڵە

بەلای ڕۆمیەوە شەمس لە هەمان کاتدا هەموو ئەوانە بوو پێکەوە. هەر شتێك و دژەکەی بوو. هەندێ جار مامۆستا و هەندێ جار قوتابی، ڕۆژێك ژەهر و ڕۆژی دواتر تریاك. بەڵام، لەوانە هەموو گرنگتر، خواوەندی بوو.

"شەمسم و خودام"... هەرکات گوێم لێی بوایە ئەم دەربڕینە کوفریەی بوتایەتەوە، رامدەکرد و دەرگاکانی قوتابخانەم قەپات دەکرد تا کەسە سەرەتاکان قسەکەی نەگوێزنەوە بۆ پیاوانی ئاینی. بەگوێرەی تەفسیری ئەوان، ئەم بەیتە دەشێ ڕۆمی ڕاستەوخۆ بباتە بەردەم پەتی سێدارە. حەللاجم لەبیرە کە دوو سەدە لەمەوبەر کوژرا لەسەر ئەوەی جەسارەتی کرد و تی: "من هەقم". ئەی مەگەر عارفێکیتر، شێخی ئیشراق، شێخی حیکمەتی ڕۆژهەڵاتی، سەهرەوەردی، لە ٥ی رەجەبی ساڵی ٥٨٧ (٢٩ی تەمموزی ١١٩١) لەسەر دەستی فەقیهەکان نەکوژرا، کە کارەکانیان بە پێچەوانەی جەوهەری ئاین دادەنا؟!

ڕۆمی خۆی وتی: "شەمسم و خودام". بەوردی لەڕووی سەرجەم موریدان رامام. دەبێ کامیان ئەو موریدە ناپاکە بێ کە لەوانەیە مەولانا لەسەر ئەو وشە گوناهانەی تاوانبار بکات؟ هاوەڵانمان لەوێ بوون، بەڵام عەلای کوڕە لاسارەکەیشیم دی، کە لە سوچێکی ژوورەکەدا دانیشتبوو. لەو ساتەوە هەستێك دایگرتم

كە هەڕەشە لەسەر ژیانی شەمس بووەتە شتێکی راستەقینە. ئەو شەمسەی لەوکاتەوە بۆ یەکەم جار دەرکەوت، رۆمی لە مامۆستایەکی زاناوە گۆڕی بۆ سەماکەرێکی بەجۆش. ئەو شەمسەی ئێستا بووەتە خودا!.

کاتێ رۆمی لە خوێندنەوەی ئەو قەسیدەیەی دەستەواژە کوفریەکەی "شەمسم و خودام"ی وەك لازیمەیەك تێدا دووبارە بووەتەوە، بەردەوام بوو، کوڕە لاسارەکەی، واتە عەلا، لەپڕ هەستا و بەرەو دەرگای قوتابخانە چوو. من خۆم دەرگاکەم بۆ کردەوە تا بچێتە دەرەوە و دڵنیا بووم لەوەی راستەوخۆ رووەکاتە پیاوە ئاینییە توندڕەوەکان تا ئەو هەستی رقلێبوونەی لەناخیاندایە بەرانبەر شەمس تاو بدات و ئەو دەستەواژەیەی مەولانا تاوانبار دەکات "شەمسم و خودام" بەحەرفی بەگوێیاندا بچرپێنێ.

کاتێ عەلا چووە دەرەوە لە ژووری دوو خۆشەویستەکە نزیك کەوتمەوە، دەنگی مەولانا کز و بەحاڵ دەبیسترا. سەیری ناوەوەی ژوورەکەم کرد. شەمس مێزەرەکەی لابردبوو و پرچە گژنە خۆڵەمێشیەکەی بەسەر شانەکانیدا هاتبوونە خوارەوە. خۆی بۆ داکەندنی چاکەتەکەی ئامادە دەکرد کاتێ گوێم لێ بوو بە رۆمی دەگوت: "دەمەوێ سەرجەم شتەکانت بۆ وەسف بکەم. بەڵام رازیم بەنهێنی پێتیان بڵێم، چونکە وەسف شایستەی تۆ نیە. من بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم لە کانزای خۆم تا بیکەمە رووگەی خۆم، تا رووی تێبکەم، چونکە وردە وردە لە خۆم بێزار دەبم".

بەدەستێکی میهرەبان دەستی دا لە ناوچاوانی رۆمی و درێژەی دایە: "لەوکاتەوە تۆم دیوە ئیتر کتێب سەرنجم راناکێشێ. هیچ کتێبێك نیە وەك تەوێڵی تۆ سوودم پێ بگەیەنێ". قەیرێك سەیری رۆمی کرد، قەیرێکی زۆر، پاشان لەکۆتاییدا پێی وت: "تۆیش لەگەڵم هەڵبێ، بڕوانە".

بە هەمان ئەو وشانە شەمس داوای لە رۆمی کرد لە مەستی بەخەبەر بێ، "ئەو مەستییە نامسۆگەرە"، وەك بۆ هەرکوێ بچوایە ئەمەی دەوت. بەو وشانە داوای لێکرد مەخلوقات بەخەبەر بێنێتەوە و بەرەو حەقیقەتیان ببات.

بەڵێ گوێم لە شەمس بوو بە رۆمی دەوت: "برام دەست بەڕوومەوە مەنێ! تۆیش لەگەڵم هەڵبێ، بڕوانە".

کاتێ ئەم قسەیەم بۆ زریانوسی یۆنانیی هاوڕێم و یەکێك لە موریدە هیندیەکان گواستەوە، کە پێی وتم یەکێك لە ئاینەکانی وڵاتەکەی مرۆڤ فێری ئەوەیش دەکات چۆن بەختەوەریی خۆی بخاتە لاوە، ئەو بەهەشتەی لەکۆتاییدا پێی دەگات —کە پێی دەوترێ "نێرڤانا"— و واز لە سەرخۆشیەکەی بێنێ، تا لەگەڵ پیاوان بمێنێتەوە و بەرەو بەختەوەریی سەخت رابەرایەتییان بکات، بۆ "کەنارەکەیتر"، هەروەها هیندییەکە ئەوەیشی وت ئەوانەی قوربانیدانیان قبوڵ کرد —کە کەمینەیەکی کەمن— ئەوانەی وازیان لە نەمری هێنا تا وەك بەشێك لە جوڵەی توندوتیژی جیهان بمێننەوە، پێیان دەوترێ بوزایستافا.

بەلای ئەو هیندییەوە رۆمی ئەو بوزایستافایە بوو.

کاتێ وەرزی هاوین هات، سەرباری تێکەڵ و پێکەڵیی قسەکانی، سەرباری بازاڕیبوون و ڕەفتارە نالایقەکانی، شێتی و بێئۆقرەیی و نامۆیی کارەکانی،.. سەرباری ئەمانە و بگرە بەهۆی ئەمانەوە، بەگەورەزانین و ڕێزگرتنم بۆ شەمس زیادی کردبوو.

هەروەها سەرباری ساتساتیەکەیشی، شەمس حەزی لە خواردنی میوە نەبوو ئەگەر زۆر سارد بووایە تەنانەت ئەگەر هەر ئێستا لە ژووری ئازوقە دەرهێنرابوایە. داوای لێدەکردین بۆ ماوەیەك لە دەرەوە بەجێیان بێڵین تا بتوانێ بیانخوات، تەنانەت ئەگەر ئەوەیش بکرایە زۆرجار عەیبێکی تێدا دەدۆزینەوە: بەتەواوی نەگەییوە یان ئاودار نیە یان ناشیرینە یان بۆنی نیە.

هەرچیمان بکردایە تا ژەمەکانی بەگوێرەی داوا زۆرەکانی بۆ ئامادە بکەین، هیچی بەدڵ نەبوو. بەگۆشتی برژاو دەیوت زۆر برژاوە، یان وەك پێویست نەکوڵاوە، بۆ برنجیش دەیوت شل وەك پرپۆڵەیە، یان وشکە. جارێکیان دیم بە چێشتلێنەرەکەی دەوت پێویستە چاوەکانی لەسەر ئاگردانەکە لانەدات "تەنانەت بۆ یەك ساتیش"، بەپێداگریەوە دەیوت.

لە هەموو بارەکاندا ئەو خواردنەی لە قاپەکەیدا بوو تەواوی نەدەکرد، کاتێ کەسێك شەرابێك یان کێکێکی پێشکەش بکردایە، هەمیشە داوای نیو جام دەکرد یان نیو کوپ، یان نیو پارچە، بەوە ئەو کەسەی شپرز دەکرد کە خزمەتی دەکرد. بەڵام من هەرکات کوپێکی نیوبەتاڵی شەربەتی نەعناعم ببینیایە، شوێنەواری شەمسی تەورێزیم لەسەری دەبینی.

زۆر حەزی لە خورادنی کاڵەك بوو. شێتی بوو. سوور بوو لەسەر ئەوەی توێکڵەکەی ڕەق و تامی شیرین بێ و بۆنێکی هەبێ لە بۆنی بێستانەکانی تەورێزی زێدی خۆی بچێ. هێشتا نازانم هۆی ئەوە چییە، بەڵام بوومەتە تاکە کەس کە دەتوانێ ئەو شتانەی حەزی لێیانە هەڵبژێرێ. کاتێ کەسێکیتر پێشکەشی بکردایە، تامی پارچەیەکی دەکرد و پاشان دەیتفییەوە بەسەر فەرشەکە یان چاکەتی کەسەکە یان ناو ئاوی حەوزەکە یان جامی شەربەتی نەعناعەکەدا. پاشان دەکەوتە نەفرەتبارانکردنی ئەو کەسەی ئەو کاڵەکەی چاندوە، ئەوەی فرۆشتویەتی و ئەوەیش سەندویەتی. کەس زاتی نەدەکرد بەرپرسیارێتی ئەو کارە پڕ مەترسییە بگرێتە ئەستۆ، من بووبووم بە پسپۆڕی کاڵەکی شەمس. بەناو گۆلە کاڵەکەکانی ناو بێستانەکەمدا لە فالیراس دەگەڕام و بەیارمەتی هاوسەرە گەنجەکەم، چەند کاڵەکێکم هەڵدەبژارد. بۆنم دەکردن، دەمپشکنین و دوعام دەکرد خوایە بەدڵی بێ. پێش ئەوەی بڕیار بدەم چەند کاڵەکێك بۆ شەمسی تەورێزی بڕنم و بۆ ئەوەی لەخۆبایی نەبم، دەتوانم بڵێم مەگەر بەدەگمەن هەڵەم کردبێ.

ئێوارەی ڕۆژێکی ئەو هاوینە خۆشە، شەمس و ڕۆمی و زریانوس و ژمارەیەکی کەم لە هاوڕێیان وەك عادەت چوونە سەربانی ماڵی سەلاحی زێڕنگەر. بۆ فێنککردنەوەی گەرمای زەویی سەربانەکە

خزمەتکارەکان ئاویان پێدا پژاند و چیخێکیان ڕاخست. خۆر لەپشت گومەزی مزگەوتەکانەوە بەرەو ئاوابوون دەچوو و ڕووخسارمانی بە نوورێکی ڕاگوزەر ڕوناك کردەوە.

دەنگی کۆتربازەکە دەگەیشتە گوێمان، پۆلێك کۆتر بەسەرماندا فڕین و پاشان لەسەر ماڵێکی تەنیشتمان نیشتنەوە. جگە لە دەنگی گمەگمیان گوێمان لە هیچ دەنگێکیتر نەبوو. ڕۆمی بەوردی چاودێری دەکردن کە دەنوکیان لە زەوی دەدا و لە لقێکەوە دەچوون بۆ لقێکیتر، جووت دەبوون، لەکۆتاییشدا دەخەوتن. هەردەبێ بیری لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەی عەتار کردبێتەوە بەناونیشانی "لۆژیکی باڵندە: مەقاماتی باڵندەکان". ئاخۆ بوێرم و بەوشەی خۆم دایبڕێژمەوە؟ ڕۆژێ لە ڕۆژان هەزاران باڵندە کە پەپوسلێمانە سەرکردایەتی دەکردن، بڕیاریان دا بفڕن و بەدوای پاشای ڕاستەقینەیاندا بگەڕێن، واتە سیمرغ. لەکۆتایی گەشتەکەیاندا دوای ئەوەی زۆربەی باڵندەکان گەڕانەوە، یان وێڵ بوون، یان کێشایان بەشتێکدا یاخود هەرەسیان هێنا، تەنیا سی باڵندە توانییان بگەنە سیمرغی پاشایان، چونکە سی مرغ بەمانای "سی باڵندە/مریشك" دێ، کە توانییان سەیری ڕووی پاشاکەیان بکەن. کاتێ تەماشای سیمرغیان کرد، سی باڵندەیان بینی، کاتێکیش سەیری خۆیان کرد سی باڵندەکە بینییان ئەوانیش سیمرغن. عەتار وتی: "کەس لە دنیادا شتێکی وای نەبیستوە".

ڕۆمی ماوەیەکی زۆر چاودێریی کۆترەکانی کرد کە بەسەر سەربانی ماڵەکەی تەنیشتدا دەفڕین، پاشان ڕووی کردە شەمس و بەدەم سەرنجلێدانیەوە ئەم دوو بەیتەی خوارەوەی وت:

**شەمس، حەقیقەتی تەورێز، ئێمە گونی باڵندەکەتین،**

**لەژێر پەڕەکەتدا، ئەکولێین، تا ئەو ساتەی ئەفڕی.**

شەمسیش وەڵامی دایەوە: "تۆ، ئەوە تۆی خاوەن جوانییە، منیش ئەو کەسەم خاوەن جوانی و ناشیرینییە پێکەوە. تۆ جوانیەکەمت دیوە، بەڵام ناشیرینیەکەمت نەدیوە. ئەم جارەیان واز لە دووڕوویی دێنم و مومارەسەی ناشیرینی دەکەم تا بەتەواوی بمبینی، لە جوانی و لە ناشیرینمدا".

گومان لەوەدا نیە بەشێوەی "کولان لەژێر پەڕەکەیدا" بیری دەکردەوە و وتی: "ئەوەی وشەکانی من قبوڵ بکات وشەکانی کەسانیتر بە سارد و تاڵ ئەبینێ، لەبەرئەوە بەساردی نامێنێ کە قسە لەگەڵ ئەوانیتر ئەکا، بەڵکو لەبەرئەوەی بەهیچ شێوەیەك قسەیان لەگەڵدا ناکا".

پاشان من حوسام، موریدی گەنج و خاوەن جەستەی وەرزشی، وێرام بێمە ناو ئەو وتوێژەی هەردوو خواوەندەکەم و وتم: "مەولانای ڕۆمی چاکی دەگەیەنێ، بەڵام شەمس نیشانەی چاکی و نیشانەی توندوتیژیشە لەیەك کاتدا".

زریانوس ئەو سەرنجەی منی سووکایەتیکردن بە خۆشەویستەکەی، واتە مەولانا دانا و داوای لێکردم بێدەنگ بم، شەمس بەشێوەیەك تووڕە بوو کە پێشتر بەو شێوەیە تووڕە نەبووە، نەك لە من و نەك لەوەی سەبارەت بە چاکی و توندوتیژی وتم، بەڵکو لە هاوڕێکەم تووڕە بوو کە بەحەماسەوە وەڵامی دایەوە:

"تۆ بێعەقڵیت زریانوس! ئەم حوسامەمان سیفەتەکانی من لەگەڵ سیفەتەکانی خودا بەراورد دەکات کە توندوتیژی و چاکی کۆدەکاتەوە و گوزارشتی لەوە کرد کە لە دەروونیدا کوڵی ئەدا، ئەوەی وتی وشەکانی ئەو نەبوو، وشەکانی قورئان نەبوون، هەروەها کردەوەی پێغەمبەران نەبوو، بەڵکو وشەکانی من بوون کە لە دەمیەوە دەرچوون. ئێستا، تۆ وئەمسالی تۆ، بەعەقڵە سەقەتەکەتەوە خەو بەوەوە ئەبینی لە دوو رۆژدا وەك گەورەترین سۆفیەکانت لێ بێ، وەك ئەبو یەزید و جونەید و شبلی. تۆ خەون بەخواردنەوە لە پێکی ئەواندا ئەبینی. ئای ئێوە چ خەڵکێکی گەمژەن".

نیشانەکانی سووکایەتی لەسەر رووی زریانوس نەخشێنران. پێویستە ئەوەیش بڵێم من لەبەرئەوەی گەنجێکی سەرچڵ بووم بەبێزاربوونی هاوڕێکەم هەستم بەبەختەوەری کرد. بێدەنگیەکی دوور و درێژ باڵی بەسەر موریدەکاندا کێشا، لەپڕ رۆمی قاقایەکی گەورەی کرد، لەبەر ئەوەی دەیزانی موریدەکانی دەرکیان لاوازە بەڵام هەموویان دەیانویست سیمرغی خۆیان، پاشای راستەقینەیان. هەستایە سەر پێ و هەر پێدەکەنی، لە سەربانەکە دابەزی هەر پێدەکەنی، لەحەوشەکە دەرچوو هەر پێدەکەنی. بەتەواوی جلەکانیەوە خۆی فڕێدایە حەوزە ئاوە پڕ لە ماسییە ئاڵتونیەکەوە و هێشتا هەر پێدەکەنی.

ئێوارەیەکیان هەر لەماڵی سەلاح، ئەو شوێنەی مەولانا و شەمس بۆ خەڵوەتەکەیان هەڵیانبژارد، ئاهەنگێکی مۆسیقی و بیستنێکی رۆحی ساز کرا، لەو هۆڵەی کە لە شێوەی داڵانێکدا بوو و دەچووە ناو کۆمەڵێ ژوور، باشترین نای ژەنان و دەفلێدەران و عودژەنان ئەڵقەیان بەست. گۆرانیبێژێك کە خۆشترین دەنگی لەسەر زەوی هەبوو بەهەڵمژینی بۆنی ئاوێتەیەك بخور خۆی ئامادە دەکرد، ئەوە رەچەتەیەکی کۆن بوو بۆ سەردەمی سیحربازانی ئاهورا مزدا دەگەڕێتەوە کە پێش رۆژهەڵاتن ئەو بخورەیان هەڵدەمژی، بۆ خەبەرکردنەوەی جیهانی خەوتوو بە چاوەزارەکانیان.

دەیان چرا حەوشەکەیان روناك کردبوەوە وا دەهاتە پێش چاو وەك ئەوەی بانگی ئاوی ناو حەوزە بچوکەکە بکات تا لەو روناکیەدا بدرەوشێتەوە. بۆقەکان کە شەیدای مانگ بوون سەریان بەرەو مانگ بەرز کردەوە و کاتێ مانگ لەپشت هەورەکان ون دەبوو بەیەك کۆرس ویقەویقیان دەکرد. سەرنجی ئاوەکەم دەدا و چاودێریی سەمای سەرەمێکوتەکانم دەکرد لەسەر رووی ئاوەکە، کە وەك مرواری دەدرەوشایەوە.

رۆمی و شەمس دەست لەناو دەست رۆیشتن، هەردووکیان کەوا (جبە)یەکی لۆکەی نەرم و رەنگ روناکییان لەبەر کردبوو. یەکەم جار بوو ببینم شەمس ئەو جۆرە جلوبەرگە رازاوەیە لەبەر بکات و ئەو کڵاوە لەسەر بکات کە ئێمە ئیتر بە (تاجەکەی) ئاماژەمان بۆ دەکرد. ئەی مەگەر سەری پاشایەکی

نەدەڕازاندەوە؟ لە سەلاحەوە کە دڵۆپ دڵۆپ زانیاری بڵاو دەکردەوە زانیم لە رووی دەرەوەی مێزەرەکەی نووسراوە "الله اکبر"، لە ناوەوەیشەوە لێی نووسراوە "بسم الله الرحمن الریم"، لەسەر ناوچاوانی نووسراوە "لا اله الا الله"، لەپشت سەریشی نووسراوە "محمد رسول الله".

کاتێك نزیك کەوتنەوە لەبەر پێکانیدا خۆم دا بە زەویدا. لەم دواییەدا هەموو بایەخەکانی من لەسەر شەمس بووە. بەبێ ئەوەی بەتەواوی دەرك بەوە بکەم، هەستێکی قووڵ لەناخمدا چەکەرەی بوو کە ئەو پیاوە دیار نامێنێ، یان بێسەروشوێن دەکرێ، یان رەنگە بمرێ. بەخۆمم وت پێویستە بەهەر نرخێك بووە وشەکان و جوڵەکانی و توڕەییەکەی و بێئۆقرەییەکەی و تەنانەت کەللەڕەقیەکەشی تۆمار بکەم، رۆژێکیان گوێم لێبوو دەیوت " تاکە مەخولقی خوام". لە بۆنەیەکیتردا بەسەلاحی وت "ئەگەر کەعبە لە چەقی بازنە لابدرێ، ئەوا سوژدەبردنی ئیماندار روو لەو کەسەی دەبێ کە بەرێکەوت بەرامبەری وەستاوە".

بڕیار وابوو ئاهەنگەکە لە ژوورێکی تەسکدا بەڕێوە بچێ. زریانوس کە هەر ئێستا لای سەرتاشەوە گەڕابوویەوە و ریشی بۆ چاك کردبوو، دەربارەی سەمای "بیستن" پرسیاری لە شەمس کرد، شەمس دەستی رۆمی بەردا و لەسەر پشتیەك لەسەر زەوی دانیشت، کەوتە پرواندنی هەردوو پاچنەکانی دەپرواند وەك ئەوەی بۆ سەمای خولانەوە ئامادەیان بکات، پاشان بەشێوازە باوەکەی وتی:

"لەکاتی سەمای بیستندا پیاوانی خوا زۆربەی کات دەرك بە تەجەلیاتی ئیلاهی دەکەن و دەتوانن ئاسانتر جیهانی بوونیان بەجێ بێڵن. سەمای بیستن لە جیهانەکانیتر رایاندەکێشێ و دەیانبەستێ بەرووی هەقیقەتەوە. جۆرە سەمایەکی بیستن هەیە حەرامە، ئەویش ئەوەیە کاتێك دەست بەبێ عیشق و ئەوین بەرز کرابێتەوە ، لەوێ ئەو دەستە شایستەی جەهەننەمە، بەڵام دەستی بەرزکراوە بە عیشق و ئەوینەوە دەگاتە بەهەشت. سەمایەکی بیستن هەیە رێپێدراوە، ئەویش ئەو بیستنەیە زاهید و خواناسان ئەنجامی دەدەن و خۆیان دەدەن بەدەم ئەشك و دڵنەرمیەوە. لەکۆتاییدا، سەمایەکی بیستن هەیە وەك واجب ئەنجام دەدرێ: بۆ ئەو بوونەوەرانەی ئەم سەمای بیستنەیان هەیە وەك نوێژ وایە، وەك نان و ئاو وایە لە سەختترین کاتدا. کاتێ ئیماندارێکی راستەقینە دەچێتە ناو ئەڵقەی سەماوە حەوت ئاسمان و حەوت زەوییەکان، سەرجەم مەخلوقات سەما دەکەن. سەمای پیاوانی خوا وەك گەڵای درەختێك وایە دەکەوێتە سەر رووی ئاو: لە ناوەوەیدا شاخێکە، لە دەرەوەیدا تاڵە پووشێکە".

شەمس دوو پاژنەکەی لەبیر کرد و ئاماژەی بۆ ئەو سەکۆ تەنگ و تەسکە کرد کە سەمای بیستنەکی لەسەر ئەنجام دەدرێ و وتی:

"کاتێ هەرزەکار بووم خۆشەویستی ئەشتیای وێران کردبووم. ئەگەر کەسێك خواردنێکی پێشکەش بکردمایە بەجوڵەیەکی دەستم خواردنەکەم رەت دەکردەوە. هەندێ جار رازی دەبووم پاروویەك بخۆم بەڵام هەر زوو دەمتفیەوە و لە باخەڵمدا دەمشاردەوە، چونکە ئەو خۆشەویستییە لەناخمدا نیشتەجێ بووبوو،

جارێکیان لەکاتێکدا سەمای بیستم ئەنجام دەدا لەناکاو هاوڕێیەکم کە لە گەرمەی نەشوەدا بوو لەپڕ گرتمی و وای لێکردم وەك باڵندە بسوڕێمەوە. لەبەر دەستیدا وەك پارچە نانێکم لێهات گەنجێك بەهەڵپە قووتی بدات، کەسێ ڕۆژ بێ هیچی نەخواردبێ و لەپڕ خۆی لەبەردەم قاپێ خواردندا ببینێتەوە. وای لێکردم بخولێمەوە و بخولێمەوە و بخولێمەوە. هەردوو چاوی دوو گۆمی پڕخوێن بوون. دەنگێك هات وتی: "هێشتا هەرزەکارەکە لەخۆباییە. لە سوچێکدا بەجێی بێڵە با لەناوەوە خۆی لەناو ببات". سەماکەرەکە بەریدام".

لەکاتی سەماکردنەکەدا بەردەوام ئەوەم دووبارە دەکردەوە "سەمای پیاوانی خوا لە گەڵای درەختێك دەچێ کە دەکەوێتە سەر ڕووی ئاو: لە ناوەوەیدا شاخێکە، لە دەرەوەیدا تاڵە پووشێکە".

وردە وردە هەستم کرد ڕۆمی بێزار بووە لە مانەوە لە ماڵی زێڕنگەرەکەدا، کەسی نەدەبینی، چونکە – جگە لە چەند سەردانێکی کیرای ژنی– ماڵەکەی بەتەواوی بەجێهێشتبوو و دەستی دابووە نوێکردنەوەی دۆستایەتیەکانی. سەرباری مانەوەی بەردەوامی شەمس و سەلاح لەگەڵ مەولانا، ڕۆڵێکی باڵادەستیان لە دڵی مەولانا و ژیانی ڕۆژانەیدا هەبوو، هەموو شت لەو شوێنە دەستی پێکرد کە بەلای ئەوەوە نائاسوودەیی دەگەیاند–نوێنی نەرم و نۆڵ، گەرماوی هەمیشە تازە، ئەو بۆنانەی لە چێشتخانەوە دەهاتن. زۆرجار بۆنی سوڵتان وەلەدی کوڕی دەکرد، کە ئەو ماڵەی بیر دەخستەوە بەجێی هێشتبوو. لەکاتی سەردانەکانمدا بۆ لای، داوای لێ دەکردم بۆی باس بکەم ئاخۆ خزمەتکارەکانی ماڵەکەی باسی چی دەکەن. ئایا کابرای چێشتلێنەر، کە مێرد و باوك بوو، توانی کەنیزەکە ئەسمەرەکە فریو بدات، ئەو کارەکەرە گەنجەی مێردە پیرە پەککەوتەکەی لەم دوواییەدا مرد؟ ئایا هێشتا گومانی هەیە لەوەی سواڵکەرە کوێرەکە کار بۆ بەرژەوەندیی حەسحەسەکە دەکات؟ ئایا باخچەوانەکە هێشتا بەدوای قورئانخوێنە گەنجەکەوەیە کە لە قوتابخانەکەی تەنیشتیان دەخوێنێ؟ بەڵام چ شتێك لە پەیوەندیی نێوان کەنیزەك و چێشتلێنەرەکە گرنگترە، جگە لەو پەیوەندیەی ڕۆژ بەڕۆژ لەبەرچاوانی، لەو خەڵوەتگەیەی بەرەو ئەوە دەچوو لێی بێزار بێ، لەنێوان سوڵتان وەلەدی کوڕی و فاتیمەی کچی سەلاحی دوازدە ساڵاندا، دروست دەبوو.

مەولانا حەوت مانگی رابردووی لە ماڵی زێڕنگەرەکەدا بەسەر برد، دوور لە چاوی مشەخۆران. لەو ماوەیەدا، سوڵتان وەلەد بیانوو نەما بەکاری نەهێنێ تا بێ بۆ سەردانی. ئاخر لە نوێژی بەیانیەوە تا نوێژی عیشا بەدوای فاتیمەوە بوو. رامانی نەمابوو، بەکەمی نوێژی دەکرد، بەدەگمەنیش بەشداریی قسەکانی باوکی لەگەڵ شەمس دەکرد.

هەنگاو بەهەنگاو بەدوای کچی زێڕنگەرەکەوە بوو، کە دە ساڵ لە خۆی بچوکتر بوو، بۆ هەرکوێ بچوایە. کاتێ ئێوارە دەگەڕاینەوە، زێڕنگەرەکە بەشداریی هیچ گفتوگۆیەکی عیرفانی نەدەکرد، بەڵکو قسەکردنی بەدەوری ڕێگەیەکدا بۆ دۆزینەوەی ئاڵتوندا دەسوڕایەوە، کە هۆزێك لە باشوری ئەفریقیا دایهێنابوو کە دەکرێ بۆ دیزاینکردنی ملوانکەیەك لە ئەڵقەی پێکەوەبەستراو بەبێ ئەوەی بەهیچ جۆرێك لەحیم بەکار بێ.

لەو ماوەیەدا رۆمی، کە موریدەکانی لێی مەحروم بوون، فاتیمەی هەڵبژارد تا فێری بکات. کەوتمە غیرەکردن لەو کچە هەرزەکارە پرچ رەش و درێژەی بەبێ حیجاب لەبەردەم مەولانادا دەردەکەوت، لەبەرئەوەی ئەو وانەیەی وەریدەگرت زۆر قووڵ بوو. جارێکیان رۆمیم بینی باسی تەجەلی خوای بۆ مرۆڤ بۆ ئەو کچە دەکرد کە هێشتا پەنجە گەورەی دەستی دەمژی. شەوێکیان، کاتێ خەوی لێ زڕا، شەمس کە لە ماڵی سەڵاحدا دەهات و دەچوو، فاتیمەی بینی وەستاوە لەکاتێکدا ئەوانیتر لە شیرین خەودا بوون. کاتێ لەبارەی هۆی وەستانی بەو شێوەیە لێی پرسی، وەڵامی دایەوە کە ئەو شەو هەر بەوشێوەیە بەپێوە دەوەستێ. کەمی دەخوارد و بەدەگمەن قسەی دەکرد و هەرگیز لەگەڵ ئێمەیش قسەی نەکرد.

نهێنیەکانی بۆ رۆمی نەبێ بۆ کەس باس نەدەکرد، دەستەخوشکی کچی ئەمیرە غوردجی و موعین سلێمان بەڕێوەبەری پێشووی قوتابخانەکە و ئەمیری داهاتووی قۆنیە بوو، ئەو پیاوەی پەنجەی شایەتمانی دەمژێ. ئەو کچەی ناوی عەین بوو بەپێچەوانەی فاتیمە راوەر (زۆربڵێ) بوو. بەدایکی وت کە هاوڕێ کچەکەی باسی دەرکەوتنی دانیشتوانە رۆحیەکانی بەهەشتی بۆ کردوە کە لە بەرچاوی کافراندا دەرناکەون. عەین ئەو کائیناتە ئاسمانیانەی نوور و وزە دەوری داون وێنەکێشا و پیشانی باوکی دان، کە ئەگەرچی لە باوەڕبەهێزترین کەسەکان بوو، هەرگیز ئەو خەیاڵاتەی نەدیبوو. کەسایەتی فاتیمە هەموو ئەوانەی دیوانە کردوە کە سەردانیان کردوە لەسەرووپانەوە سوڵتان وەلەد. سەرباری جیاوازیی تەمەن لەنێوانیاندا زۆر بۆی گونجاو بوو، ئاخر فاتیمەی دامەزراو و نتم و بێدەنگ بەدووروودرێژی قسەی لەگەڵ ئەو دەکرد و جارجاریش هەندێ ئاماژەی خۆشەویستیشی دەدایە. لەبەرئەوە رۆمی بەڕێکەوتن لەگەڵ زێڕنگەرەکە رازی بوو دوو رۆڵەکەیان لەیەك مارە بکەن. کچەکە دوازدە ساڵان بوو، کوڕەکەیش بیست و دوو ساڵ. دەبوو چوار ساڵیتر چاوەڕوان بکەن تا هاوسەرگیری بکەن و بەشێوەیەکی شەرعی چێژ لە چێژەکانی جەستە ببەن.

لە سەرەتای پایزدا، زەماوەندی هاوسەرگیریکردنی شەمسمان لەگەڵ ئافرەتێکی زۆر جوان ساز کرد، کە چل ساڵ لە خۆی بچوکتر بوو، لەماڵی مەولانا گەورە و پەروەردە بووبوو، ناوی کیمیا بوو. عەلایش حەزی دەکرد بیخوازێ.

ئەگەرچی شەمس ئەو ئافرەتەی خۆشدەویست کە لە ئایندەدا دەبێتە ژنی، بەڵام وادیار نەبوو بە بیرۆکەی هاوسەرگیری بەختەوەر بێ، ئێمە سەدقاتی ئەو بەجۆش بووین. رۆمی خوازیار بوو ئەو هاوسەرگیرییە رێگر بێ لەوەی باڵندەکە بفڕێ و لێی دوور بکەوێتەوە. دوای چەند ساڵێك پێی وتم، ئەو لەو ساتەوە بەیەك گەیشتون، هەستی کردوە یەکگرتنە نایابەکەیان زۆر درێژە ناکێشێ.

لە داواکردنی پارەی زۆر لەو کەسانەی دەیانویست رۆمی ببینن، خێرا بووم تا ئەو پارەیە بۆ دابینکردنی خەرجی زەماوەندەکەی شەمس بەکار بهێنین. دەستم بەکۆکردنەوەی پارە کرد، دەبوو سەرەتا ئەو دیارییانە حسێب بکەم کە بنەماڵەی شاهانە پێشکەشیان کردن. کوڕەکەی مەولانا، کە هەمیشە بەحەزەرە،

پێی وتم پێویستە داوای پارەی زۆر لە سوڵتان یان لە ئەمیرە غوردجی خوشکی نەکەین، پێشنیاری کرد مەگەر زۆر پێویستمان پێی بێ ئەگینا داوای هیچیان لێ نەکەین.

پارە لەکوێ بێنین؟ نەدەکرا بۆ نموونە داوای هیچ پارەیەك لە سەلاح بکرێ، چونکە ئەو پیاوە دۆخ مامناوەندە هێشتا پیشەی داڕشتن (سیاغە)ی ئەنجام دەدا، تەنیا باخچەیەکی بچوکی هەبوو زۆربەی کاتی بەتاڵی خۆی تێدا بەسەر دەبرد. دیارە داواکردنی پارە لە یەکێك لە موریدانیتری نزیکی رۆمی وەك زریانوس، شتێکی پێکەنیناوی دەبێ، چونکە دوای ئەوەی وازی لە "بوونی رابردوو"ی هێنا وەك دەڵێ، لە ژیانی رابردووی وەك دز و تاوانبار و پیاوێکی ئیدانەکراو، ئیتر "ئەسپێ لە باخەڵیدا سەوزەڵە خانمی دەوت" ، خەریکە بڵێین هیچی نەبوو. موریدەکانیتریش زۆربەیان هەژار بوون، تەنها یەکێکیان داهاتێکی پێویستی هەبوو، ئەویش من بووم.

رووم کردە هەندێ لە هاوڕێیانی پێشووم. هەندێ پیاوی دەوڵەمەند و بەخشندە و دڵسۆز بۆ ئەو تەریقەت (اخوية) باوکی خۆلێخۆشبووم دایمەزراند و من دوای مردنی هەڵموەشاندەوە. دوای دەمەتەقێیەکی گەرم سەبارەت بەو سوودانەی دەکرێ لە پێشکەشکردنی دیاریەکانیان دەستیان بکەوێ، توانیم قایلیان بکەم بەوەی هەندێ دوگمەی جزدانەکانیان بترازێنن.

پاشان هەندێ حساباتی ئاڵۆزم کرد تا ئەو چەرد پارەیە دیاری بکەم کە بەڕاستی پێویستمە. لەوکاتەدا شەمس دانیشت تا بمبینێ و پێی وتم: "حوسام، ئاین لەو جێیەیە پارەی لێ بێ، شتێك بدە و ببنە خزمەتکار و وەرە نێوانمان".

بۆچی ئاین دەکاتە شوێنکەوتەی ماڵ؟ تێنەگەیشتم.

ئاخۆ ئەمە تاقیکردنەوەیەکی نوێیە؟ گرنگ نیە. تاکە حەزی من ئەوە بوو بچمە قووڵایی ئەو. ئەو نرخەی دەیدەم گرنگ نەبوو، ئەو کەلوپەلەی لە ماڵ هەبوو و تاقمەکانی فەرشە ئەسفەهانی و عاجی هیندی و فەخفوری سواقداروی چینی و فەخفوری سوریم فرۆشت.

"هەموو شت بفرۆشن! هەموو شت!" فەرمانم بە خزمەتکارەکانم کرد.

ئەم وشانەم بەردەوام دووبارە دەکردەوە تا هەواڵیان دامێ هیچ شتێك لە ماڵەکەدا نەماوە ئەوان نەبێ. لەکاتی بیستنی ئەم هەواڵانەدا خۆشیەکی گەرم دایگرتم و وای لێهات لەکۆتاییدا بتوانم ئازادیان بکەم و ئاواتی پێغەمبەر بۆ ئازادکردن بەدیبێنم. پێم وتن: "هەمووتان ئازاد دەکەم وەك رێزگرتن لە خۆشەویستی رۆمی".

بەم شێوەیە خزمەتکارەکان رۆیشتن.

سەربارى داخستنى خەڵوەتگاكە ساليك هێشتا ژمارەيەك لە هاورێكانى پێشووى باوكم لە خانەقاكەدا يەكترييان دەبينى. كاتێك ماڵەكەيان بينى چۆڵ بووە و ژيانى تێدا نيە، زۆر بێزار بوون، بەڵام من گوێم بەو بێزارييەيان نەدا.

هەموو ئەوەى بەلامەوە گرنگ بوو ئەوە بوو لەگەڵ شەمس بەخشندە بم، ئەگەر ناچار بم بێستانەكەى فاليراسيشم دەفرۆشم و بەو پارەيە پێڵاوەكانى شەمس پڕ دەكەم. بەڵام پێويست بەوە ناكات، چونكە ئەو پارەيەى لە فرۆشتنى كەلوپەلى ماڵەكەم و بەخشينەكان بەدەستم هێناوە، زۆر لە خەرجيەكانى زەماوەندەكە زياترە.

بڕيارم دا بڕە زيادەكەيش بدەمە شەمس. شەمس يەك درهەمى لیٚ وەرنەگرتم و داواى لێكردم هەموو شتێك بەسەر هەژاراندا دابەش بكەم. بەبەخشندەيم خۆشحاڵ بوو و وتى "هەڵەشەكان بەرەو مردن رادەكەن وەك چۆن شاعيرەكان بەرەو قافيە و نەخۆش بەرەو چارەسەر رادەكات، هەروەها وەك كە زيندانى تامەزرۆى ئازادى و قوتابى تامەزرۆى پشووى عەسرى رۆژى هەينييە".

خۆم بيرۆكەكەيم تەواو كرد: ئەو تەريقەتەى تێيدا خۆشەويستان بۆ ديارى نەفس تێدەكۆشن".

بەپێچەوانەى نەريت، شەمس بڕيارى دا ئاهەنگێكى بچكۆلانە ساز بكرێ.

داوا لە من كرا خێوەتێك لە ناوەڕاستى حەوشەكەدا هەڵبدەم بۆ پێشوازيكردن لە ژمارەيەك ميوانى بژاردە. دەيان ئاگردان بۆ مێردەكە كە بەردەم سەرمايەتى، ئامادە كران. كيرا ژنى رۆمى ئەو ژوورەى ماڵەكە رازاندەوە كە زۆرترين تيشكى خۆرى بەردەكەوێ (تاب خانە) ، كە مارەبڕينەكە لەوێ ساز دەكرێ و قورئانى تێدا دەخوێنرێتەوە.

شەمس رازى نەبوو مەلايەك لە ئاهەنگى مارەبڕينەكەدا ئامادە بێ، بەڵكو داواى كرد رۆمى چەند قەسيدەيەك لەبارەى هاوسەرگيرى بخوێنێتەوە. هەرسێكيان: رۆمى و كيميا و شەمس لەو دەرگايەوە كە هەندێ بەكراوەيى بەجێهێڵرابوو هاتنە تاب خانەكە. بينيم گەڵاى لەسەر زەوى پڕاوى گوڵەكان و كۆمەڵێ چراى و چرە دوكەڵى بخورم بينى. پاشان دەرگاكەبەدوواياندا داخرا.

دواتر لەرێى رۆمى خۆيەوە زانيم، شەمس داواى لە كيميا كردوە حيجابەكەى لەبەردەم رۆميدا لاببات لەوكاتەى قەسيدەى يەككرتنى دەخوێندەوە. پێى وتم لەكاتێكدا هەندێ قەسيدەى خۆشەويستيى جياوازى بەفارسى دەخوێندەوە، بوككە حيجابەكەى لادا و قژى كە "شەپۆلەكانى دەرياچەيەكى شڵەژاوى لە شەودا" بير خستەوە، هەروەها گەردنى كە سپێتيەكەى نزيك بوو لە سپێتى بلوريى كلوە بەفر كە لە سەرەتاى پايزدا دەبارێ" و كەمەرى كە "بانگت دەكا بۆ لەئامێزگرتنى"، بينى.

شەمس لەو جۆرە پياوانە نەبوو كە بەشداريى كەسانيتر دەكەن، ئەوا كەسايەتييە خۆسەپێنيەى لە پەيوەنديەكەيدا بەمەولاناوە ئاشكرا كرد. ئەو بڕيارى سەردانەكان و سەيرانەكان و ئاهەنگەكان، يان

سازكردنی كۆڕی بیستنی دەدا. تەنانەت خۆشۆردن لە گەرماوی گشتیدا بەمۆڵەتی ئەو نەبووایە نەدەكرا. مەولانا بەسستی ڕێگەی پێدا جڵەوی ژیانی بكات.

دوای ئاهەنگی هاوسەرگیرییەكە كیمیای بوكی گەنج، گواستیەوە بۆ حەرەملك، لەوێ كیرا ئاهەنگێكی تایبەتی بۆ ساز كرد كە تەنیا بۆ ئافرەتان بوو. میوانە نێرینەكان لەو خێوەتەی گەرماكەی بەرز كرایەوە كۆبوونەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی ڕۆمی و شەمسیان دەكرد. كاتێ گەیشتن میوانەكان لەبەردەمیاندا چەمانەوە و هیوای ژیانێكی درێژیان پێكەوە بۆ شەمس و كیمیا —یەكگرتنی "شەمس" و "ئامێزی عارفان"— خواست. پاشان گۆشتی پەلەوەر و گۆشتی بەرخ بەتام و بۆنی لیمۆ و ڕەیحان و سیریان دەرخوارد دابن. دوای ئەوە كۆكتێلێكی نایاب لە كێكی ئاوێتەكراو بەگوڵی پرتەقاڵ و گوڵاو و دۆشاوی هەنار هات. كاتێ سینیەكان هەڵگیران، بۆ لابردنی بۆنی خواردنەكە بخور لە خێوەتەكەدا داگیرسێنرا.

كاتی سازكردنی سەمای بیستنەكە هات داوا لە ژەنیارنان كرا دەف و ڕەباب بژەنن، ڕۆمی و شەمس و ئەوانیدی بە من و سەلاح و زریانوسیشەوە دەستمان بەسەمای بیستن كرد. ژمارەی ئامادەبووان زۆر نەبوون، بەڵام سەرسوڕمانی خۆیان پشاندا بۆ ئەوەی لەو شەوەدا بینیان. لەكۆتاییدا، بەلامەوە سەیر بوو، شەمس لەبارەی سەلاحەوە قسەی بۆ كردم.

"قسەكانی ئەو زێڕنگەرە تێكم دەدەن. من وەك پیاوێك دێمە پێش چاو كە چاودێریی بەهلەوانێك دەكات بەلێبڕان و بەبێ ترس بەسەر حەبلێكی ڕاكێشراودا دەڕوات، لەسەر حەبلێكی بەرز دەڕوات كە وای لێدەكات وا هەست بكات وەك ئەوەی دڵی لەخوێن بەتاڵ دەبێتەوە".

ئەو ئێوارەیە بۆ یەكەم جار لەڕێی شەمسەوە لاكەیتری سەلاحم لەبەر تیشكێكی دیاریكراودا بینی. ئەو لێژگاییەی پێویستە ڕۆمی دوای چەند ساڵێك پێیدا سەر بكەوێ.

دوای ئاهەنگی ژنگواستنەوەكە، وەك باوە وتی وتی دەربارەی بچوكترین وردەكاری پەیوەست بە ژن و مێردەكە بڵاو بوویەوە بوو بە شەوچێرەی خەڵك لە تەواوی شاردا.

لەنێوان حەریمی والی و خەساوەكان و ژنە دۆستەكاندا باس هەر باسی لە جوانیی كیمیا بوو، ئەو ئافرەتەی بوو بەو لقە دارەی —كە ئەوە ئومێدی ڕۆمی بوو— شەمسی باڵندە لەسەری ئۆقرە دەگرێ و بۆ هەتا هەتایە هێلانەی لەسەر دەكات.

فزولم پاڵی پێوە نام لەبارەی هاوسەرگیریەكەی پرسیار لە شەمس بكەم بۆ ئەوەی تۆماری بكەم. دەبوو بەزیرەكی و وریاییەوە پرسیارەكان بكەم. دەبوو بەپێی توانا لەكاتی قسەكردن لەگەڵ شەمسدا زۆر وریا بم، چونكە لەوانە بوو لەبەر بچوكترین شت توڕەبوونەكەی بتەقێتەوە: شێوەی ئەو خۆشەویستییە چیە كە بەرامبەر كیمیا هەیەتی؟ ئایا لەو خۆشەویستییە دەچێ كە لەگەڵ ڕۆمی یەكیخستووە؟ ئایا ئەو گەورەترە؟ ئایا خۆشەویستیەكی جیاوازە؟ وەك عادەت وەڵامەكانی چاوەڕواننەكراو وشپرزەكەر بوون.

وتی: "من دان بەخۆدا دەگرم. خەڵك لەمنەوە ئارامی فێر دەبن. ئەزانی ئارامگرتنی من لەگەڵ کیمیا تا چ رادەیەکە؟ ئەو وا دەزانێ خۆشم ئەوێ، بەڵام لەراستیدا من خوام خۆشەوێ. هەندێ وابیر ئەکەنەوە کە من بەرەقی لەگەڵی دەجولێمەوە لەبەرئەوەی ئەمەوێ ئەوەی هەیەتی لێی بسێنم. من ناهەقیان ناگرم، لەوان و لەویش خۆش ئەبم. ئەو رۆژە چووم بۆ ماڵیان هەستم کرد ئەندامانی خێزانەکەی پێیان سەیر بوو وەك ئەوەی بە من بڵێن: "چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟". پێویستم بە کاتێك هەبوو تا چاوم بە بینینی دیوار و مافورەکان رابێ. بۆ ئەوەی لەجێیەك دابنیشم، پێویستە ئولفەت بگرم، جا یان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەوێن یاخود لەگەڵ دیوار و کەلوپەلەکان. پاشان گوێم لە کیمیا بوو دەیوت: "وەرە و مێردەکەم ببینە"، پاشان کەسێکم دی لەلایەکەوە سەرەتاتکێی بوو، لەولایترەوە یەکێکیدی سەرەتاتکێی بوو. کیمیا ئەوەی پێ خۆشبوو.

هەموو ئەمانە بۆ ئەوەی پێت بڵێم ئەو ئارامییەی بۆ کیمیای ئەنوێنم هیچ نیە بەبەراورد بە ئارامیی راستەقینەم. پەشیمان بوومەوە بۆ ئەو پارەیەی دام پێی، بەڵام من لەپێناوی خوا ئەیدەمێ تا فێری شەترەنجم بکات. نموونەیەکی ترت پێ بڵێم: چەند رۆژێك لەمەوبەر بینیم جاجمی ئەفرۆشت. خەڵکانی زیرەك هەر هێندەی شەمس ببینن دەست ئەکەن بە فرۆشتنی جلوبەرگە زستانەییەکانیان. بەڵام لە رۆژە باراناویەکاندا، کاتێ بەفر دەبارێ، کاتێ چیا سپییەکە سڵاو لە شارەکە دەکات، ئەوکاتە ئەو خەڵکانە لە سوچێکی ماڵەکانیاندا کسکۆڵە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە لەوەی ئەو جلانەیان فرۆشتوە، کە گەرمیان دەکاتەوە. دەی حوسام، ئەوەی بۆم گێڕاویتەوە هەر ئێستا کورتی بکەوە بزانم چۆن دایدەڕێژی".

ئەوەی وتی بەباشترین شێوە کە لە توانامدا بێ کورتم کردەوە. وادیار بوو قسەکانمی پێ خۆش بوو. بەڵام کاتێ پاشتر ئەوەی نووسیبووم خوێندمەوە، بینیم ناهەقی نەبووە کە داوای کرد قسەکانی بۆ دووبارە بکەمەوە، چونکە قسەکانیشی وەك باڵندە دەهاتنە پێش چاو و لەم چڵ بۆ ئەوچڵ دەفڕین.

لە پایزی ئەو ساڵەدا کە کۆتایی دابڕانی نێوان شەمس و رۆمی لەگەڵ خۆیدا هێنا، کە مەولانا لە قەسیدەی یەکەمی قورئانە سۆفیەکەیدا، واتە مەسنەوی، بەراوردی کردوە، کاتێ باسی دابڕانی نای لەو دارستانە کردوە کە تێیدا پێگەیشتوە، ئەو دابڕان (فیراق)ـەی بوو بەهەوێنی نزیکەی پەنجا هەزار بەیت لە قەسیدەی خۆشەویستی کە بۆ چەندین سەدەی داهاتوو و رەنگە بۆ هەتاهەتایە، عەزابی فیراق و جیابوونەوە و پەرتەوازەییان لە دڵی عاشقاندا بەرجەستە کرد، بانگهێشتی شەمسم کرد تا لەناو بێستانەکەمدا لە فالیراس پیاسە بکەین. لەو جۆرە پیاوانە نەبوو کە خشەخشی گەڵای درەختەکان، یان ئەو هەنگاوانەی گەڵاکانیان لەژێر پێکاندا پلیشاند، یان جوڵەی کچی باخەوانەکە کە لەنێوان دوو درەختدا جۆلانێ دەکات، یان تەنانەت باخەوانەکە خۆی کە وەك هەموو باخەوانەکانیتر بێزارە و بۆڵەبۆڵیەتی لە کەشوهەوای خراپ یان کۆچکردنی لەقلەقە هاوئاهەنگەکان، بیوروژێنن. هەموو ئەوانەی بە چاوێکی جیاواز

دەبینی، چونکە بەلای ئەوەوە وردەکاریەکانی جیهان عاشقانن، هەموو وردەکاریەك لە گەردووندا عاشقی رووییەکە، تا رادەی نەشوەی خۆشی.

کاتێ پاشتر شەمس ون بوویەوە، مەولانا دەربارەی ئەم خۆشەویستییە سەرتاپاگیرە نووسی:

ئەگەر خۆر عاشقیش نەبووایە،

ئەوا نوور لە جوانیەکەیدا ئۆقرەی نەئەگرت.

ئەگەر زەوی و چیا عاشق نەبوونایە،

رووەکێك لە دڵیاندا نەئەڕوا.

ئەگەر دەریا هەرگیز خۆشەویستی نەزانێ

ئەوا لەکۆتاییدا شوێنێکی ئەبێ تێیدا ئاسوودە بێ.

بەهەندێ رێڕەودا چووین کە لە هەردوولاوە درەختی سوورە چنار و درەختی ئاسایی و درەختی سەرو تەنیبوویان. شەمس بەهەندێ بێبایەخییەوە سەرنجی گژوگیای راخراوی لەوەڕگەکە و درەختۆکەکانی تەختەی بەقسی دا، کە بەوریاییەوە رێك کراون. دەبێ پرسیبێتی ئەم هەموو بایەخدانە بە رێکخستن و رێککردن چ مانایەکی هەیە. بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی بەسەر لمەکەدا نەخزێ داوای لە باخەوانەکە کرد زەوییەکە بە حەسیری خەیزەران دابپۆشێ، تا بتوانین لەپاڵ سەبەتەی پڕ لە گوڵە شلێر و نێرگس و گوڵەهەڵمەڵەدا دابنیشین. سەرباری رێزی زۆرم بۆی، کەمێك هەستم بە دڵتەنگی کرد، لەبەرئەوەی هیچ بایەخێکی بەو کۆششانە نەدا کە من بۆ دڵدانەوەی بەڕێزەوە بەخەرجم دابوو.

ژنەکەم هات، کە دوای چەند مانگێك دووگیان بوو، تا سڵاو لە شەمس بکات و دەستی ماچ کرد، پاشان لێی پرسی ئایا رازی دەبێ منداڵەکەی کە دوای سێ مانگیتر لەدایك دەبێ، فێری قورئان بکات. وەڵامەکەی گڵماندن بوو، بەئاماژەیەکی دەستم داوام لە ژنەکەم کرد بڕوات و بەتەنیا بەجێمان بهێڵێ، تا میوانەکەمان بێزار نەکەین.

هەستم کرد ساردییەکی نەبوو دزەی دەکردە ناو جەستەی شەمس، ساردیەکی هاتوو، پاشان هەستکردنی بەردەوامی بەسەرما بیر خستمەوە بۆی باس کردم کە چۆن کاتێ دەست بەپارچە کانزایەکی دوور لە خۆرەوە بدات موچرکەی سەرما بەسەر و خواری برِبڕەی پشتیدا دێ. هەروەها وتی، پاش ئەوەی خۆی دەشوا پێویستی پێویستی بە چەند سەعاتێك هەیە تا وشك ببێتەوە، هەروەها هیچ خاولیەك ناتوانێ دڵۆپە ئاوە یاخیەکان هەڵبمژێ کە سەرباری یاسا فیزیاییەکانی سروشت لەسەر پشتی کۆ دەبنەوە بەتایبەت لەنێوان ئێسکەکانی هەردوو شانیدا. پاشان تیۆرێکی تەواوی لەبارەی پێکهاتنی تایبەتی پێستی

دانا کەوا دەکات هەستی بەرکەوتنی ئەو جیاواز بێ لە هەستی بەرکەوتنی هەر کەسێکیدی. هەروەها زەحمەتیی لابردنی ئەو بۆیانەی بەپەنجەکانیەوە دەلکێن و دەمێننەوە، لەبەرئەوە هەموو ئەوەی دەیکرد ئەوە بوو پارووپەك برنج بە زەعفەران بەپەنجەکانی و بەپەنجەی شایەتومانی کە رەنگی مرەکەب داپۆشیبوو، بخوات تا رەنگی زەعفەرانی زەردی مەیلە و پرتەقاڵی بگرێ.

لەپڕ پەنجەکانی درێژ کرد تا تێورەکانی لەبارەی پێستی خۆیەوە بسەلمێنێ و وتی دوای ئەوەی چەند دانە گوێزێکی تازەی قاژ کردوە نینۆکەکانی بەهەمیشەیی رەش بوون. لە نینۆکە تاریکەکانی ورد بوومەوە و هەولّم دا لە زاکیرەی خۆمدا پارێزگاری لە هێڵە کێشراوەکانی سەر دەستی و پەنجە درێژەکانی بکەم کە ناتوانرێ هیچ ئاسەوارێکی کاری دەستیان پێوە ببینرێ. لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارم کرد، چونکە لە ماوەی گەشتە دوور و درێژەکەی گەڕان بەدوای رۆمیدا بەدڵنیاییەوە کاری بۆ بەدەستهێنانی بژێوی خۆی کردوە. هەردوو دەستیم گرت و بۆ ماوەیەکی زۆر ماچم کردن، تەنانەت نینۆکە پیسە لەسەرما شین هەڵگەڕاوەکانیم دەپەرست. دەنگێگی کپ بەناخمیدا چرپاند کە بوونی مەزنی شەمس بەمزوانە لە ونبوونێکی دوور و درێژی سەخت زیاتر نابێ. دەتوانم ئەو رۆژە ببینم کە تێیدا پێویستە لەسەرم لەسەر بۆشایی و خەسارەت رابێم. دەنگەکە بەردەوام دەیچرپاند کە ئەم ونبوونە رۆژێ لە رۆژان دەبێتە بڵندبوونەوە.

دەستەکانی لە لێوەکانم کێشایەوە و کەوتینەوە گەڕان بەناو بێستانەکەدا. پاشان لەپڕ کەوتە باسکردنی منداڵێتیی خۆی. ئەوەم بەلاوە سەیر بوو. هەرگیز لێم نەبیستوە بەو روونییە ئەوەی لەبارەی رابردووی خۆی لەناخیدا گینگڵ دەخوات باسی بکات.

"کاتێ منداڵ بووم، خوام بینی، مەلائیکەم بینی، نهێنیەکانی هەردوو جیهانی باڵا و نەویم بینی. پێم وابوو زۆربەی پیاوان ئەوەیان بینیوە کە من بینیم، بەڵام هەر زوو زانیم ئەوان هیچیان نەبینیوە. پێش باوکم رواڵەتی دەرەکیی خواپەرستیی خۆمم بۆ کەس ئاشکرا نەکرد. جا چۆن ئەکرێ ئەوەی لە ناخمدا گینگڵ دەخوات، یان حەزەکانم باس بکەم؟ پیاوێکی نەرم و بەخشندە بوو، کەسێك دوو وشەی نەرمی بوتایە ئەگریا، لەکاتێکدا عاشقیش نەبوو. جیاوازی هەیە لەنێوان پیاوی چاك و عاشقدا".

بێدەنگ بوو. وەك عادەتی خۆی وشەکانی پڕبوون لە لوغز. هەولّم دا بەقووڵی بیریان لـێ بکەمەوە. تەنانەت تەماشای دار پرتەقاڵ یان دار لیمۆکانی نەکرد کە لەژێر بەرەکانیاندا نقەیان دەهات، کە ئەوە جێی شانازی باخەوانە. بێدەنگیەکەیم قۆستەوە و داوام لە باخەوانەکە کرد نانێکی نەرمی لەسەر بەرد برژاومان لەگەڵ کەمێك پەنیری شیری مەڕمان بۆ بێنێ. جارێکیتر دەنگی بەرز بوویەوە. ئەم جارەیان کەوتە باسکردنی مەولانا وەك ئەوەی ئەوە، یادەوەری گێڕابێتەوە.

"من ئاوێك بووم له ناخمدا دەكوڵا، قوڵپی دەدا و بۆنێكی ناخۆشی لێ بەرز دەبووەوە. لەپڕ مەولانا هات و قوڵنگەكەی پێدا كێشام و ئاوەكە فیچقەی كرد. ئەوەتا ئەمڕۆ بەخۆشی و بەهێمنی و ڕەزامەندیەوە هەڵدەقوڵێ".

گەڕایەوە بۆ منداڵیی خۆی.

"باوكم هیچی لەبارەی منەوە نەئەزانی. بەغەریبی له شارەكەمدا ئەژیام. باوكیشم بەلای منەوە غەریب بوو. دڵم حەزەری لێدەكرد. هەمیشه وام بەخەیاڵدا ئەهات كه لێم ئەدات. لەگەڵ ئەوەی بەنەرمی قسەی لەگەڵ ئەكردم، بەڵام من وا گومانم ئەبرد كه لێم ئەدات، لەماڵ دەرم ئەكات. منداڵ بووم كەس له هەستەكانم تێنەئەگەیشت. باوكم ڕاستی هەستەكانمی نەئەزانی. ڕۆژێكیان هەوڵی دا پێم بڵێ "تۆ شێت نیت..." بەڵام من دەستبەجێ وەستاندم و پێم وت "گوێ بگره چیت پێ ئەڵێم. تۆ وا مامەڵەم لەگەڵ ئەكەی وەك ئەوەی مریشك بی و هێلكەی مراوی بكەی و بەچكه مراوی بەخێو بكەی، كاتێكیش گەورە ئەبن لەگەڵ دایكیان ئەڕۆن بۆ كەناری جۆگەلەكه و باز ئەدەنه ناو ئاوەكە. دایكیان، واته مریشكەكه تا كەناری جۆگەلەكه ئەچێ بەڵام دانابەزێته ناو ئاوەكە. ئێستا باوكە، من ئەبینم ئۆقیانوس ئەبێته كەشتیم. وڵاتم. ئەمە مەرجی منه. ئەگەر تۆ هی منی یان ئەگەر من هی تۆم ئەوا لەو ئۆقیانوسەدا نوقمبە، ئەگینا بڕۆ و لەگەڵ مریشكەكه بوەستە". باوكم وەڵامی دامەوە "ئەگەر تۆ بەم شێوەیە لەگەڵ دۆستت ڕەفتار بكەی، ئەی چۆن لەگەڵ دوژمنەكەت ڕەفتار ئەكەی؟".

نان و پەنیرەكەمان بەش كرد.

## تۆم بەتەنیا بینی

عەلا کوڕە کینە لەدڵەکەی رۆمی هەر لەمنداڵیەوە حەزی لە هاوسەرگیری لەگەڵ کیمیا بوو کە بوو بەژنی شەمس. هەمووان ئەوەیان دەزانی، تەنانەت رۆمی کە سەرباری ئەوەیش کچەکەی بۆ ئەو پیاوەی عەلا زۆر رقی لەدڵدایە بۆی مارە کرد. لەو کاتەوە ئەو گۆڕانکارییە بەسەر باوکیدا هات و وازی لە وانەوتنەوە و وتاردان هێنا و لە سازکردنی کۆڕی مۆسیقا و بیستن بەردەوام بوو، عەلا شەمسی بە ساختەچی و جادوگەر وەسف دەکرد. کاتێ شەمس رۆیشت، عەلا هیوای خواست جارێکیتر سێبەری لە باخچەی ماڵی خێزانەکەیدا دەرنەکەوێتەوە.

سەرباری ئەو ئازارەی دڵی باوکی دەگوشی، عەلا هیواخواز بوو بەتێپەڕینی کات ئەو ئازارە نەمێنێ. بەرگەی ئەو هەڵوێستە باشەیشی نەگرت کە سوڵتان وەلەدی برا گەورەی دەینواند، کە لە یەکەم رۆژەوە خۆی خستە خزمەتی ئەو پیاوە غەریبە کە کەس نەیدەزانی ناوی راستەقینەی چییە و ئەسڵ و فەسڵ و پیشەی چییە. ئەو غەریبە کە توانی باوکیان لە خێزانەکەی و موریدەکانی دابڕێ و ویستی خۆی بەسەریدا سەپاند و وای لێکرد لە ئەنجامدانی خەڵوەتی ئاینی لەگەڵیان بێنێ و خوێندنەوەی کارە مەزنەکانی رابردووی لێ قەدەغە کرد، بگرە ئابڕووچوونەکە گەیشتە لوتکە کاتێ لەسەر ئەوانەی دەیانویست سەردانی رۆمی بکەن فەرزی کرد بڕێك پارە یان دیاری پێشکەش بکەن.

بەڵام بۆچی سوڵتان وەلەد، سەرباری هەموو ئەوە، لە یارمەتیدان و پاڵپشتیکردنی ئەو پیاوە بەردەوام دەبێ، ئەو پیاوە کە بووەتە بایسی هەزار پشێوی؟ دەبێ سوڵتان وەلەدیش وەك باوکی عەقڵی لەدەست دابێ، بگرە رەنگە دڵیشی لەدەست دابێ.

عەلا بەو داڵانەدا تێدەپەڕی کە بەبەردەم ژووری نووستنی کیمیادا تێدەپەڕی و بەئەنقەست تیلەی چاوێکی دەگرتە ناو ژوورەکە، بەڵام دوای هاوسەرگیریەکەی لەگەڵ شەمس، شەمس لە نزیککەوتنەوە لەو ژوورە قەدەغەی کرد و پێی وت: "من قەدەغەت دەکەم لە نزیککەوتنەوە لەم ژوورە و بێزارکردنم. ئەم ژوورەم بۆیە هەڵبژاردوە، لاچەپ و دابڕاوە".

پاشتر بۆ سووککردنی رادەی توندیی قسەکانی شەمس، وتیان گوایە شەمس قەت هەڕەشەی لە کوڕی مەولانا نەکردوە، تەنانەت ئەگەر عەلا گوناهبار و شیاوی سەرکۆنەکردنیش بێ، بگرە تا رادەیەك چاوەچاویشی کردبێ. بەپێی ئەوەی ئەو هەواڵدەرانە باسیان کردوە، کە توانای جوانکردنی تاڵترین دەربڕینیان هەیە، شەمس بەعەلای وتوە: "ئەی نووری چاوم، لەگەڵ ئەوەی تۆ هەرچی سیفەتی چاکەیە تێتدایە لەناوەوە و دەرەوەت، پێویستە لەمەولا بەئەدەبەوە بێیتە ناو ئەم ژوورە"، چونکە هەرکەس شەمس بناسێ دەزانێ ناکرێ ئەم جۆرە وشانە لە زمانە زبرەکەیەوە دەربچن.

ئەو رقەی عەلا بەرانبەر بەو پیاوە کە بەجادوگەر ناوی دەبرد لەدڵیدا حەشار دابوو گەیشتبووە لوتکە. عەلا یەك جوڵەی نەدەکرد بەبێ ئەوەی رەخنە لەو پیاوە بگرێ و سەرکۆنەی بکات و جوێنی پێ بدات.

دوژمنەکانی کە لە هەموولا بڵاو بوون کەوتنە چپەچپ و پیلانگێڕان و مانۆڕکردن. عەلا ئامادەی سەرجەم کۆبوونەوەکانیان بوو، چ ئەوانەی لە بازاڕ دەبەستران یان لە گەرماوی گشتی یان لە قوتابخانە یان لە خانەکەدا. زیرەکانە تووڕەییانی تاو دەدا و داخی شاراوەی ناو دڵیان دەوروژاند. هەندێ قسەی دەشێواند یان هەڵدەبەست کە کوفریان دەگەیاند و دەیدانە پاڵ شەمس و گاڵتەی بە هەڵسوکەوتەکانی دەکرد، کە کۆمەڵێ دەربڕین بوون بەڕاستی بۆ کەسە ئاسۆ تەسکەکان نامۆ بوون. بەم شێوەیە عەلا دەمارگیریی دەمارگیرانی تاودا و بیرۆکەی کوشتنی ئەو کەسە ئێسکگرانەی لەناویاندا بڵاو کردەوە، ئەو مشەخۆرەی وای کرد باوکی مەودایەکی گەورە بڕوات تا ئەو رادەیەی لەگەڵ خودا بتوێتەوە. ژمارەی ئەو پیاوە کینەبازانە لە زیادبووندا بوو، هەندێ قوتابی پێشووی مەلاوناشیان لەناودا بوو کە دەرگای قوتابخانەیان بەڕوودا داخرابوو، ئەو نووسەرانەی کتێبەکانیان خرانە لاوە، ئەو دەوڵەمەندانەی بەبێبایەخیەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا، هەروەها ئەمیر کە چیتر کەس بۆی نەدەچەمایەوە. هەموو ئەوانە لەگەڵ عەلا پیلانیان دژی شەمس گێڕا.

رۆژێکیان، لە ناوەڕاستی پایزدا عەلا هەستی کرد کاتی ئەوە هاتووە ئەو چپەچپانە بگۆڕێن بۆ پیلانێکی راستەقینە. گەرماوی دافالی هەڵبژارد، کە بە زەخرەفەی کاشییەکانی بەناوبانگە، کە لەبەردی لاکێشەی سوور و زەرد و رەش دروست کراون و مەرمەڕی سپی داپۆشیون. عەلا بەنهێنی چاوی بە دەستێدەرەکە دەکەوت کە لەگەڵ چوار پیاویتر کە خوازیاری مردنی شەمس بوون بەشداریی پیلانەکەی کرد. لە نهێنیپارێزیدا قایم بوون. لای حەوزە بازنەییەکەی ناوەڕاستی گەرماوە هەڵمییە هەشت لاکەدا بەیەك گەیشتن. هەڵم و دڵۆپە ئاوەکان دەموچاویانی دەشاردەوە. خاولی درێژی سوور و شین جەستەی داپۆشیبوون. بەگەڵای وشکی زەیتون یان سابون دەستیان دەدایە لەشیان. دەستێدەرەکە کە جگە لەوان رێگەی بەکەسیتر نەدا بێتە ژوورەوە، ئەو خشتانەی پاك دەکردەوە کە بەلوعەیان پێوە بوو لە چەند کونێکی جێگیرکراو لە دیوارەکەدا ئاوی گەرم و ساردیان لێوە دەهاتە ژوورەوە و لەگەڵیان بەشداری ئاهەنگی تۆمەتبارکردن و ناڕەزایی و سکاڵاکاندا دەکرد. گەنجێکیان، کە پێشتر قوتابی رۆمی بوو و شەمس دەریکردبوو، دەستی کرد بەتاشینی سەری و ئیتر سەرە کەچەڵەکەی لەو ژوورۆچکەیەدا دەبریسکایەوە کە دەکەوتە لەنێوان دەروازەکە و حەمام بوخارەکەدا. رەخنەی دەگرت کە مەولانا لەو کاتەوە ئەو جادوگەرە "کوێری" کردوە ژیری لەدەست داوە. عەلا وتی: "باوکم هەناسەی خۆی لە کێڵگەیەکدا بەند کردوە کە بەرخە شەیتانی تێدا بەخێو دەکرێ، بازنەیەکە مشتێك تاوانباری وەك زریانوسی یۆنانی و نەزانی وەك

سەلاحی زێڕنگەر و زۆرانبازی گەمژەی وەك حوسام نەبێ، قبوڵی ناكات. لەوە بەدتر ئەوەیە هەموویان وەك شەمس ساختەچین".

ئەوە كتێبفرۆشەكە بوو كە باشترین كڕیاری واتە رۆمی، لەدەست دا، چونكە چیتر كەس هیچی لە قوتابخانە نەدەخوێندەوە، ژوورۆچكەكەی ناوەڕاستی بەجێهێشت پاش ئەوەی بەهۆی چارەسەركردنی بەجامی كەڵەشاخگرتن تووشی خوێنبەربوون بوو، وەك لە باندجی نێوان ئێسكی هەردوو شانەكەیەوە دیار بوو.

بەپێكەنینەوە لەبارێكدا كینەی لێ دەچۆڕا وتی: "دەڵێن رۆمی چیتر ناچێتە لای ژنەكەی، هەموو هەست و سۆزی خۆی تەرخان كردوە بۆ شەمس. چۆن دەكرێ كەسێك ئافرەتێكی جوانی وەك كیرا پشتگوێ بخات و خۆشەویستیی خۆی ببەخشێتە دەروێشێكی پیری لەڕ و لاواز، كە لە سەرمادا دەلەرزێ؟.

پیلانگێڕی سێیەم، قازیەك بوو بەرگەی ئەو "فەوزا"یەی نەگرت كە سەماكەمان دروستی كرد، لەسەر كورسیەكی مەڕمەڕ دانیشت، گۆشتە تێسپڕاوەكەی نمایش دەكرد پاش ئەوەی مووی هەردوو بنباڵ و سینگی لادەبرد. ئەو پیاوە كە خۆی بەنووسەر دەزانی بەدڵپیسانەوە وتی: "پێویستە مرۆڤ لەیلا بەچاوی مەجنون ببینێ".

دیارە بەوە ئاماژەی بۆ ئەو چیرۆكی خۆشەویستییە دەكرد كە هەموومان لەبەرمانە. ئەوە بوو مەجنون شەیدای لەیلا بوو، بەوهۆیەوە شێت بوو، وێڵی بیابان بوو و بوو بەدۆستی دڕندە كێویەكان. خەلیفە هارون ئەلڕەشید داوای كرد لەیلا بێنن، تا لەنزیكەوە ئەو ئافرەتە ببینێ كە عەقڵی مەجنونی نەهێشتوە و وای لێكردوە وێڵی بیابان ببێ و چیرۆكەكەی بووەتە ئاوێنەی سەرجەم عاشقانی راستەقینە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا.

پارەیەكی زۆر خەرج كرا. هەزار و یەك فێڵ و تەڵەكە كرا بۆ ئامادەكردنی لەیلا لەبەردەم خەلیفەدا. بەفەرمانی ئەو برایە حەرەمسەرا كە پاش تاریكبوون مۆمەكان داگیرسێنران. كاتێ خەلیفە گەیشت ماوەی كاتژمێرێك لێی ورد بووەوە، بەڵام لە نهێنی ئەو عیشقە ئەفسانەییە تێنەگەیشت. بەخۆی وت دەبێ وای لێبكەم قسە بكات بەڵكو قسەكەی ئەو شتە سەیرە لە روومەتیدا دەربخات. رووی كردە لەیلا و وتی "ئەوە تۆی مەجنون بەهۆتەوە پەرێشان و سەرگەردان بووە؟ جوانیی تۆ لە جوانیی كچانیتری شۆخ و شەنگ زیاتر نیە!" ئەویش وتی "بەڵێ من لەیلام، بەڵام تۆ مەجنون نیت! ئەو چاوەی لەسەری مەجنوندایە لەسەری تۆدا نیە. ئەگەر دەتەوێ جوانیی من ببینی، بەچاوی مەجنون تەماشای بكە".

كاتێ ئەم چیرۆكەی باس كرد، دیار بوو پیاوە سەرتاشراوەكە دەیویست بڵێ تۆ ئەگەر دەتەوێ زاڵكردنی جوانی شەمس بەسەر جوانی كیرادا ببینی، پێویستە بەچاوی رۆمی ببینی.

دەستێدەرەکە کە هێشتا خەریکی خاوێنکردنەوەی خشتەکان بوو ساتێك وەستا و بەشانازیەوە وتی: "من لەگەڵ وەزیری گەورەیش کار دەکەم و دەتوانم بۆتان دووپات بکەمەوە کە ئەوانیش لەویَ، لە کۆشك، هەست بە بێزاری دەکەن لە شەمس و دەڵێن ئەو پیاوێکی سپڵە و نمەکنەناسە بەرانبەر ئەوانەی چاکەیان لەگەڵ کردوە،.. ئەو وەك پشیلە وایە...".

عەلا بە شانهەڵتەکاندنەوە قسەکەی بۆ تەواو کرد و وتی "پشیلەیەك بووەتە خوایەك".

جا نەفرەتکردن لەو ناوە کلاشەی دەکرد. ئەم کفرە، واتە یەکگرتنی شەمس لەگەڵ خوا، وای کرد سەرجەم پیلانگێڕان لەیەك کاتدا قسە بکەن. ئەگەر ئەم قسانە لەسەر تاسەری قۆنیەدا بلاو ببنەوە هەر کەس دەیکاتە ئەرکی خۆی ئەو پیاوە پیرەی کە خۆی بەخالق دادەنێ، بگرە لەوە خراپتر ئەو کەسەی رێگەی بەوانیتر داوە بەخوای بچوێنن، سەرکۆنە بکات، لێی بدات و بەردبارانی بکات، بگرە تەنانەت بیکوژێ. پیاوەکانیتر بێدەنگ بوون. لە حزوری کوڕە بێزراوەکەدا کەس نەیوێرا راستەوخۆ رۆمی تۆمەتبار بکات، بۆ سووککردنی توندیی تۆمەتبارکردنەکەی، وتیان ئەو لەلایەن ئەو پیاوە تەورێزییەوە دووچاری خراپترین جۆرەکانی سیحر و خەڵەتاندن و فریودان کراوە، تاکە عەیبی مەولانا خەمساردی و نەرمییەتی لەگەڵیدا، دەبوو بزانێ چی بەسەر دێ، هەروەها دەبوو ئەوانیش رێگە بگرن لەوەی خەوە دوور و درێژەکەی بگۆڕێ بۆ لاوازی و لەبیر چوون و غیابێکی هەمیشەیی.

"پشیەلەیەك بووەتە خوا!!" عەلا پێش ئەوەی تیرە بکوژەکەی بهاوێژێ، وای کرد ئەم دەستەواژەیە بکەوێتە دوای هەموو ئەو نێو چاوانانەی چین چین ئارەق دەردەدەن.

"ئەگەر ئەم حەوزە بیتوانیایە قسەی بکردایە، لە حرس و تورەیی تۆی بەرامبەر شەمس زیاتر دەکرد. بڕوانە ئەو گەرماوە، ئەو گومەزە بچوکانە و دەلاقەکانیان، بۆ ئەو پلێتە شووشانە، بۆ ئەو ژێرخەرە مەڕمەڕانە، ئەو ئاوەی خۆمانی پێدەشۆین، هەموو ئەوانە شایەتی خراپترین تاوان بوون کە بکرێ پیاوێك بەیەکێکی ترەوە ببەستێتەوە. شەمس و پیاوەکانی باوکمیان هێنا بۆ ئێرە و جلەکانیان لەبەر داکەند و هانیان دا بەرووتی سەما بکات و دابەزێتە ناو ئەم حەوزە کە لە پیاوانی رووتدا جمەی دێ، لەشیان کە لەژێر ئاوەکە بەپێی ریتمی تەپڵ و ئاوەکە دەجولان، بەر یەك دەکەوتن. تەنانەت ژەنیارەکانیش وەك کرمی زەوی رووت بوون، تەنانەت بەبێ ئەم خاولیەش کە داماندەپۆشێ".

لەگەڵ بیستنی ئەم قسانەدا، یەکێك لە پیلانگێڕەکان کە پیاوێکی ئاینی دەمارگیر بوو، لە حەوزەکە هاتە دەرەوە تا ئاوە پیسەکە بەر چێژی گاڵتەوگەپە حەرامەکە نەکەوێ، پاشان ئەوانیتریش شوێنی کەوتن. عەلا لەبەدیهێنانی ئەوەی کە چەند مانگێکە پلانی بۆ دادەنا سەرکەوتوو بوو. لەکۆتاییدا پیلانگێڕان بڕیاریان دا پیلانەکەیان جێبەجێ بکەن و گواستیانەوە بۆ بەشی دەرەوەی گەرماوەکە، کە کەمتر گەرمە.

له دەروازەکەدا دالآنێك درێژ دەبوویەوە کە زەمینەکەی بە مافور و حەسیر داپۆشرابوو، دەستێدەرەکە چاوێکی بەشوێنەکەدا گێڕا پێش ئەوەی ئەو دەرگایانەی دەچنە سەر شەقامەکە دابخات.

قازییە قەڵەوەکە کە لەبەر ورگە زلەکەی کە ڕێگەی نەدەدا بچەمێتەوە، بەزەحمەت دەیتوانی نەعلە درێژەکەی لەپێ بکات، یەکەم کەس بوو قسەی کرد و وتی: "با تۆمەتی تاوانێك ئاراستەی شەمس بکەین بۆ نموونە وەك ئەتککردن، تا لەبەردەم قازیدا ئاما دەبێ".

قوتابییە گەنجە سەرتاشراوەکە، بەدەم جوڵەیەکەوە کە لە نەفرەتکردن دەچوو هەوڵی دەدا سەری قایشەکەی کە لە یەکێك لە کونەکانی قایشەکەدا ون بووبوو، کۆبکاتەوە وتی: "ئەوە بێسوودە، چونکە شەمس گوێ بەعەدالەت یان بەدناوی نادات. پێویستە زیرەك بین. نرخێکی پێشکەش بکەن بۆ ڕۆیشتنی، ماڵێك یان پیاوێك یان ئافرەتێك، بەتایبەت پیاوێك، لە شوێنێك لە دەرەوەی سنووری شارەکەمان، سوێندتان بۆ دەخۆم ئەم ساختەچییە شارەکە بەجێ دێڵێ".

کتێبفرۆشەکە کە کراسێکی رەشی ئاودامانی لەبەردابوو تا ئەو زیپکانە نەوروژێنێ کە نەزیفەکە دروستی کرد، پێشنیارێکیتری کرد و وتی: "کەسانێك لە سەربازگەی مەغۆل دەناسم. دەتوانم کۆمەڵێ دەستنوسی نووسراو بەزمانی عەرەبییان بدەمێ لەبەرامبەر چەند کۆپییەك بەهەردوو زمانی چینی و تبتی، جا بڵاوی بکەمەوە شەمس سیخوڕە و پارە لە دوژمنان وەردەگرێ، ئەوەیش ئەوە تاکە هۆی بوونیەتی لێرە، لەسەر ئەو زەوییەی کوڕی جەنگیز فەتحی کردووە و زانیاریی سەربازی بۆ دوژمنان کۆ دەکاتەوە. ئەوەی پێویستە ئەوەیە گومان بخەینە دڵی هەموو سەربازێکی مەغۆلی بەرامبەری، تا بەوهۆیەوە لەناو دەبرێ".

قوتابییە پێشووەکەی ڕۆمی لەکاتێکدا بە ماددەیەکی قوڕین کە پاش وەرزی بارانبارین لە دەشتاییەکانی مەهاراشترا کۆ کرابوویەوە، لەشی خۆی دەخوراند، ئەم چارەسەرەی بەلاوە توندڕەوانە بووە، هاوکات کانیی زەینی تەقی و پلانێکی بۆ هات بەخەیاڵی کەسدا نایەت.

"دەتوانین شەمس برفێنین. چاوی ببەستین و بیگوێزینەوە بۆ شارێکیتر. جا لەبەرئەوەی پارەی پێ نیە ناتوانێ ئەو شوێنە بەجێ بێڵێ کە بۆی دەبەین، بەوە ئیتر ناتوانێ بگەڕێتەوە".

شێخە دەمارگیرەکە کە بەشێوەیەکی سەیر چمکی مێزەرەکەی دەبەست، ئەم پێشنیارەی بەپێشنیارێکی پڕوپوچ بینی بەئاوازێك کە لە گاڵتەجاڕی خاڵی نەبوو وەڵامی دایەوە "گەر شەمس بیەوێ یەکی لەسەر ڕێگەیەك بۆ گەڕانەوە بۆ لای ڕۆمی ناکەوێ. نەخێر! پێویستە خەڵکی قۆنیەی لـێ هان بدەین تا هیچ چارێکی نەمێنێ جگە لەوەی خۆی هەڵبێ و بۆ هەتاهەتایە خۆی بشارێتەوە، ئەگینا هەمان شت ڕوو دەدات کە پاش ڕۆیشتنی یەکەم جاری ڕووی دا، ڕۆمی بەدوایدا دەگەڕێ و جارێکیتر دەیگێڕێتەوە، تەنانەت لەوانەیە خۆی بچێ بۆ لای و بە سەر کەوتوویی و بە ڕێزلێنانێکەوە کە شیاوی پاشایەکە لەکاتی گەڕانەوەی لە هەڵمەتێکی سەرکەوتوودا، بیهێنێتەوە".

عەلا بەبێدەنگی مایەوە. وەك عادەتی خۆی بەپەلە دوور لە چاوی ئەوانیتر جلەکانی لەبەر کرد، چونکە شەرم لە جەستەی خۆی دەکات. هەستی دەکرد یاریدەدەرەکانی ئێستا ئیتر پێگەیشتوون و کاتی ئەوە هاتووە شەمس بکوژن. چارەسەر بەلای ئەوەوە رۆشنە. دەمی کردەوە تا قسە بکات، بەڵام دەنگی زۆر کز بوو، ئەوانیتر ناچار بوون خۆیان بۆ پێشەوە بنوشتێننەوە تا گوێیان لێبێ چی دەڵێ.

"دەلالێك بەکار دێنین. ئەو پیاوە باندێکی تاوانباری نهێنیپارێز بەکرێ دەگرێ، چەردەیەك پارەیان دەداتێ و داوایان لێ دەکات ئەو کەسە خوێنتاڵە، واتە شەمس لەناو ببەن. کەی و لەکوێ و چۆن. ئەوە ئەوان بڕیاری لێدەدەن نەك ئێمە. ئێمە هیچ رۆڵێکمان لەوەدا نابێ. کەس لە ئێمە رۆژ و شوێن و شێوەی لەناوبردنەکەیان نازانێ. لەتوانای کەسماندا نابێ رەوڕەوەی مەرگ رابگرێ. هەر کارەکە جێبەجێ کرا دەلالەکە ون دەبێ. ئەو کاتە خەمباری قووڵی خۆمان بۆ شەمس دەردەبڕین، لەکاتی ناشتنیدا شین و شەپۆڕی بۆ دەکەین. کەس گومانمان لێ ناکات"، قسەکانی بەشێوەیەکی جیاکەرەوە تەواو کرد و وتی: "لێرە بەدواوە فەرمانتان پێدەکەم واز لە زەڕین وەکو کەر بێنن، تا پیلانەکانمان تێك نەدەن".

تاوانی کوشتن! پێشنیاری کوڕە لاسارەکەی رۆمی بوو. هەموو دەیانویست شەمس بمرێ، بەڵام بۆ گۆڕینی ئەم وشانە بۆ راستیەکی واقیعی چەند رەخنەیەك گیرا، چۆن دەکرێ متمانە بەکەسێك بکەن نایناسن؟ ئەی چی دەبێ ئەگەر بڕیاری دا لەبەرانبەر بێدەنگبوونیدا مەرجیان بەسەردا بسەپێنێ؟. عەلا بەجوڵەیەکی دەستی، وەك ئەوەی مێشێك دوور بخاتەوە ترسەکەیانی رەواندەوە:

"هەر ئێستا ئەو پیاوەم هەڵبژارد کە بەو ئەرکە هەڵدەستێ و کەس لە ئێوە ناناسێ. ئەو بکوژێکی پرۆفیشناڵە. ئەمە یەکەم جار نیە خەڵك بکوژێ و دوا جاریش نابێ. ئەگەر دەمی کردەوە، ئەگەر (ئیبتیزاز)ی کردین –سەد ...... بەپاشی– ئەوە کۆتایی ئەو دەبێ و تاکە کەس دەبێ دادگایی دەکرێ و سزا دەدرێ، لەبەر نەبوونی بەڵگە کەس ناتوانێ هیچ لەسەر ئێمە بسەلمێنێ. لەوانەیە جێگومان بین، بەڵام گومان وەك هەڵمی حەمام وایە هەر هێندەی ئاوەکەی گۆڕا نامێنێ. ئەو کوڕی قەحبە، ئەو کوڕی کەرە ئەوە دەزانێ، ئەوە کاری خۆیەتی و خۆی تووشی سەرێشە و مەترسی ناکات".

هەموو سەریان راوەشاند. کێ دەوێرێ ئەو پیاوە بەڕێزانە: کتێبفرۆشێك و پیاوێکی ئاینی و قوتابیەکی تێکۆشەری سەرتاشراو و قازیەکی قەڵەو، تەنانەت دەستێدەرەکەیش، بە پلاندانان بۆ کوشتنی شەمسی تەورێزی تاوانبار بکات؟ بەم شێوەیە وەك ئاوی حەوزەکە قسەکانیان لە ناوچوون و لە یادەوەرییان سڕانەوە.

پێش ئەوەی گەرماوەکە بەجێبێڵن عەلا پێداگری کرد، دوایین پرسیاری لێکردن کە ئایا بەپلانەکە رازین؟ بێدەنگیەکەیان و دەربڕینە توندەکانیان دەربارەی شەمس، وەڵامدانەوە بوو کە بەڵێ رازین.

کتێبفرۆشەکە دووایین کەس بوو رۆیشت. جانتایەکی دا بەکۆڵیدا پڕ بوو لە چەرمی ئامادەکراو بۆ بەرگگرتنی کتێبەکانی، ئەو تکە خوێنانەی برینەکەی کە —سەرباری ئاگەداریی کەڵەشاخگرەکە— بەسەر مەرمەرە سپیەکەدا تکان، چەند گوڵێك لە پەڵەی ئەرخەوانییان دروست کرد.

لەکاتێکی زووی رۆژی دوای کۆبوونەوەی پیلانگێڕان لە گەرماوەکەدا، خزمەتکارەکەم نامەیەکی دایە دەستم مۆری شەمسی لەسەر بوو. دەستبەجێ کردمەوە و ئەمەی خوارەوەم خوێندەوە: "پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ لە دەروازەی بازاڕی بەخێوکەرانی پەلەوەردا بمبینە. شتێك بێنە تا لەسەری بنووسی، چونکە من عادەتم نیە بنووسم".

بینیم لەناو کۆمەڵێ لە رێبوار و کرێکاراندا وەستاوە. لە دوورەوە بانگم کرد. بەڵام لەبەر قاڵەقاڵ و دەنگەدەنگی هەزاران پەلەور گوێی لێم نەبوو. بەرەو لای چووم، کاتێ لێی نزیك کەوتمەوە، لەبەردەمیدا چەمیمەوە و هەردوو دەستە بەستوەکەی و نینۆکە پەڵەدار بە مرەکەب و بەهاراتەکەیم ماچ کرد. حەپەسان بە روومەتیەوە دیار بوو لەبارێکدا زیاتر سەرنجی لەسەر قەفەسەکان بوو تا لەسەر باڵندەکان. وتی: "سەرسامم بەو پەڕە رەنگاورەنگانەی چۆلەکەی دوری دەڕازێننەوە، هەروەها رەنگی ئاڵتونیی پەڕی ئەو تووتییە بچوکانە، رەنگی ئەو تووتییە سەوز و زەرد و سوورانە. لە بۆنی توندی ریقنەکانیان لوتم گرت، ئەو غەڵبەغەڵبەی ئەو باڵندانە دروستیان کردبوو گوێیان کەڕ دەکرد ئەمە لە جگە لە بانگەبانگ و هاوار هاواری حەماڵەکان کە عەرەبانەکانیان رادەکێشا و خەڵکیان ئاگەدار دەکردەوە دوور بکەنەوە و رێگەیان بۆ بکەنەوە. سەرنجم لەنێوان قازێك و تاوسێکدا پەرت بوو و بیرم فڕی بۆ یەکەمین کۆنگرەی باڵندەکان لە قەسیدەکەی عەتار "لۆژیکی باڵندە"دا کاتێ بڕیاریان دا بکەونە رێ و بەدوای پاشا راستەقینەکەیاندا بگەڕێن، هەروەها بەناوی شەمسی باڵندەوە بیرم کردەوە. ئایا لەگەڵ یەکێك لەو باڵندانە یەکدەگرێ؟ کەس ئەوە نازانێ، رەنگە جگە لە رۆمی، کە ئاسمانی ئەو بوو.

لەناکاو لەبەردەم دوکانێکدا وەستا و سڵاوی لە پەلەور بەخێوکەرە پیرەکە کرد کە ریشێکی سپی هەبوو وەك ئەوەی هاوڕێیەکی کۆن بێ و داوای لێکردم لەگەڵی بچم بۆ ژوورەکەی پشتەوە. بەناو کۆمەڵێ قەفەسدا تێپەڕین کە هەندێکیان لە ئاسن و و هەندێکیان لە خەیزەران و هەندێکیشیان لە شوشە دروست کرابوون. یەکێك لە قەفەسەکان لە ئاڵتون دروست کرابوو بۆ خەلیفەی بەغدا. ئەو قەفەسانە باڵندەی دەگمەنیان تێدا بوو، دەنگیان ناسك و رەنگیان جیاواز بوو.

کاتێ ئێوارە نزیك کەوتەوە، وردە وردە هێمنیەکی چاوەڕواننەکراو جێگەی غەڵبەغەڵبەکەی دەگرتەوە. هەزاران پەلەور دوای داپۆشینی قەفەسەکانیان بەچەند پارچە قوماشێك بەمەبەستی هاندانیان بۆ خەوتن، لەسەرخۆ یەك لەدوای یەك هێمن و بێدەنگ دەبوون. هەمان خامۆشی باڵی بەسەر ئەو ژوورەیشدا کێشا کە تێیدا یەکترمان بینی. باڵندەکان کەوتنە فڕین بۆ مەملەکەتی خەونەکان.

خانەخویّ پیرەکەمان هەر هێندەی کارەکەی تەواو کرد هاتە لامان و بتلێك شەرابی ئوکبارای هەڵگرتبوو، بەناوبانگترین تریّ کە دراوسێکانمان لە باشور بەرهەمی دێنن، لەگەڵ سیّ کتریی بچوك. وابلاو بوو ئەو شەرابە باشترین جۆری شەرابە لە تەواوی رۆژهەڵاتدا. کەوتینە خواردنەوە بەبیّ پەشیمانی، حەرامکردنی رێگر نەبوو لە هەڵقوڕاندنی. زانراوە خەلیفەی بەغدا و قازی و وەزیرەکانیشی لەبەردەم ئیغرای ئەو شەرابەدا خۆیان بەدەستەوە دەدا. من خۆم، حوسام، دەمزانی هەندیّ لە قازیەکان دوای ئەوەی حوکمیان لەسەر چارەنووسی ژنێکی ئیرادە سەلبکراو و سەربازێکی زەوتکەر یان نووسەرێك کە کارەکانی ساختە کرابوون، دەدا، هەفتانە ئاهەنگی شەرابیان ساز دەکرد، جلە رەسمییە بەویقارەکانیان دادەکەند و دەیانگۆڕین بە عەبای رەنگاوڕەنگ، پاشان بەناو قاوشە فراوانەکانی دادگەدا دێن و دەچن، شێوەی خۆیان دەگۆڕن و تاجەگوڵینە لەسەر دەنێن.

شەمس پێی وتم: "هەست دەکەم شتێك لەدەورم دەسوڕیّ وەك ئاژەڵێك لێم نزیك بێتەوە. هەست دەکەم هەڕەشەم لەسەرە، بەدووامەوەن. قورس و دوور لە خۆم و لە خۆشیم دێمە بەرچاو. هەست دەکەم خەریکە لە بەناچاری مانەوە لە ماڵ بێزار دەبیّ، چونکە وای لێهاتووە بەدەگمەن نەبیّ دەرناچیّ، چیتر لەگەڵ من دەرناچیّ. دەبیّ ماندوو بووبیّ لەوەی ناچارە بەردەوام پاساو بۆ هەڵسوکەتەکانی بۆ ئەندامانی خێزانەکەی و ئەوانیتر بێنێتەوە، لەوەی تەنیا بازنەیەکی بچوك لە موریدە دڵسۆزەکانی دەبیبنن، هەروەها لە ئەنجامدانی سەمای بیستن لەسەر ریتمی مۆسیقایەکی بێدەنگ لە هەندیّ ئەشکەوتی چۆڵ و هۆڵدا. دەزانم هەموو ئەوانە بۆ رزگارکردنی من دەکات، بەڵام ناتوانیّ لەسەر ئەوە بەردەوام بیّ، من هەست بەوە دەکەم. ئەو دەیەویّ بەئاشکرا و بەبەرچاوی خەڵکەوە لەگەڵ ئەو کەسە دەربکەویّ کە خۆشی دەویّ و لە نەشوەی سەمای بیستندا بەشداری بکات و بەمحیبەتەوە دوور لە هەر ترسێك باوەشی پێدا بکات. بەڵیّ، ئەو دەیەویّ شەو چاو بنوقێنیّ و گوێی تەنیا لە دەنگی هەناسەدانی خۆشەویستەکەی بیّ بەبیّ نیگەرانی و ترس لەو هەنگاوانەی لەدەوری دەنرێن، ئەو هەنگاوانەی سیخوڕی دەکەن، ئەو هەنگاوانەی بەدەوری شوێنەکەدا دەسوڕێنەوە. حوسام، ناتوانیّ ئەوەم لەگەڵ بکات. منی تاکە هاوڕیّ کە مۆری ریسوایی و بێنرخی و جادوگەریم پێوە نراوە. رۆژێکیان کاتیّ بەبەرچاوی خەڵکەوە لەگەڵ کەسێکیتر دەست بەسەما دەکات، ئەم پێشبینیەی منت لەیاد بیّ. حوسام، خۆمم یەکلایی کردۆتەوە، بەڵام پێت ناڵێم بڕیاری چیم داوە. ئەمڕۆ بانگم کردی تا هەندیّ هەست تۆمار بکەی کە بەرانبەر م هەمە.

ویستم ناڕەزایی دەرببڕم و قەناعەتی پیّ بکەم کە گەورەم لەو وەڕس نەبووە، هەروەها کەس جگە لەو پشت و رێزی ناگریّ، بەڵام نەموێرا ئەوە بڵێم، ئاخر من کێم تا دڵنەوایی شەمسی تەورێزی بکەم؟.

کتریی ئارەقەکەی بەتاڵ کرد و درێژەی بەقسەکەی دا.

"حوسام، ئەگەر بمزانیایە رووداوەکان بەم ئاقارەدا دەچن دیمەشقم بەجێ نەدەهێشت و بێمەوە. کاتێ هاتم بۆ قۆنیە تەنیا وەك رێزێك بۆ ئەو هاتم، چونکە دابڕانم لە رۆمی هیچ ناسۆرییەکی بۆ دروست نەکردم، یەکگرتنەکەیشی هیچ بەختەوەریەکی بۆ نەهێنام. من بۆ بەختەوەری و هەروەها ناسۆریشم قەرزای سروشتی خۆمم. کاتێ هاتن تا لە دیمەشقەوە بمهێننەوە، هەر ئەوە بووم کە پێشتر هەبووم. رۆمی دەیتوانی بەئارامی لەگەڵ کیرا بژی، هەستم نەکرد سوڵتان وەلەدی کوڕیشی بەمن نامۆیە، بەڵکو ئەویش بەکوڕی خۆم دادەنێم. بەڵام پێویستە لەسەری داوا لە براکەی بکات بە لەخۆبوردووییەکی زیاتر لەگەڵم بجوڵێتەوە و لەحزوری مندا زۆر قسە نەکات و پێنەکەنێ. رۆمی لەبەردەممدا دەچەمێتەوە و لەتەنیشتی خۆیدا دامدەنیشێنێ، زۆر ستایشم دەکات، مەگەر کاتێ دیدێکی بۆ بێ. رۆمی شتێکی جیاوازە. ویستم ئەمەت پێ بڵێم. ئەوە باش بپارێزە".

وەك نەریتی خۆم هەموو شتێکم وشە بەوشە نووسی، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەم بیرۆکەکانی رێك بخەم، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەم تێبگەم لەوەی چی دەڵێ و قسەکەی ئاراستەی کێ دەکات، پاشان روونکردنەوەکان —کاتێ پێم گەیشتن— لەبەر تیشکی رووداوی نوێدا هاتن، زانیاریی نوێ بوون.

شەمس مرەکەبدانەکەمی بەرز کردەوە و کەوتە سەرنجدانی وەك ئەوەی شتێك بێ هەڕەشەی لێ بکات، چونکە دڵۆپێك مرەکەب، وەك وتی، لەوانەیە بۆماوەیەکی زۆر پەنجەکانی پیس بکات. بەرزی کردەوە بۆ لوتی و بۆنی کرد، پاشان بەئەسپایی لەسەر زەوی داینا و درێژەی بەقسەکانی دایەوە.

"تا ئەمڕۆ ئەگەر داوام لە م کردبێ هەردوو کوڕەکەی بۆ دوور لە قۆنیە بنێرێ، ئەوەی دەکرد".

گومانم لەوە هەبوو. بەدڵنیاییەوە سوڵتان وەلەد هۆگری شەمس بوو وەك باوکی، لەپێناو شەمسدا لەوانەیە بەبەجێهێشتنی قۆنیە و گواستنەوە لە شارێکەوە بۆ یەکێکیتر رازی بێ. بەڵام عەلا کوڕە لاسارەکەی، کە سوێندی خواردبوو هەناسەی "خوای باوکی" خامۆش بکات، وا ناکات. هەرچی دوو منداڵەکەیتری مەولانان، کە کوڕ و کچێکی بوون لە کیرا، هێشتا منداڵ بوون و پەیوەندییان بەشتەکەوە نەبوو. ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە ئاخۆ باوکیان کە کەنارگیری و پیلان و حەزەرکردنی زۆر و ئەو نیفاقەی لەکاتی بوونی شەمسدا مومارەسەی دەکرد، بوێری و ئیرادەی ئەوەی دەبێ لە قۆنیە دەریان بکات. بێگومان لە رۆژە کەمە بەراییەکانی پاش ئەو دیدارە لەبیر نەکراوەدا —کە دوو ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە— دەکرا ئەوە بکات ئەگەر شەمس داوای لێ بکردایە و هەر چوار منداڵەکەی نەفی بکردایە. ئەمەی دەکرد. کوڕە راساڵەکەی و ژنە لاوەکەی پێشکەشی "دڵدزەکەی" بکات.

پاشان شەمس درێژەی بەقسەکردن دا.

"م تیشکی خۆرە. ناکرێ چاو بگاتە خۆری کیانم بەڵام دەتوانێ بگاتە مانگ. درەوشانەوە و نووری خۆر چاو لە بینین بێبەش دەکەن، مانگ ناتوانێ بگاتە خۆر، بەڵام خۆر دەتوانێ بگاتە مانگ".

ئەم قسانەم تۆمار کرد لەکاتێکدا هەستم بەوە کرد خۆی لە پلەیەکی بەرزتر لە رۆمیدا دانا، وەك چۆن خۆر لەسەروو مانگەوەیە. هەروەها زانیم لە پەیوەندیەکەیاندا ئەوە نیە کەسێك نزمتر و یەکێك بەرزتر بێ. هەندێ جار یەکێکیان خودا و هەندێ جاریش ئەویتریانە. شتێکە پێناسە ناکرێ، ناو نانرێ.

دەنگی گمەگمی باڵندەکان کز بوو، بەڵام جووتێك پەپوسلێمانە، عاشقانی کۆتایی شەو، لە گمەگمیان بەردەوام بوون. لەکاتێکدا شەمس هاوئاهەنگ لەگەڵ دەنگی گۆرانیی ئەو دوو عاشقە بەپێی راستی لە زەوی دەدا، جارێکیتر بابەتەکەی گۆڕی، لانیکەم لەڕووی رووکەشەوە.

"لە ناخی خۆمدا زۆر کەسم خۆشدەوێن. لە ناخمدا نەرمیەکی زۆرم بەرانبەریان هەیە بەڵام پیشانی نادەم بۆیان. جارێ دوو جار لە قسەکانمدا بۆم ئاشکرا کردن بەڵام نرخیان نەزانی. لەو کاتەوە پەرۆشم کە نەرمی لە ناخمدا سارد نەبێتەوە. بۆ مەولانام ئاشکرا کرد. بەردەوام گەشەی ئەکرد و قەت کز نەبوو. حوسام، تەنیا ئەتوانم حەقیقەت بێدەنگ بکەم".

لەکاتێکدا پێی لە لێدانی زەوی بەردەوام بوو، قەد و سەری لەسەر ریتمی رۆمانسیەتی دوو پەپوسلێمانەکە دەلەرینەوە. نەوەستا تا ئەوکاتەی لەپڕ سێ سواڵکەر هاتنە ناو دوکانی باڵندە بەخێوکەرەکە و داوای هەندێ خواردنیان کرد.

"برۆ شتێکیان بۆ ئامادە بکە" شەمس فەرمانی پێکردم. "ئەگەر شتێکت بۆ ئامادە کردن، ئەوا خێری دە حەجی مەککەی پیرۆزت دەگات".

دوکانەکەم بەجێهێشت، بازاڕەکە کش و مات هاتە بەرچاوم، هات و هاوار و غەڵبەغەڵب نەمابوو. دەرگای سەرجەم دوکانەکان داخرابوون، جگە لە دوکانێك کە توانیم لە دەرگا تۆڕینە نیمچە داخراوەکەوە باڵندە بەخێوکەرەکە ببینم کە لەبەر روناکیی چراکەدا پارە زیوییەکانی دەژمارد. گوێم لە حەپەی سەگەکان بوو کە یاوەری ئەو پاسەوانانە بوون بە کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوە. روناکیی چراکانیان نزیك کەوتنەوە. پێم هەڵگرت تا خۆمیان لێ لابدەم، چونکە ئەو وشە نهێنیەم نەدەزانی کە پێویستە ئەو کەسەی لەو ساتە درەنگەی شەودا لە بازاڕ بێ، بیزانێ. هەروەها هەوڵم دا بەهەر نرخێك بووە خۆم لە پرسوجۆیان لابدەم. بەخێرایی لە بازاڕی سابونفرۆشان و عەتاران کە بۆنی جۆرەها بەهاراتی لێ دەهات، پەڕیمەوە. ئەگەرچی دەرگای دوکانەکان داخرابوون، هەزاران بۆن و بەرامە کە لە کون و قوژبنی دنیاوە هەڵیاندەکرد هەوای ئەو شەوەیان پڕ کردبوو. لەگەڵ ئەوەی بەپەلە بووم، بازاڕەکەم وادەبینی وەك ئەوەی سندوقێك بێ هەموو جۆرە بۆنەکانی سەر زەوی تێدا بێ. نەخشەیەك لە چەندین بۆن.

کاتێ لەو بەردەڵانە دەرچووم، زەحمەتیم نەدی لە دۆزینەوەی فرۆشیارانی گۆشتی برژاو و هەویرکاریی بەسەوزەوات ئاخنراو و میوەی بەشەکر رووپۆشکراو، کە لە چەند سەبەتەیەکی قامیشدا بوون و چەند چرایەك لەسەر پشتی هێسترێك روناکی دەکردنەوە، کە مووروو و زەنگی بچوك بە ملیدا شۆڕ بووبوونەوە.

کەمێك کەبابی مریشکی ئاخنراو لەناو هەویرکاریم کڕی، پاشان داوای وشەی نهێنیم لە پاسەوانەکان کرد کە رێگەی هاتنە بازاڕیان لە خەڵك دەگرت. بەو شێوەیە توانیم بەئاسانی بگەڕێمەوە بۆ دوکانی باڵندە بەخێوکەرەکە.

شەمس سەمای دەکرد. بینیم لەسەر ریتمی دوو پەپوسلێمانە نەخەوتووەکە دەخولێتەوە، بە بەرچاوی ئەبلەقبووی سواڵکەرەکان، بەددانە شکاوەکانیان و چاوە بەفرمێسکەکانیان و جەستە شێواوەکانیانەوە. هەر هێندەی منیان دی کەبابەکەیان لەدەست رفاندم و بەگڵمەگڵم هەندێ وشەی سوپاسکردنیان فڕێ دا، هەر زوو لە تاریکی شەودا ون بوون تا بۆنی گۆشتی برژاو سواڵکەرانیتر رانەکێشێ و داوای بەشی خۆیانیان لێ بکەن.

دوای ئەوەی رۆیشتن، شەمس لە سەماکردن وەستا و گرتمی و ناوچەوانی خستە سەر ناوچەوانم بەگوێیدا چرپاندم: "فیراقەکە تا دێ پێئەگات و ئاڵۆز ئەبێ. لە م ئەپرسم، ئەگەر وتی برۆ، دەڕۆم".

هەناسەکانی بەر لێوەکانم کەوتن. هەندێ هەناسکە هەناسکی بوو. ئەو وشە دەمامکدارانە هەناسەیان دا کە پێشبینی ئۆغرکردنیان دەکرد. نەمزانی چی بڵێم. ئاخۆ قایلی بکەم بە مانەوە و سەرکێشیکردن بەژیانی، یان لەوە خراپتر، سەرکێشیکردن بە زیادبوونی نیگەرانیی مەولانا کە دوای کتمان و وریاییەکی زۆر ناچار بوو لە حاڵەتی نائارامیەکی بەردەوامدا بژی. یان لێی بگەڕێم ئۆغر بکات بەبێ ئەوەی مامۆستاکەم ئاگەدار بکەمەوە، بەوەیش رقی –بێگومان هەتاهەتایی– رۆمی بەسەر خۆمدا بێنم؟ نەخێر.

من تەمەنم لە بیست ساڵ تێپەڕی نەکردوە، هێشتا قوتابیەکی سادەم و مافی ئەوەم ناداتێ دەست لە پەیوەندیەکی لەو شێوەیە وەربدەم. بەلای ئەوانەوە، جگە لە خوا کەسیتر بۆی نیە دەست وەربدات.

شەمس چەند هەنگاوێك چووە پاشەوە و وتی: "من مەولانات بەئەمانەت پێ ئەسپێرم. رێگە مەدە هیچ قووت بدات. بەتوندی لەگەڵی مەجولێوە، سەرت لە حزوریدا نەوی بکە، مەترسیەکانی لێ دوور بخەوە، لێی بپارێوە شێوازی هەڵسوکەوتی بگۆڕێ".

باسی چی دەکرد؟ تێنەگەیشتم. ئاخۆ لەوە دەترسا رۆمی خۆی بکوژێ ئەگەر بەجێی بێڵێ یان پشتی تێ بکات؟

لەو شەوەدا، لە تاریکایی ژووری پشتەوەی دوکانی باڵندە بەخێوکەرەکەدا من تەنیا نووسەری شەمس بوو. لەبەر روناکی مۆمێکدا ئەوەم بەوردی دەنووسی کە ناوی دەنێم پێشبینیەکانی. شەکەت و زۆر نیگەرانیش هاتە بەرچاوم. چاوی درەوشانەوە باوەکەی لەدەست دابوو. دەفتەرەکەم داخست و پێشنیارم کرد بگەڕێتەوە بۆ ماڵی سەلاح و بخەوێ. رازی بوو. بەڵام پێش ئەوەی بڕوات بانگی باڵندە بەخێوکەرەکەی کرد کە تۆوی دەکێشا و ناوچاوانی ماچ کرد.

کاتیێ لە دوکانەکە دەرچووین و بە کۆلانە تاریکەکانی بازاڕدا تێدەپەڕین، دەربارەی باڵندە بەخێوکەرەکە پرسیارم لە شەمس کرد. ئەو پیاوە کێیە؟ ئایا لەمێژە شەمس دەیناسیێ؟ ئایا ئەو عارفێکە و هەندیێ نهێنی دەشارێتەوە کە هێشتا ئاشکرا نەبوون؟

کاتیێ گوێی لەم پرسیارانە بوو، شەمس چوستییە باوەکەی بۆ گەڕایەوە و جارێکیتر چاوەکانی لەتاریکیدا درەوشانەوە، پاشان ئەم چیرۆکەی خوارەوەی بۆ گێڕامەوە، کە وشەکانی لە یادمدا نەخشاون:

ئێوارەیەکیان شەمس لە بازاڕ دەگەڕایەوە باڵندەبەخێوکەرە پیرەکەی بینی بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، بەدارێك دوو قەفەسی بەشانیدا هەڵواسیبوو، لە هەر هەنگاوێکدا دوو قەفەسەکە بەرز و نزمیان دەکرد. پیاوە ماندووەکە بەخاوی دەڕۆیشت، سەری داخستبوو. ئەو رۆژە تەنها دوو باڵندەی فرۆشتبوو، سیێ چوار باڵندەی هەڵگرتبوو کە پێدەچوو لە سێبەری خۆرئاوابووندا خەوتبن.

شەمس بڕیاری دا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بیێ شانبەشانی پیاوەکە بڕوات، گوێی لە پیاوەکە بوو بەدەنگێکی نزم وەك ئەوەی بە پەلەورەکانی بڵیێ، دەیوت "نا، نا، نا، هیچ شتێك نیە من لێی بێزار بم... نا نا، دەرمهێنان و دەتانگێڕمەوە... من بایەخ بەهەموو شت دەدەم. سبەی شەکرتان دەدەمیێ و هەمیشە هەوڵ دەدەم ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە سازگار بیێ. دەنوکتان بریسکەدار دەکەم، پەڕەکانتان بریسکەدار دەکەم، قەفەسەکانتان پاك دەکەمەوە، بۆنخۆشیان دەکەم و هەموو ساڵیێ رەنگیان دەکەم. خۆزگە کەسیێ منی وەك ئێوە لە قەفەسێکدا لەسەر شانی هەڵبگرتایە! خۆزگە کەسیێ هەموو رۆژ شتێکی دەدامیێ بیخۆم و بیخۆمەوە".

پاشان شەمس وای بەخەیاڵدا هات کە گوێی لە دەنگێکی کز بووە وەڵامی باڵندە بەخێوکەرەکە دەداتەوە. زیاتر لێی نزیك کەوتەوە بەوردی گوێی شل کرد. گوێی لەیەکێك لە باڵندەکان بوو بەزمانێك کە هەردوو پیاوەکە تێی دەگەیشتن قسە لەگەڵ پیاوەکەدا دەکات. باڵندەکە وتی: ئایا پێت وایە ئێمە لەناو قەفەسداین. تۆ هەڵەی. گویێ بگرە: جانەوەرە بچوکەکان لەناو پەڕەکانی مندا زیندانن و دەرك بەوەیش ناکەن. تۆ خۆیشت لە قەفەسدای: ماڵەکەت قەفەسە، شەقامەکەت قەفەسە، ئەم شارە هەمووی قەفەسە... پێت وایە لەکویێ تووڵەکانی قەفەسەکەت کۆتاییان دیێ؟ هەموو سەرزەوی، هەسارەکەمان هەمووی قەفەسن. مانگ قەفەسە. خۆر قەفەسە. گەردوون خۆی قەفەسە و لەسەر شانی ناکۆتا لارەلار دەکات".

باڵندە بەخێوکەرە پیرەکە بەهەناسە هەڵکێشانێکی پڕ شەکەتیەوە وەڵامی دایەوە. شەمس دڵنیا نەبوو گوێی لە هیچ بووە. دوای کەمێك، کاتیێ وردە وردە سێبەرەکان شەقامەکانیان پڕ دەکرد، بازرگانەکە جارێکیتر سکاڵای کرد و ویستی بزانیێ چارەنووسی باڵندەکە چییە. لەوکاتەدا دەنگێکیتر کزتر هاتە بەر گویێ، دەنگی باڵندەیەك کە لە باوێشك دەچوو، شەمس لە باڵندە بەخێوکەرەکە نزیك کەوتەوە کە لە تاریکیدا نەیدەبینی و گوێی لە دەنگی باڵندەی دووەم بوو بەزمانێکی جیاواز لە زمانی باڵندەی یەکەم وتی:

"هەموو ئەوە لەیاد بکە. عەقڵت دابخە لەبەرئەوەی شەو لێرەیە. ئەو باڵندەیەی قسەی لەگەڵ کردی هەر خۆت بووی، ئەوە بیرۆکەی تۆ بوو: تۆیش قەفەسەکەی. ئایا پێت وایە ئەم قەفەسە هەیە، تۆ هەڵەی. بیرۆکەکانت بەتوولّی بەهێز دەرگایان لەسەر داخراوە. تۆ بەزەحمەت دەتوانی بیانکەیتەوە بەڵام نایانبینی. بگەڕێوە ماڵ و ئەوەی پێت وایە قەفەسەکانتن لەسەر زەوی دایانبنێ و واز لە بیرکردنەوە بێنە، پاشان نانەکەت بخۆ و بخەوە. کاتێ هەستایت سەرجەم قەفەسەکانی دنیا ئەکرێنەوە، ئەوکاتە دەکرێ درێژە بەگفتوگۆکەمان بدەین. شەوشاد".

"شەوت شاد" شەمس ئەمەی پێ وتم لەکاتێکدا دەچووە ماڵی زێڕنگەرەکە.

دوای چەند رۆژێك و لەسەر داوای رۆمی، هەندێکمان شەرەفی یاوەریکردنیمان پێ بڕا بۆ مزگەوتە گەورەکە کە بەجوانیی زەخرەفەکانی و شێوازی بیناکەی بەناوبانگە. من و شەمس و سوڵتان وەلەد و سەلاحی زێڕنگەر، نهێنیپارێزی رۆمی، بووین. رۆمی سوور بوو لەسەر ئەوەی نوێژی بەیانی لەو مزگەوتەدا بکەین. بوونی شەمس لەتەنیشتی، لە شوێنێکدا ئیمانداران لە شوێنی جیاجیاوە رووی تێدەکەن، لە سەربازان و پیشەوەران و سواڵکەران و ئەرستۆکرات و پیاوانی ئاینی، شتێکی پڕ مەترسی بوو. ئەگەر یەکێکیان سەرکۆنەی شەمسی بکردایە، لەوانە بوو شەمس بەردباران بکرایە یان چەقۆیەکی لێ بدرایە یان قوڕگی لەت بکرایە. دەترسام لەوەی گەشتەکەمان لە هەوای ئەو بەیانییە سازگارەدا بەخراپ کۆتایی بێ. ئەوە زیاتر لە ئاهەنگێك دەچوو کە پاش ئازادکردنی زیندانییەك ساز دەکرێ، یان وەك ئەو ئاهەنگەی هەندێ جار پێش خەڵوەت یان فیراقێك دەکەوێ.

رەنگە ئەوە دوا جار بێ پێکەوە دەربکەوین. نەموێرا بیر لەم ئەگەرە بکەمەوە. ئاخۆ شەمس بەبێ رۆمی چۆن دەبێ؟ ئەگەر شەمس بچێ رۆمی چیتر ناگەڕێتەوە بۆ وتنەوەی وانە یان وتاردان و مورید و شوێنکەوتەکانی لەدەوری نابن و لە نووسینی تەفسیری قورئان بەردەوام نابێ. بەبێ شەمس ئایا بەتەنیا سەما دەکات؟ بەبێ شەمس ئایا خۆی فڕێ دەداتە ناو حەوزەکەی قوتابخانە و پێبکەنێ؟ بەبێ شەمس ئایا کاتێ ئەوین نوقمی دەکات جلەکانی دادەکەنێ؟ ئایا بەبێ شەمس خوای هەر خۆش دەوێ؟

لەگەڵ ئەوەی هێشتا کات زوو بوو گۆڕەپانەکە لەبەردەم مزگەوتەکەدا پڕ بوو لە عەریزەنووسان کە کوشکەکانیان هەڵدابوو، بەیاریزانانی چاوشین و سمێڵ درێژ کە شمشێر قووت دەدەن. بە حیکایەتخوانان و مارەوانان و گۆرانیبێژان کە بەشەقامەکاندا دەگەڕێن. کاتێ مەولانا نزیك کەوتەوە هەندێکیان چەمانەوە، ئەوانەیش نەیاندەناسی پرسیاریان دەکرد لە هۆی ئەم هەموو بەگەورەزانی و رێزگرتنە لەگەڵ ئەوەی جلوبەرگ و بیچممان لەوە نەدەچوو قازی یان سەرباز یان پیاوی ئاینی بین.

پێش ئەوەی بچینە ناو حەرەمی مزگەوت کەوش و نەعلەکانمان داکەند و لەسەر رەفە ژمارەکراوەکان لەو شوێنانەی بۆمان تەرخان کرابوون دامانان. سەد مەسینە لەتەنیشت دەرگای گەرماوەکە ریز کرابوون

تا ئیمانداران تارێت و دەستنوێژیان پێ بگرن. کاتێ دەروازە گەورەکەمان بڕی دەنگێك هاتە گوێم کە ئاراستەی شەمس دەکرا و دەیوت: "حەرامە سەگ بێنە ناو مزگەوت".

بەتووڕەیی ئاوڕم دایەوە تا لەو پیاوە بدەم زاتی کرد سووکایەتی بەشەمس بکات. خەڵك لەسەرخۆ بەرەو حەوشەی مزگەوتەکە دەهاتن. وەستام و یەك بەیەك لێیان ورد بوومەوە بەڵکو ئەو کەسە بدۆزمەوە کە سووکایەتی بە شەمس کرد. کاتێ نەمدۆزیەوە، هەوڵم دا بەوە خۆم دڵنیا بکەمەوە بەخۆمم وتم من تاکەکەسم گوێم لە سووکایەتییەکە بووە.

لەسەر منارەکەوە کە لوتکەکەی لە دەرزی دەچێ، بانگدەرە نابیناکە —نابینا بوو تا سەیری خوارەوە نەکات و ئافرەتان بەسەر رووتی لە باخچەکانی حەرەملکدا ببینێ— بانگی بەیانی دا. چەند ساتێکی دوای ئەوە خۆر هەڵهات. ئیسترلاب یان سەعاتێکی ئاوی کاتی نوێژی دیاری دەکرد کە لە رۆژدا بەدەرکردنی دەنگێکی مۆسیقی لە شەودا بە روناکیەك ئاماژەی بۆ سەعات و نیو سەعات و چارەکە سەعات دەکرد.

دوای ئەوەی دەستنوێژمان گرت، لە شابستان نوێژمان کرد. ئەو شێخە پێشنوێژی کردین کە لەبەردەم میحرابەکەدا، کە بە نەخش و نیگاری رەنگاوڕەنگ و درەختی بەنرخ رازابووەوە، بەئاراستەکەی مەککەی پیرۆز وەستابوو. رۆژێکیان پیاوێکی چینی پیاوێکی چینی باسی ئاینەکەمانی بۆ دەکردم پێی وتم، پەرستگە بوودابییەکانیش تاقێکی لەو شێوەیەیان تێدایە. هەروەها پیاوێکی زەردەشتی فارسیش بۆی باس کردم ئەوانیش لە پەرستگەکانی ئاگردا "ئاتەشکەدە"یان هەیە، کە شتێکە لە میحراب دەچێ. نوورێك کە لەیەك کاتدا لە هەموو لاکانەوە دزەی کردبوو سەفا و هێمنی بە شابستان بەخشیبوو. ئەو زەویەی لەکاتی سوژدەدا تەوێڵمان لەسەر دادەنا وەك رووتەختێك دەهاتە پێش چاو کە بەئاسماندا بفڕێ، ئاوێنەیەك.

دوای تەواوبوونی نوێژ، ئیمام گەڕایەوە و رۆمی لەناو ریزی نوێژخوێناندا بینی. بەرەو لای مەولانا رۆیشت و دەستی ماچ کرد، بەڵام گوێی بەشەمس نەدا و کەمترین ئاماژەی پێزانینی بۆ دەرنەخست. سەرجەم ئامادەبووان تێبینییان کرد ئیمامەکە هیچ رێزێکی بۆ شەمس پیشان نەدا. روومەتی زەردهەڵگەڕاوی رۆمی بەو رەفتارە زەردتر بوو. لەبەرئەوە خێرا لە ئیمام دوورکەوتەوە و ئاماژەی پێداین شوێنی بکەوین بۆ ژوورێك کە دەچێ بەرەو یەکێك لە داڵانە داپۆشراوەکان، ژوورێك بوو وتاربێژان دەچوونە ناوی تا کەمێك پشوو بدەن و سەرخەوێك بشکێنن. لە شابستان دوور کەوتینەوە، بەڵام گوێمان لێبوو ئیمام بەحەوت پلیکانەکەدا بۆ سەر مینبەرەکە سەردەکەوێ. دەنگی شمشێرەکەی ئاماژەی بۆ هەر پلەیەك دەکرد کە سەردەکەوتە سەری.

هەرهێندەی چووینە ژوورێك کە دیوارەکانی بە قیشانی رازێنرابوونەوە، رۆمی سەری خستە سەر شانی شەمس و داوای لێکرد گوێ بە مەسەلەکە نەدا. شەمس دەستی خستە ناو مێزەرەکەی رۆمی و چەند تاڵێك لە مووە لولەکانی سەری گرت، پاشان دەریهێنان و وتی: "لەم جیهانەدا خەڵك بەلامەوە گرنگ نیە، لەپێناو

ئەواندا نەهاتووم. هەرچی ئەوانەن لەم جیهانەدا بەڕاستی ڕێگەمان بۆ تەخت ئەکەن، ئەوانەن من ئاماژەیان بۆ ئەکەم، پەنجەکانم لەسەر دەمارەکانیان دائەنێم".

سەری ڕۆمی بەردا، پاشان پاڵیدا بەو پشتییانەی لەسەر زەوی درێژ کرابوون و ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕاینەوە:

"یەکێکیان نەزری کرد حەجی مەککەی پیرۆز بکات، لە بیابان پێی لە دڕکەدارێك گیر بوو و شکا، ئیتر نەیتوانی بەکاروانەکەدا بگات. پاش چەند سەعاتێك لە دەردیسەری و بێئومێدی، پیاوێکی بینی لێی نزیك دەکەوێتەوە، هاواری کرد: رزگارمکە". دەستبەجێ پیاوەکە گەیاندیەوە بە کاروانەکە. حاجییەکە پێی وت: "بەناوی خوای تاك و تەنیا، پێم بڵێ تۆ کێیت ئەو هەموو هێزەت هەیە؟ ڕێبوارەکە خۆی لادا و بەشەرمەوە وتی: "واز لە فزولت بێنە، تۆم لە مەترسی رزگار کرد لەبەرئەوەی خەریك بوو بە ئامانجی خۆت دەگەیشتی"، پیاوەکە وەڵامی دایەوە: "سوێند بەخوا وازت لێ ناهێنم تا ئەوەم بۆ لێکنەدەیتەوە"، پیاوەکە وەڵامی دایەوە "من ئەو کەسەم منداڵان لە کتێبەکانیاندا دەیخوێننەوە کە تا ڕۆژی دوایی لەعنەتی خوا هەڵدەگرێ، من شەیتانم".

شەمس چیرۆکەکەی بەم وشانە کۆتایی پێ هێنا: "ویستم بزانن ئەو پیاوەی باوەڕی بە شەیتان هەبێ، شەیتان ئاواتەکانی بۆ بەدیدێنێ. بەڵام ئەو کەسەی شوێن پێغەمبەر بکەوێ بەبێ ئیمان، ئەوا لە ریسواییدا ئەفەوتێ وەك ئەو ئیمام و کەسە ئەفەوتێ کە ئەو قسە سووکانەی لای دەرگای مزگەوتەکەدا کرد".

سەڵاحی زێڕنگەر، کە مەولانا ئیتر پێی دەوت "ڕۆحی سۆفییان" لەگەڵ ئەوەی لە پیشەکارێکی لەخۆبوردە زیاتر نەبوو و نەیدەتوانی وشەکان بەڕەوانی دەرببڕێ، ملیوانی پاڵتۆکەی لەنێوان پەنجە گەورە و پەنجەی شایەتمانیدا گرت و عەباکەی داکەند، سێ جار دەقی کرد و لەسەر زەوی لەبەردەم شەمسدا داینا. سەڵاح ئەوەی کرد وەك کە ڕۆمی و شەمس وادەکەن کاتێ دەگەنە قۆناغی ویجد لەکاتی سەمای بیستندا، کە عەباکەیان دادەکەنن و دەیانخەنە سەر زەوی، وەك ئاماژەیەك بۆ ئازادبوون و رزگاریی ڕۆحی. لەبەرئەوە سەرباری نەبوونی مۆسیقا یان گۆرانی سەڵاح عەباکەی داکەند. بەو جوڵەیە ئاماژەی بەوەدا خۆی ئاشکرا دەکات و "ڕووت" بووەتەوە و ڕێگە بەوانیتر دەدات گوناهەکانی ببینن.

پاشان ئەو زەویەی ماچ کرد کە هەردوو پێی شەمسیان بەرکەوتوە و داوای پاراستنی لێکرد. شەمس کە هێشتا دانیشتبوو پێی وت: "ڕۆژێکیان، منداڵێك گوێی لێم بوو قسە ئەکەم، لەگەڵ ئەوەی منداڵ بوو لە دایك و باوکی دوور کەوتەوە و هۆگری من بوو. بەدرێژایی ڕۆژ سەری ئەخستە سەر هەردوو ئەژنۆم، دایك و باوکیشی نەیانئەتوانی لەوەی بخەن. هەندێ جار گوێم لێی بوو ئەیوت:

لە شەقامەکەتدا، خۆشەویستان دێن و ئەڕۆن
خوێن لە چاویان فوارە ئەبەستێ و ئەڕۆن

هەندێکیدی، وەك با دێن و ئەڕۆن

پێم وت: "ئایا ئەکرێ ئەوەی ئێستا وتت دووبارەی بکەیتەوە؟" وەڵامی دایەوە "هیچ نیە".

شەمس بێدەنگ بوو. وادیار بوو چووە بە خەیاڵی ئەو منداڵەدا کە رەنگە یەکێك لەو کەسە کەمانە بووبێ، پێش رۆمی، کە لێی تێگەیشتوون. پاشان سەلاح لێی پرسی "ئەی چی بەسەر هات؟".

شەمس وەڵامی دایەوە "لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا مرد. لەبەرئەوە جگە لە خۆم و کەسێك خۆمی تێدا ببینم، ناتوانم قسە لەگەڵ کەس بکەم. هەندێ شت هەن ناتوانم بیانڵێم. ئەو تەنها سێیەکی وت".

ئەو رستەیەی کۆتایی لە بارێکدا گوت کە بە چاوە گەشەکانی سەرنجی مەولانای دەدا. وردە وردە ئەوەمان بۆ رۆشن بوویەوە کە تەنها ئەو سێیەکەیە پیشانی رۆمی داوە، ئەو پیاوەی ناوینابوو مەلەوان "غواص" و بە وشەی "بازرگان" ئاماژەی بۆ خۆی دەکرد و وتی "مرواری"یەکی لەنێوان هەردووکیاندا داناوە.

هەروەها وتی: هێشتا توانای قسەکردنمان نیە. مۆرێك لەسەر دڵمانە. مۆرێك لەسەر زمانمانە، مۆرێك لەسەر گوێمانە".

لەبەرئەوەی ژوورەکە گەرم نەکرابوو، شەمس کە هەمیشە سەرمای بوو عەباکەی سەلاحی برد، کردیەوە و خۆی لەناویدا گرمەچۆڵە کرد. لەناو عەبا لە خوری و لباد و لۆکە چنراوەکەوە تەنها سەری دیار بوو، دەستی راستی دەرهێنا کە لە سەرمادا شین هەڵگەڕابوو و پەنجەی شایەتمانی بەبرۆکانی مەولانادا هێنا. کاتێ شەمس وایکرد هەموومان حەپەساین، بەتایبەت مەولانا. بەتێپەڕینی کات لەگەڵ ئەو جوڵە نامۆیەدا راهاتین کە نەرمی لێ دەخوێنرایەوە. بەڵام ئەو نەرمییە دەکرێ بە رێگەی نامۆتر دەربکەوێ. ئەوە بوو شەمس رووی لە رووی رۆمی نزیك کردەوە و گوێی ختوکە دەدا. مەولانا هیچ جوڵەیەکی لەخۆی پیشان نەدا. پاشان بیستم مەولانا نەیدەزانی ئەو جوڵەیە چ خۆشیەکی دەخستە دڵی شەمس.

پەنجەی شایەتمانە باریکەکە لە گەمەکردنی خۆی بەردەوام بوو. پاشان شەمس بە رۆمی وت: "لەدڵی تۆدا، خۆمم بەو شێوەیە نەبینی کە پێش تۆ خۆمم بینیبوو. لە خوا ئەپاڕێمەوە جارێکیتر لەسەر دڵت خۆشەویستم بکات. من لە خوا ئەپاڕێمەوە ئەوە بێتەدی، هەروەها من داوا لە هاوڕێکانم ئەکەم ئەوە بکەن! من نوێژ ئەکەم لەبەرئەوەی من ناتوانم ئامۆژگاریت بکەم".

ئەوە یەکەم جار بوو تێیدا شەمس، ئەو شەمسە درەوشاوەیە، بەکڵپەیەك ببینین کە خەریکە بکوژێتەوە. ئێمە وا راهاتبووین توانای زاڵبوونی بەسەر رۆمیدا هەیە. ئەوەتا ئێستا لاوازی و عەیبەی خۆی دەردەخات. کەواتە تەنانەت شەمسی تەرویزیش دەکرێ ساردیی هەستی خۆشەویستەکەی بەرانبەری، کاری تێ بکات.

ماوەیەکە، وەك شەمس باسی کرد، ڕۆمی بەدوای جازبیەتێکیتری سۆفییانەدا دەگەڕا جگە لە سەمای بیستن، جگە لەو گۆڕانەی لە یەکەم دیدارياندا تێیدا رووی دا.

دوای نزیکەی بیست ساڵ، کاتێ بوومە کەسی نزیك و ئازیزی مەولانا، باسی ماوەی پێش ڕۆیشتنی شەمسی دەکرد، دیارە هەمیشە بەدەربڕینی رووپۆشکراو. پێی دەوتم کە گۆڕانەکەی کامڵ نەبووبوو، پێویستی بە ڕوودانی شتێکی گەورە و گران هەبوو، وەك هاتنی شەمس تا ڕزگاری بکات لە شتێك کە هێشتا نازانێ کونهەکەی چییە. دوای نزیکەی بیست ساڵ کاتێ ئەو قەسیدە سۆفیانەم، لەسەر زاری خۆی، نووسینەوە کە بوونە "مەسنەوی"، ئێمە و سەرجەم شەیدایانی ڕێگەی عیشق زانیمان لە ناخی خۆیدا پێویستی بە چی بوو، ئەویش: شاعیرە. ئەوە بوو بەهۆی ڕووداوێکی تاکانە و نیگەرانیبەخشەوە، کە ونبوونی شەمس بوو، بوو بە شاعیر.

هەمیشە گومانم وابوو هۆی ساردیی مەولانا بەرانبەر شەمس و وەڕسبوونی لە بەردەوامیی شاردنەوەی پەیوەندیی نێوانیان و بەدەمەوەنەهاتنی داواکانی، ئەوە بووە شەمس تەنها یەك شتی دەویست و بەس، ئەویش ئەوە بوو ڕۆمی خۆشەویست بگەڕێتەوە ئەو بارەی لەکاتی یەکەم دیدارياندا تێیدا بوو، بەڵام هۆکە دەدرێتە پاڵ پێویستیەکی گەورەتر، چونکە ڕۆمی پەیوەندیەکەیانی بۆ ڕادەی بێموبالاتی برد، لەکاتێکدا ئەو هێشتا شەمسی خۆش دەویست.

لەکاتی نوێژی ئەم بەیانیەدا، شەمس داوای کرد مەولانا بەشێوەیەکی جیاواز ڕەفتار بکات. ڕەنگە ویستبێتی سەرزەنشتی ئیمامە زبرەکە بکات، یان ئەو پیاوە بکوژێ کە بەسەگ وەسفی کرد. ڕەنگە ویستبێتی ڕۆمی عەقڵی بخاتە لاوە و سەرکێشی بکا بە خۆ ڕیسواکردنی.

هیچ لەوانە ڕوویان نەدا. مەولانا پارێزگاری لە هێمنیەکەی کرد. وا جوڵایەوە وەك ئەوەی ئەو ئیهانەیەی نەبیستبێ کە کەسێکی نەناس ئاراستەی کرد، یان سووکایەتیکردنەکەی ئیمامەکەی نەدیبێ. نەمتوانی هۆی ساردییەکەی لێکبدەمەوە. هەر دەبێ ئەم پرسیارە بەمێشکی شەمسیشدا هاتبێ.

لە گەمەکردن لەگەڵ هەردوو برۆی ڕۆمی وەستا و بەشێوازە باوەکەی، کە پڕ بوو لە دەربڕینی نائاسایی و ناچار بووین باش گوێ شل بکەین، پێی وت: "ناتوانم داوات لێبکەم برۆی، بەڵام ئەرکی منە لەبەر بەرژەوەندیی خۆت داوات لێبکەم برۆی. دابڕان مرۆڤکولێنە. لەکاتی فیراقدا لە خۆمان ئەپرسین: بۆچی ئەو شتە کەمەم نەکرد کە خۆشەویست لێی داوا کردم؟ بیرکردنەوە لە دابڕان. هەندێ جار دەبوومە هۆی کێشە لەبەر ئەوەی قسەم نەئەکرد، هەندێ جاریتر بە ناڕوونی قسەم ئەکرد و پارێزگاریم لەهەردوو سەری بیرۆکەکەم ئەکرد، لەکاتێکدا ڕوونی پێویستە. ئەوە چی لەسەر من ئەکەوێ؟ لەپێناو تۆدا پەنجا گەشت ئەکەم. گەشتم کرد بۆ ئەوێ تا کێشەکەی تۆ چارەسەر بکەم، ئەگینا بۆ من جیاوازی چییە لەنێوان ڕۆما و سوریا، لەنێوان مەککەی پیرۆز و ئیستەنبوڵ؟ جیاوازییەکە زادەی دابڕانە، ئەو دابڕانەی دەکولێنرێ، ئەو

دابڕانەی بەدیدێ. ئێستا ئایا بۆ من واباشترە لە یەکگرتندا بکوڵێنرێ و بەدیبێ یان لە دابڕاندا؟ لەکوێیە ئەوەی لە یەکگرتندا ئەکولچێنرێ و چاوەکانی تێدا دەکاتەوە؟ لەکوێیە ئەوەی لەدەرەوە ئەوەستێ و ئەپرسێ ئاخۆ کەی ئەتوانێ بچێتە ژوورەوە؟".

سوڵتان وەلەد وتی کەس رازی نیە بە بیرۆکەی روودانی فیراقێکی نوێ لەنێوان مەولانا و شەمسدا، ئەگەر شەمس بەڕاستی بڕیاری دابێ لە رۆمی جیا ببێتەوە ئەوا ئەو رەفتارەمان والێك دەدایەوە ئەوە نهێنی ئەوە، بەڵام راستیەکەی لەوەدایە ئەو دەیەوێ ئازاری رۆمی بدات.

شەمس کە خۆی بەجلەکەی سەڵاحەوە پێچابوو، لەبەردەم مەولانادا چەمایەوە و دەستەکانی لە قەراغی ئەو قوماشەوە داپۆشیبوو دەرکێشا و هەردوو پێکانی گرت و وتی: "چۆن ئەتوانم شتێك بکەم دژی حەزەکانی تۆ؟ من کە ئەترسم کاتێ پێکانت ماچ ئەکەم بەرکەوتنی پێڵوەکانم بێزاریان بکەن".

دەنگی گۆڕا بۆ چرپە و بەحاڵ دەبیسترا، وتی: "تۆم بەتەنیا بینی. من هاوڕێی ئەو کەسەم هاوڕێی نیە". بەئاماژەیەکی مەولانا ژوورەکەمان بەجێهێشت، دوایین شت لەکاتی بەجێهێشتنی ژوورەکەدا بینیم وێنەی ئەو دوو تاقانەیە بوو کە دەستیان دەکردە ملی یەك و دەبوونە یەك.

پایزی جیابوونەوە بەرەو ساردی دەچووە پێشە. رۆژێکیان زریانوس بانگی کردم تا لە یارییەکدا لەگەڵی بەشداری بکەم، چونکە منیش وەك ئەو چێژم لە بەشداریکردنی ئەو یارییانە دەبینی. ژمارەی ئەو سەعاتانەی لە شیربازی و مەلەوانی و راکردندا بەسەرم دەبرد لەوەلای منی بۆ رۆمی و شەمس کەم نەدەکردەوە. زۆر جار، تەنانەت لەناو قوتابخانەدا، بەدەستی بەتاڵ مەشقم لەسەر یاریکردن بە تووڵ و داری خەیاڵی دەکرد.

رەنگە دیمەنەکە پێکەنیناوی دیار بێ، بەڵام شوێنی ریتمێکی دیاریکراو کەوتبووم وەك ئەوەی وەرزشوانان دەیکەن کاتێ کۆمەڵێ جوڵەی بەڕیتم دەکەن. چەندین جار رۆمی دەوەستا و سەرسامی خۆی بەماسولکەکانم دەردەبڕی کە لەژێر قورساییەکی خەیاڵیدا دەنوشتانەوە و گرژ دەبوون. شەمسیش بەهای جەستەی مرۆڤی دەزانی، کە ئامانجی ئەوەیە، لەکاتی سەمای بیستندا ئاسمان بەزەوییەوە ببەستێ، بەبێ ئەوەی هەرگیز لاوازی زەفەری پێ ببات.

دوو زۆرانبازی لاو بە دوو شەڕواڵی کورت و بەدوو جەستەی رووت و پڕ لەتاتۆ لەگۆڕەپانێکی داپۆشراودا لەبەردەم جەماوەرێکی بەغەڵبەغەڵب و ناڕێکخراودا زۆرانبازییان دەکرد. هەندێ زۆرانبازی کۆن بەشدارییان لە ناوبژیوانیکردنی یارییەکەدا کرد، ئەوانیش وەك دوو رکابەرەکە رووت بوون. هێشتا سنگە شەکەتەکانیان ئاسەواری تاتۆ کۆنەکانی پێوە دیارە کە پێدەچێ وێنەی روخساری پاڵەوانی ئەفسانەیی رۆستەمی زاڵ بێ، کە سمێڵە پڕەکەی لەنێوان لۆچەکانی سکیاندا ون بووبوو. زۆرانبازان لە وڵاتانی جۆراوجۆرەوە هاتبوون. مەغۆل و ئیگۆل و تبتی و ئێرانی و تورك و یۆنانیان تێدا بوو. بەباشی دەیانبردەوە. بەپێی رێسا

کارپێکراوەکان بۆ پارێزگاریکردن لە هێزی خۆیان دەبوو پارێزگاری لە داوێنپاکییان بکەن، بەڵام کەمێکی کەمیان پابەندی ئەمە دەبوون...

لە یارییەکەدا لەکاتێکدا هەر زۆرانبازێك هەوڵی دەدا هەردوو شانی رکابەرەکەی لەسەر زەوی تەخت بکات تا بیباتەوە، سەبارەت بەو نیگەرانیەی بەهۆی ئەو هەڕەشەیەی لەسەر شەمس لەئارادایە دایگرتووین لەگەڵ زریانوس قسەم کرد. بەشڵەژاویەوە تەماشای یارییەکەمان دەکرد. یارییەکە لەنێوان زۆرانبازێکی تبتی و یەکێکی ئیگۆریدا بوو. هاوڕێکەم لەسەر پارەیەکی کەم کرد گرەوی کە یەکێك لە زۆرانبازەکان دەیباتەوە. هێشتا بەباشی سەرنجی هەردوو زۆرانبازەکەم نەدابوو، یۆنانیەکە هەواڵی شتێکی پێدام کە ماوەیەکە گومانمان لێی هەیە، ئەویش نیازی بەهێزی شەمسە بۆ رۆیشتن. زریانوس بەوردی ئەو وشانەی بیر هێنامەوە کە باڵندەکە پێی وتبوو: "ئەوان هەرچی لەتوانایاندا بێ دەیکەن تا دوورم بخەنەوە لێی. زۆر بەختەوەر ئەبن ئەگەر بڕۆم. بەڵام ئەمجارە ئەڕۆم و کەس نامدۆزێتەوە، کەس ناتوانێ هیچم لەبارەوە بزانێ، ساڵان تێئەپەڕن و هیچ ئەسەرێکم نامێنێ و ئەڵێن یەکێك لەوانەی دوژمنم بووە کوشتوومی".

سەرم لەقاند و خەمێکی قوڵ دایگرتم هیچ خەیاڵم لای یارییەکە نەما. هەوڵم دەدا شیکردنەوەی خۆم بۆ ئەو بابەتە ئازاربەخشە کە لەوانەیە لەکاتێکی نزیکدا روو بدات پێشکەشی زریانوس بکەم. ویستی شەمس بۆ رۆیشتن جۆرە بێتاقەتیەکی لەپشتەوە بوو. هەستی کردبوو رۆمی لە رەخنەگرتنیدا داوای شتێك دەکات لە دەرەوەی پەیوەندییەك، کە رۆژ بەرۆژ بەفێڵ و دووڕوویی و چاوبەست بەرەو ئاڵۆزی و تێکگیران دەچێ.

شەمس کە بەهیوای خۆشەویستی زیاتر بوو کە هەرگیز نەهاتە دی، هەروەها لەولایشەوە رووبەڕووی هەڕەشەی پیلانگێڕان لەسەر ژیانی دەبوویەوە، دەیبینی ئەو فیراقە چاوەڕوانکراوە شتێکی حەتمییە. باش دەمناسی تەنانەت دڵنیام لەوەی هۆی دواخستنی وادەی رۆیشتنیشی، لەبەر ئەوە بوو خۆشەویستەکەی، لانی کەم بۆ ماوەیەکی کورت، دووچاری گرفتاری زیاتر نەکات ئەگەر هاتوو بۆ هەتاهەتایە لەو کەسە جیابووەوە کە خۆشی دەوێ.

هاوڕێ یۆنانیەکەم هاوارێکی هاندانی لێ بەرز بوویەوە، چونکە هەردوو شانی پاڵەوانەکەی کە جەستەی بەزەیت سواق دابوو، بەر زەوی کەوت، بەڵام زۆرانبازە ئیگۆرییەکە پشتی قەوس کردەوە و توانی بەرەنگاری زۆرانبازە تبتییەکە بکات. بەکۆشش و ناڵەناڵێك توانی پشتی راست بکاتەوە.

زریانوس هەناسەیەکی شادومانی هەڵکێشا و پێی وتم کە سەرنجەکانی منی تەواو بەگونجا بینیوە. هەروەها وتی ئەو پێی وایە شەمس چیتر ئەو پیاوەی جاران نیە، ئەو پیاوەی خۆی هەڵدەکێشا و دەیوت رۆمی تێکشکاندوە، لەبەرئەوەی —وەك ئەو دەیوت— بنیاتنان لە وێرانکردندا خۆی حەشارداوە. ئەوە بوو دوای دیدارەکەیان هەمووومان تێبینی گۆڕانی مەولانامان کرد، بەڵام کەس باسی ئەو خۆشەویستیەی نەکرد کە لە دەمارەکانی شەمسدا هەڵقوڵا، هەروەها شەمس بوو کە پێداگری دەکرد لەوەی رۆمی بە

"خۆشەویستی بێ زەمان" و "چرای قاچاغچی" و "ورووژێنەری خەو" و "فەیزی دروێنەی دەروێشەکان" و "پاشای دەرگای گڵسازەکان" و "ئەڵقەی کلیلەکان" بانگی بکات. لەکاتێکدا شەمس داوای کرانەوەی دەکرد لەسەر رۆژە یەکەمەکانیان کەچی رۆمی دوودڵی زیاتر دەبوو. ئەم حاڵەتی ناسەقامگیرییە، وەك شەمس و رۆمی دەیانزانی، بوو بەمایەی پەیدابوونی حاڵەتێکی نوێ، حاڵەتی ونبوون، هەژاری، چاوانێك کە چیتر نەیاندەتوانی خۆشەویست ببینن و بۆ گێڕانەوەی یادەوەریەکانی داخران.

ئەم جارەیان زۆرانبازە ئیگۆرییەکە توانی بکەوێتە سەر رکابەرکەی. هۆکەی نازانم، بەڵام رێك لەو ساتەدا حیکایەتێکم بیر کەوتەوە کە شەمس بۆی گێڕامەوە. ویستم بۆ زریانوسی بگێڕمەوە، بەڵام دڵنیا نەبووم لەوەی بایەخی پێدەدات، جگە لەوەیش، ئایا دەتوانێ لەناو ئەو هات و هاوارەی هاندەراندا گوێی لێم بێ؟

"رۆژێکیان سوڵتان مەحمود باڵندەی ئەفسانەیی حومی بینی کە سێبەرەکەی بەختەوەری دێنێ. دەستبەجێ فەرمانی بە سوپاکەی کرد لەژێر باڵندەکەدا ریز ببن. هەمووان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، جگە لە خزمەتکارە رێزدارەکەی، واتە هەیاس. کاتێ سوڵتان زانی خزمەتکارەکەی لەژێر سێبەری باڵندەکەدا نەوەستاوە، خۆی چوو بەدووایدا گەڕا و سەرەنجام بینی لەژێر ئەسپەکەیدا خۆی گرمەچۆڵە کردوە. سوڵتان لێی پرسی: "بۆچی لەژێر سێبەری باڵندەی حومدا نەوەستاوی؟"، خزمەتکارەکە وەڵامی دایەوە "تۆ باڵندەی ئەفسانەیی منی! ئەو سێبەرەی من بەدووایدا دەگەڕێم سێبەری تۆیە. ئیتر بۆچی سووری لەسەر ئەوەی واز لە تۆ بێنم و بەدوای سێبەرێکیتردا بگەڕێم؟".

دیارە، بەدەم ئاوڕدانەوە لە زریانوس کە بەجۆشەوە سەیری یارییەکەی دەکرد، ئاماژەم بەوەدا کە شەمس کاتێ ئەم چیرۆکی خورافیەی بۆ گێڕامەوە قسەکەی ئاراستەی من نەدەکرد، بەڵکو ئاراستەی رۆمی دەکرد. ئەو سێبەرەی ئەو بەدووایدا دەگەڕا و دۆزیەوە سێبەری مەولانا بوو. رەنگە باڵندەی بەختەوەرییەکەی لە یەك شت زیاتر نەبێ، کە بەناوی م ئاماژەی بۆ دەکات.

زریانوس بایەخی بەچیرۆك و سەرنجەکەم دا و هێشتا چاوی لەسەر سەکۆکەی یارییەکە بوو و پێی وتم: "ناکۆکی نێوان دوو خۆشەویستەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە بەلای شەمسەوە دەسکەوت بەدیهاتووە، بەڵام بۆ مەولانا بەدینەهاتووە. بۆ تەواوبوونی ئەو عیشقە، دەبوو لێك جیا ببنەوە. هەردووکیان ئەوە دەزانن، هەندێ لە ئێمەیش ئەوە دەزانین. حوسام تۆیش، هەوڵ مەدە ئەوەی دەیزانی بیشاریتەوە، ئەوە دەزانی. بەڵام ئایا ئەوان، کە هەریەکەیان کەمەندکێشی ئەویتریانە، دەتوانن ئەو جیابوونەوەیە ئەنجام بدەن؟ کێ ئەو جۆشبوونە دەکاتەوە؟ کێ ئەو سنوورانە دەکێشێ و دیوارەکە دروست دەکات؟ کامیان؟! کێ؟!

پاشان هاوڕێکەم لە کورسیەکەی بازی دا و هەردوو دەستی بەرز کردەوە و دەنگی خۆی خستەپاڵ دەنگی هاندەرانی زۆرانبازە ئیگۆرییەکە، چونکە زۆرانبازە جێپەسەندەکەی توانی هەردوو شانی زۆرانبازە تبتییەکە لەسەر زەوی جووت بکات. هاوڕێکەم بڕێکی کەم پارەی دەست دەکەوێ لەبەرئەوەی گرەوەکەی بردەوە. زۆرانبازە تبتییەکە هێشتا لەسەر زەوی راکشابوو. هەردوو زۆرانبازەکە براوە و دۆڕاو ناوچاوانی یەکتریان ماچ کرد و سەکۆکەیان بەجێهێشت. ناوبژیوانەکە هەستا. پێچەکانی گەدەی کرانەوە و تاتۆی رۆستەمێکی کوێر دەرکەوت کە گلێنەی چاوی بەتێپەڕبوونی کات سڕابووەوە. بۆ ئەوەی ئەو پارەیە بەدەست بێنێ کە بردبوویەوە، زریانوس بەناو حەشاماتەکەدا کەخەریك بوو بڵاوەیان لێدەکرد رێگەی بڕی. بیرم لە شەمس و مەولانا دەکردەوە. دەبێ کامیان هەردوو شانی ئەویتریان لەسەر زەوی جووت بکات. ئایا پێویستە براوە و دۆڕاو هەبێ؟

رۆژی دواتر خۆری نیوەڕۆ گەرمای لەم رۆژە پایزییەدا بڵاو کردەوە، پایزی فیراق. لەگەڵ شەمس چووم بۆ سەیرانگەیەك کە گۆم و کانیاوی دەستکردی زۆری تێدا بوو. دوای ئەوەی پێڵاوەکانمان داکەند چووینە ناو خێوەتێك کە درەختی سنەوبەر سێبەریان بۆ کردبوو، خواردنی تێدا پێشکەش دەکرا. چەند مشتەرییەك لەوێ بوون. شەمس لەسەر تەختێك دانیشت کە حەسیری بەسەردا درابوو، داوای گۆشتی بەرخی برژاو و کەمێك شەرابمان کرد. شەمس چەند قومێکی لێدا و وتی جۆرەکەی باش نیە. وەك هەمیشە بەبێ ئیشتیا نانی خوارد. بەڵام من شەرابەکەم بەدڵ بوو، بەڵام کاتێ شەمس وتی جۆرەکەی باش نیە لەدڵی خۆمدا وتم ئەو خۆیشی باش نیە. ئەوەندە بەس بوو شەمس رای خۆی لەبارەی خواردن یان خواردنەوەیەك یان قەسیدەیەك یان کتێبێك دەربڕێ، تا منیش دەستبەجێ سەرباری بەرەنگاری ناو ناخم بۆچوونەکەی پەسەند بکەم. خۆ ئەگەر وا رێکەوت لەگەڵی کۆك نەبووم ئەوا بەردەوام قەناعەتم وادەبێ کە ئەو هەمیشە لەسەر هەقە و لەکۆتاییدا لەگەڵ بۆچوونەکەی هاوڕا دەبم. من پێش ئەوەی دەست پێبکەم دەبەزیم.

شەمس وتی: "کاتێ بینیمی، شێخێك پێی سەیر بوو، یەکێکیدی سەری داخست، چوارەم سوژدەی برد و هەڵنەسایەوە، پێنجەم لەسەر زەوی خلۆر بوویەوە. شەشەم بەپێڵاوەکەی کێشای بەسەری خۆیدا تا خوێن لەناوچاوانی هاتە خوارەوە".

تیمێك لە سەماکەرانی قەرەچ یان "قولی" هاتنە ژوورەوە. ئەو سەماکەرانە بەچاوە برسیکەدارە تاریکەکانیانەوە چەندین سەدەیە لە هیندەوە، دەڵێن لەلاهورەوە هاتوون بۆ ئەم خاکەی ئێمە، کەچی هێشتا لێرە، وەك شەمس، مامەڵەی غەریبەیان لەگەڵ دەکرێ و بەزمانێکی نەناسراو قسە دەکەن، بەڵام ئەسپەکان بەگوێیان دەکەن.

هەر کە چوونە ژوورەوە کچەکان لەسەر نەغمەی ئاوازێکی میللی دەستیان بەسەما کرد. پێم سەیر بوو کاتێ گوێم لێبوو شەمس لەبەر  خۆیەوە وشەکانی ئەو گۆرانییە ناسراوە دەڵێتەوە. چۆن دەکرێ شەمس

که هەندێ جار لە گوێگرتن لە قورئانیش بێزار دەبێ ئەو گۆرانییانە بزانێ؟. ئەم پرسیارە و چەندین پرسیاریترم لە خۆم کرد، بەڵام وەڵامێکی شافیم دەستنەکەوت، لەگەڵ ئەوەی تێگەیشتبووم شەیدابوونی من لەم حیرەتە خۆراك وەردەگرێ. حەزم لە (موفاجەئە) بوو. لەمیانەی گەشتەکانم لەگەڵ شەمس و یاوەریکردنی بۆ خان و مەیخانەکان یان بۆ شوێنە گشتیەکانیتر، چەندین جار داوای لێکردووم هەندێ پارە بدەمە ژەنیارە گەڕۆکەکان، نەك بۆ پاداشتکردنیان لەسەر ژەنینیان، بەڵکو بۆ ئەوەی لە ژەنین بوەستن. کاتێکیش نەیدەتوانی بیانوەستێنێ، گوێکانی لەبەردەم ژەنیارە وڕەکاندا دادەخست. لەو ساتانەدا هەستم تەریقبوونەوەیەکی قووڵ دەکرد و هەوڵم دەدا بەرامبەر سەیرکردنە پرسیارئامێزەکانیان بوەستم و بەزەردەخەنەیەکی دەستکرد هەوڵی رازیکردنیان بدەم.

بەڵام لەو رۆژەدا حەزی لە گۆرانیەکانی قەرەجی قولی بوو و بەلەبەر خۆیەوە وتنەوەی بەشداریی گۆرانیەکانیانی دەکرد. لەبەرئەوەی بەرگەی هەڵکردنی کەمترین بای نەدەگرت، داوای بەتانیەکی کرد و خۆی پێپێچایەوە و لە سەیرکردنی سەماکە بەردەوام بوو.

کاتێ قەرەجەکان گۆرانیەکانیان تەواو کرد، گۆرانیبێژێك دەستی بەگۆرانی کرد، پاشان حیکایەتخوانێك کەوتە حیکایەت گێڕانەوە. ئەو حیکایەتخوانە دەیتوانی یاری بەدەنگی بکات و لاسایی کەسایەتیی جیاواز بکاتەوە. لەنێو ئەو چیرۆکانەی گێڕانیەوە چیرۆکی کچە شازادەیەك بوو کە لەگەڵ کۆیلەیەکدا خەوتبوو کە لە قەراغی شەقامێکی هەژاری شارەکە دۆزیبوویەوە. پاشن شۆردبوی و عەتری لێدابوو وای لێکردبوو هۆشبەرێك بخواتەوە و پاشان بەیاوەری کۆمەڵێ کەنیزەك بردبووی بۆ لای تەختە شاهانەکە. لاسایی پاراویی ئەمیرەکە و بازاڕیبوون و سەرسوڕمانی جووتیارێکی دەکردەوە کە وایدەزانی لە خەونێکدا دەژی. حیکایەتخوانەکە سڵی نەدەکردەوە لە بەکارهێنانی دەستەواژەی قۆڕ کە دەمزانی خۆشی دەخاتە دڵی شەمس کە زۆر نەیاری موجامەلە و عورفە باوەکان و رێنماییە توندەکانی بنەما ئەخلاقییە بڵاوەکان بوو.

شەمس کە تەواو چێژی لەو وردکارییە بازاڕییە لەبارەی سەرجێییکردنی کۆیلەکە و کچە شازادەکە دەبینی، بەهەڵپەوە کەوتە مەی خواردنەوە. تۆ بڵێی حوکمە توندەکان و رقبوونی لە مەی لەبیر کردوە؟

لەو کاتەی حیکایەتخوانەکە باسی وردەکارییەکانی ئەو دیمەنەی دەکرد، لە خێوەتەکاندا دوو کەس دەرکەوتن، گومانم بۆ دروست بوو لە تاقمەکەی عەلان.

دڵم چەند ساتێك لە لێدان وەستا. لەچاو تروکانێکدا بینیم شەمس مردوە، لە عەقڵی خۆمدا لەوێ بینیم، لەو ساتەدا کە چەقۆی دوژمنەکانی لە جەستەیدا دەچەقین و خوێنەکەی تێکەڵ بەو جۆگەلەیە دەبوو کە لەژێر درەختەکاندا قوڵپی دەدا. خۆمم هاتە پێش چاو جەستەی کەسە پیرۆزەکە، خۆشەویستی مەولانام بەکۆمەڵێ برینی قووڵەوە پاڵ خستوە، پاشان پەنجە باریکەکانی ماچ دەکەم کە پەڵەی مرەکەب یان رەنگی سەوزیان پێوەیە و ئاسەواری لەتکردنی گوێزی فەریکەیە بەدەستیەوە. گوێم لە هاوار هاواری خەڵك

بوو داوای فریاکەوتنیان دەکرد. ڕێگەم نەدا خاوەن مەیخانەکە کە دەیویست خوێنبەربوونەکە لەڕێی داخکردنی برینەکانی شەمس بەسیخێکی کانزایی سووربووەوە بوەستێنێ، هەمان سیخ کە بۆ برژاندنی کەباب بەکاری دەهێنا. گوێم لە خشەخشی تەنورەی کچە قولییەکان بوو کە ڕایاندەکردە دەرەوە تا بە ئەنجامدانی تاوانی کوشتن تۆمەتبار نەکرێن. لەچاوی حیکایەتخوانەکەشدا فرمێسکەکانی کچە شازادەکە و شڵەژانی کۆیلەکەم دەبینی.

یەکێك لە بکوژە گریمانکراوەکان لە شەمس نزیك کەوتەوە. هەستام دەست وەربدەم، بەڵام بکوژەکەی تر بەپەنجکانی ئاماژەی بۆ کرد و بەو پەڕی دەنگی بە کڕیارەکانی وت: "ئەی موسڵمانان، بەبەرچاوتان کفر دەکرێ و ئێوە هیچ ناکەن. تەماشای ئەو پیاوە بکەن کە ناوی خوای لەسەر کڵاوەکەی نووسیوە، هەروەها ئەو شەرابە دەخواتەوە کە خوا حەرامی کردوە، بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك پەشیمان بێ".

شەمس کە هێشتا خۆی بەبەتانیەکەوە پێچابوو کوپە فەخفورییە پڕ لە شەرابەکەی لەسەر زەوی دانا و بە لامسەلاییەوە وتی: "حەڵاڵ یان حەرامکردنی خواردنەوەی مەی بەپێی ئەو کەسەیە دەیخواتەوە. ئەگەر گۆزەیەکی پڕ مەی بڕژێنینە ناو دەریا ئەوا مەی—ەکە دەریاکە ناگۆڕێ، لێڵیشی ناکات و ڕێگە دەدرێ ئەو ئاوە بۆ شۆردن و خواردنەوە بەکار بهێنرێ، بەڵام دەکرێ یەك دڵۆپ مەی گۆمێکی بچوکی ئاو پیس بکات. بەدەربڕینێکی وردتر: ئەگەر من مەی بخۆمەوە، ئەوا من دەریام، بەڵام کەسێکی وەك تۆ، ئەی برای سۆزانی،! تەنانەت نانی جۆیش بۆی حەرام دەبێ".

پیاوی دووەم لە شەمس نزیك کەوتەوە بۆ ئەوەی لێی بدات. هەستامەوە سەرپێ بەهۆی قەد و قیافە بەهێزەکەم و خوێسە هەڕەشە ئامێزەکەمەوە پاشەکشەی کرد. تا دەرگاکە بەدوایدا چووم وەك ئەوەی ئاژەڵێکی دڕندە ڕاو بنێم.

هاوەڵەکەی کە دەنگەدەنگەکەی دروست کرد شپرز بوو و هەندێ ترس دایگرت. کەم مەترسیتر لەویتریان دەرکەوت. بە بیرکردنەوە لەوەی ئەو دەمارگیرە کە بەحەرفی دەستی بە ڕێساکانی قوئانەوە گرتوە و دەپرسێ ئاخۆ نانی ئەو جۆیەی هەڵیگرتوە حەرامە، پێکەنینم دەهات. دوای ئەوەی بینی ناوی پێغەمبەر و ناوی خوا لەسەر مێزەرەکەی شەمس نەخشێنراون، ڕەنگە لەوە دڵنیا بووبێ ئیماندارێکی بەڕێزە و شایستەی چاولێکردنە. لەڕاستیەوە دوور نەبووم، چونکە لەکۆتاییدا بەهەندێ شەرمەوە لە شەمسی پرسی: "دەبێ چی بکەین تا لە سنووری شەریعەتدا بمێنینەوە؟" شەمس کە خۆی بە بەتانیەکەوە پێچابوو، مێزەرەکەی کە ناوی خوای لەسەر نووسرابوو و روومەتە لاوازەکەی بەحاڵ لە کونی خورییەکەوە دیار بوون، وەڵامی دایەوە: "ئەگەر تائێستا لە هەر شتێك کە خوا حەرامی کردوە خۆتت بەدوور گرتوە، ئەوا پێویستە لەسەرت لێرە بەدواوە خۆت لەوانە بەدووری بگری کە خوا حەڵاڵی کردوون. هەر مرۆڤێك هەڵە و گوناهی خۆی هەیە: بەلای هەندێکەوە گوناهـ بریتییە لە زینا و فێڵ، بەلای

هەندێکیترەوە غیابی بوونی ئیلاهییە، هەندێ پێیان وایە رۆبی زینا بیدعەیە، هەندێکیتر پێیان وایە رۆبی بیدعە بریتییە لە عورف و عادەتەکان".

شەمس توانی تروسکاییەك لەو پیاوەدا بێدار بکاتەوە کە سووکایەتی پێکرد. پیاوەکە کە وادیار بوو لە بیرکردنەوەدا رۆچووبوو دوور کەوتەوە، هەروەها لەگەڵ هاوەڵەکەیدا دوور کەوتەوە کە هێشتا لەپشت دەرگاکەوە وەستابوو. پارەی ئەو شتانەم دایە خاوەن مەیخانەکە کە کڕیبومان، ئیکرامیەکی گەورەیشم دایە بۆ سەماکەرەکان و حیکایەتخوانەکە. بە موعجیزە لە مەترسی رزگارمان بوو. ئاماژەم دایە شەمس کە کاتی ئەوە هاتووە بڕۆین. کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێتەوە بۆ حەشارگەکەی تا لە چاوە فزولیەکان بشارێتەوە، بۆ خەڵوەتەکەی، تەنانەت بەبێ رۆمیش.

بەنابەدڵی بەتانیەکەی بەرز کردەوە و هەستایە سەر پێ و شوێنم کەوت بۆ دەرگاکە. بەهەڵە پێڵاوی کەسێکیتری لەپێ کرد. زۆرجار شەمس لێی تێکەڵ دەبوو لەباتی کەلوپەلی خۆی کەلوپەلی کەسانیتری دەبرد. کاتێ هەستی کرد ئاسوودە نیە بە پێڵاوەکە دایکەند و کەوتە گەڕان لەناو پێڵاوەکاندا. سەرەنجام پێڵاوەکەی، پێڵاوە درێژە ناو خورییەکەی دۆزیەوە و لەپێی کرد. ئێستا دەتوانین خێوەتەکە بەجێ بێڵین. پەلەم بوو بگەڕێینەوە، چونکە هەر ئێستا دووچاری مەترسی بووین، نامەوێ خۆ لە قەرەی سەرکێشیەکیتر بدەین. بەڵام یەکێك لە کڕیارەکان کە بینی شەمس پێڵاوەکەی لەپێ دەکرد، پلارێکی تێ گرت. شەمس وەستابوو نەدەجوڵا. هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەدەنگێك کە بەحاڵ دەبیسترا و وتی "با کەسێك ئەو جلە دابکەنێ تەنانەت ئەگەر هی منیش بێ".

بۆ خۆلادان لە دیداریتری چاوەڕواننەکراو، هانم دا پەلە بکەین لە گەڕانەوە بۆ ماڵ، بەڵام ئەو بەرهەڵستی کرد و لە رۆیشتندا خاوەخاوی دەکرد، لەکۆتاییدا پێی وتم: "دەستەکانم ناتوانن هیچ بکەن. دڵی هەژارم ناتوانێ لە هیچ شوێنێك ئۆقرە بگرێ، ئەو باڵندەیە ناتوانێ هیچ جۆرە دەنکۆڵەیەك بخوات".

خۆمان لە کەناری دەریاچەیەك بینییەوە کە جمەی دەهات لە بەلەمی پڕ لە خەڵك. دیدێکم بۆ هات: یەکێك لە بەلەمەکان هەڵگەڕایەوە. حیکایەتخوانەکە و سەرجەم کەسایەتیەکانی لەسەر بەلەمەکە بوون، کچە شازادەکە و کۆیلەکەیش چوونە پاڵیان، تەنانەت پاش ئەوەیش نوقم بوون.

# کاڵ بووم، کولاّم و بوومە قەقنەس

چوومە ماڵی مەولانا و گوێم لە دەنگەدەنگێکی نائاسایی بوو. خزمەتکارەکان زۆر شپرز بوون و خۆیانیان بۆ یاوەریکردنی ئافرەتان لە حەرەملکەوە بۆ باخچەی میرام ئامادە دەکرد. هەندێکیتر ئەو هێسترانەیان رادەکێشا کە ئافرەتان بۆ دەرگای سەرەکی سواریان دەبن. ئافرەتان کە هێشتا لە ژوورەکانیاندا بوون، چوتەچوتیان بوو و ناڕەزاییان دەردەبڕی لە دەرچوون بەپەلە. هێشتا هیچکامیان ئامادە نەبوون بۆ دەرچوون پێش ئەوەی باش خۆیان ئامادە بکەن، چونکە لەبەردەم تەواوی قۆنیەدا، لە باخچەی نایابی میرامدا دەردەکەون، کە تێیدا ئەو عازەبانەی شارەکە کە بۆ هاوسەرگیری ئامادەن بەیەك دەگەن.

مەولانا لە ژوورەکەیدا وەستابوو و نیشانەی بێزاری بەسیمایەوە دیار بوو. بەوریایی چوومە پێش. پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە پێڵاوەکەم داکەند، بەویقارەوە سڵاوم لە رۆمی کرد و هەردوو دەستیشم لەسەر سینگم تێکئاڵابوون و پەنجەکانی دەستی راستم بەر شانی چەپم و پەنجەکانی دەستی چەپم بەر شانی راستم کەوتبوون، پەنجەی گەورەی پێی راستم لەسەر پەنجەی گەورەی پێی چەپم دانابوو و لەبەردەم ئیمامدا چەمامەوە وەك هێمایەك بۆ رێز و هەیبەت. باری پێ، رەنگدانەوەی ئەو دڵسۆزییە گەورەیە رۆژێکیان یەکێك لە چێشتلێنەران بۆ رۆمی پیشان دابوو. رۆژێکیان، رۆمی چووە دەرەوە بۆ دەوروبەری قۆنیە، دەوترێ کاتێ چێشتلێنەرەکە ئاگری ئاگردانەکەی دیوە کوژاوەتەوە، پێی خۆی ئاگر داوە تا ئەو خواردنەی بۆ میوانانی رۆمی ئامادە دەکات لەکاتی خۆیدا ئامادە ببێ. کاتێ بینی تەنها پەنجە گەورەی پێی چەپی بووەتە خەڵوز، چێشتلێنەرەکە ئەوەی بەوە لێکدایەوە کە نیشانەی ناتەواویی ئیمانیەتی. هەستی کرد دەبێ —سەرباری ئازار— رێگە بدات تەواوی پێی گڕ بگرێ. کاتێ رۆمی لەبەردەمیدا بینی، چێشتلێنەرە بێچارەکە "پەنجە گەورەی پێ سووتاو"ەکەی لەژێر پێی راستیدا شاردەوە. مەولانا کە سەرنجی هەموو ئەوانەی دا بە چێشتلێنەرەکە وت کە ئەو یەکێکە لە باوەڕدارە راستەقینە کەمەکان لەسەر رووی زەوی. هەروەها وتی لەئێستا بەدواوە، دانانی پەنجە گەورەی پێیەك لەژێر پەنجە گەورەی پێکەیتر، دەبێتە ئاماژە بۆ رێزگرتن و ئیمان و بێگەردیی قوربانیدان و دڵسۆزی لەنێوان شوێنکەوتەکانیدا.

مەولانا بەدانانی دەستی چەپی لەسەر سینگی لەناو جلەکەی و دانانی دەستی راستی لەسەر جلەکەیەوە لەسەری، وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە. لێی نزیك بوومەوە و ئەو دەستەیم زیارەت کرد کە لەدەرەوەی جلەکە بوو. لەبەرانبەردا هەردوو لێوەکانی لەسەر مێزەرەکەم دانا. ئەم سروتە تازانە کە دەستمان دابووە ئەنجامدانیان لەناو بازنە بچوکەکەماندا، هێمایە بۆ هەڵاتن لەم جیهانە و چوونە ناو جیهانەکەیدی لەڕێی سەمای بیستنەوە. بۆ نموونە مێزەرە هێمایە بۆ کێلی گۆڕ، رۆبی سپیش کە

سەماکەرانی بیستن لەبەری دەکەن، هێمایە بۆ کفنی ئیسلامی، داکەندنی عەباکەیش هێمایە بۆ وەلانانی پەیوەندییە ماددیەکان، هەرچی خولانەوەیە ئاماژەیە بۆ فڕین بەرەو حەقیقەت. ناولەپی دەستی ڕاست بەکراوەیی بەئاراستەی ئاسمان ئامادەیی بۆ چوونە ناو بەهەشت دەگەیەنێ، ناولەپی دەستی چەپیش بەکراوەیی بەئاراستەی زەوی ناردنی ئەو سوودانە بۆ زەویی دایکمان دەگەیەنێ.

کاتێ لە سلاو لەیەکترکردن بووینەوە، ڕۆمی پێی وتم وادیارە شەمس تووڕەیە، لەبەرئەوەی دەمەقالەی لەگەڵ کیمیا کرد کە ماڵی بەجێهێشت و چوو بۆ باخچەی میرام. "لەبەرئەوە فەرمانم کرد بچن و بەزووترین کات کیمیا بگێڕنەوە، بەڵام ئەوان خاوەخاو دەکەن. بەڵکو ئەوان تائێستا نەڕۆیشتوون. بڕۆ و لە حاڵی شەمس دڵنیابە، دەترسم تووڕەییەکەی کاریگەریی خراپی لەسەر تەندروستی هەبێ".

ژوورەکەم بەجێهێشت. کاتێ گەیشتمە ژوورەکەی شەمس گوێم لە کیمیا بوو پێدەکەنی، پاشان گوێم لە دەنگی مێردەکەیشی بوو. بەحەزەرێکی زۆرەوە لە کونی کلیلەکەوە تەماشایەکی ژوورەوەم کرد. بینیم باوەش بەیەکدا دەکەن. رامکرد تا مەولانا دڵنیا بکەمەوە و پێم وت: "کیمیا گەڕایەوە، بەدڵنیاییەوە شەمس تووڕە نیە. ئەوان وا چێژ لە کاتەکەیان دەبەن و پێدەکەنن".

ڕۆمی تێنەگەیشت چۆن دەکرێ کیمیا بگەڕێتەوە لەکاتێکدا ئافرەتەکان هێشتا ماڵەکەیان بەجێنەهێشتووە. ناکرێ کیمیا بێ. داوای لێکردم وەسفی جلەکانی بکەم. لەو ئەندازە کەمەی بینیم تەنورەیەکی شین و کراسێکی سەوزی قۆڵدرێژی لەبەردا بوو. ڕۆمی دانی بەوەدا نا ئەوە هەر ئەوەیە کیمیا لەبەری کردوە کاتێ حیجابەکەی دادایەوە پێش ئەوەی بەخێرایی دەربچێ. بەشپرزی هەستایە سەرپێ و روومان کردە ژوورەکەی شەمس، کە ئەم جارەیش مەولانا لە کونی کلیلکەوە بینی دەست لەملان دەکەن. بازیدایە دوواوە، بەڵام گوێی لە دەنگی شەمس بوو بانگی دەکرد بۆ ژوورەوە، مەولانا چووە ژوورەوە.

تا دوای تێپەڕینی چەند ساڵێك و ماوەیەکی زۆر پاش ڕۆیشتنی شەمس بۆی باس نەکردم دوای ئەوە چی رووی داوە. ڕۆمی قسەی لەگەڵ دوو سۆفیتر دەکرد کە لەبارەی تەجەلیاتە جیاوازەکانی خوا پرسیاریان لێ دەکرد.

"لەو ڕۆژەدا کاتێ چوومە ژوورەکەی شەمس، لە ژوورەکەدا تەنها بوو. نەمتوانی خۆم بگرم لە پرسیارلێکردنی سەبارەت بە دەرکەوتن و دیارنەمانی تەمومژاویی کیمیا، پێی وتم: "خوای توانا بەڕادەیەك خۆشی ئەوێم کە لە خۆشەویسترین ئەو شێوانەی خۆشم ئەوێن دێتە لام. ئێستا خۆی لە شێوەی کیمیادا بۆ ئاشکرا کردم".

مەولانا نموونەیەکیتری هێنایەوە، ئەویش چیرۆکی بەستامی بوو، ئەو پیاوەی تا رادەیەکی زۆر لە شەمس دەچێ، کە خوای بەبەرجەستە لە دیمەنی پیاوێکی نێرەموکدا بینی.

کاتێ زانی ئەو سۆفیانەی هەموو لەسەر تێگەیشتن لە وشەکانی راهاتوون، تێی نەگەیشتن، رۆمی ناچار بوو زیاتر لەسەر بابەتەکە بچێ.

"لە حاڵەتی بەستامیدا دوو ئەگەر هەیە. یان ئەوەتا خوای لە شێوەی پیاوێکی نێرەموکدا دیوە، یان خوا لەو شێوەیەی خۆی بەچاکی زانیوە پێشکەشی کردوە، واتە لە شێوەی پیاوێکی نێرەموکدا". ئەم خوایەی لە شێوەی ژنێکی گەنجی جوان و هەندێ جار لە شێوەی پیاوێکی نێرەموکدا دەرکەوت، ئەوە خوای ئەو مەولانایەیە باسی دەکات.

بەڵام لە ماوەی ئەو پایزی فیراقەدا، کیمیای شۆخ و شەنگ بەردەوام سەفای ژیانی رۆژانەی شەمسی لێڵ دەکرد. نە من و نە زریانوس و نە تەنانەت سوڵتان وەلەدیش سروشتی پەیوەندیی شەمس و ژنەکەیمان نەدەزانی، ئەو دەیوت گوایە خۆشی ناوێ، بەڵام وادیاربوو چێژی لە حزوری دەبینی. خۆ ئەگەر رێبکەوتایە لەبەر هەر هۆیەك بۆ ماوەیەك شەمسی بەجێ بهێشتایە گوێت لە دەنگی هاواری شەمس دەبوو لەماڵەکەیدا. لە سوڵتان وەلەدەوە کە زانیارییەکانی لەکیرای باوەژنی و نهێنیپارێزی کیمیاوە کۆدەکاتەوە، زانیم کیمیا مێردەکەی خۆش دەوێ، بەڵام شەمس بەئاشکرا رایگەیاند ئەو گرنگی بەبابەتە عاتیفیەکان نادات. ئایا پێویستە باوەڕمان وابێ تورەبوونەکانی ئامانجێکیتریان نەبووە؟. ئەو، ئەوەی بۆ من دووپات کردەوە و داوای کرد ئەمەی خوارەوە بنووسم: "ئەنووسم من، شەمسی تەورێزی، دەبمە مایەی سەرێشە و ئازار بۆ هەر کەسێ خۆشی بوێم".

ئەمەی چەند رۆژێك دوای روودانی ئەو چیرۆکە پێ وتم، کە هەندێ باس لەوە دەکەن گوایە کیمیا چووە بۆ باخچەی میرام شەمسیش زۆر تورە بووە، لەبەرئەوەی مۆڵەتی لێوەر نەگرتوە.

ئەو رۆژە کەش و هەوا زۆر سارد بوو. شەمس لەتەنیشت ئاگردانەکە کسکۆڵەی کردبوو، کاتێ کیمیا هاتە ژوورەکەیان کزەبایەکی سارد هەڵیکرد. سڵاوی لە مێردەکەی کرد بەبێ ئەوەی بزانێ ئەو کارە تووڕەی کردوە. پێڵاوەکانی داکەند و ئەو قوڕەی پێیانەوە نووسابوو لە قەراغی دەرگاکەدا لێی کردەوە و دوو جووت گۆرەوی لەسەر یەك لەپێ کرد تا سەرمای نەبێ و چوو لای شەمس دانیشت.

لەو کاتەوە هاتبووە ژورەوە شەمس بەردەوام مرِی لێدەکرد. لەپڕ دەستی کرد بەهاوار و جنێودان. کیمیا ئاوڕی لێدایەوە، چەندە زیرەی کردبوو هێندەش سەری سوڕمابوو. ئازارێکی توند چووە ناو ملی و وای لێکرد بیبەستێ. نەیدەتوانی سەری یان باڵەکانی بجوڵێنێ. دەستبەجێ بەرەو لای کورسییەکە چوو، ئەو مێزە نزمەی ئاگردانێکی لەژێردایە، تا پاڵ بکەوێ و چاوەڕوانی کرد تا شەمس هێور بێتەوە و دڵنیای بکاتەوە و هۆی غیابەکەی بۆ روون بکاتەوە.

شەمس کە پەشیمان بوو لەوەی کردی ژووری خەوتنەکەیانی بەجێهێشت و رووی کردە ئەو ژوورەی بەزۆری بەیاوەری رۆمی بەمەبەستی رامان پەنای بۆ دەبات. بەرەبەیانی رۆژی دواتر کیمیای بینی لەسەر

زەوی ڕاکشاوە، لەئازاردا بڕستی لێبڕابوو، پەکی کەوتبوو، تەنانەت نەیدەتوانی تینوێتی خۆشی بشکێنێ. دەمی داچەقابوو، چاوەکانی داخرابوون، ڕومەتی شێوابوو وەك ئەوەی تەرمێکی ساردوسڕ بێ. شەمس چەند جارێ بانگی کرد بەڵام وەڵامی نەدایەوە. لێی نزیك کەوتەوە، لێدانی دڵی گرت، هەناسەدانی پشکنی. کیمیا بەزەحمەت چاوەکانی کردەوە، بەڵام نەیتوانی قسە بکات. شەمسەکەی هەوڵی دا ئارامی بکاتەوە. دەبێ ئەو یەکەم کەس بێ بزانێ شەمس کەسێکی چەندە زیاتر خۆش بوێ خراپتر مامەڵەی لەگەڵ دەکات، زوو تووڕە دەبێ بەڵام زوویش هێور دەبێتەوە، هەروەها چیتر لەو تووڕە نیە. شێتانەیش هۆگریەتی . کیمیا فێری شەترەنجی دەکرد. شەمس دەیزانی ئەگەر فێرکردنەکانی کیمیا نەبوایە نەشارەزاترین یاریزانەکان لێیان دەبردەوە. کیمیا هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە تا زەردەخەنەیەکی کۆتایی لەسەر ڕووی بنەخشێنێ، پاشان لەهۆش خۆی چوو.

گەورەترین پزیشکانی قۆنیە یەك لەدوای یەك هاتنە سەری و تیماریان کرد، بەڵام نەیاتوانی بیبوژێننەوە، نە گیراوە هیندی و چینیەکان و نە دوعا و نوشتەکان، تەنانەت نە بوونی مەولانایش کە بە یاوەری شەمس لەپاڵ دیواری ژووری نوستنەکەدا شەونخونی دەکێشا، فریای نەکەوتن. لەسێیەم ڕۆژدا مرد.

وەك عادەت وا بوو، تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ گەرماوی مردوان تا بەئاو بشۆرێ و بەگەڵای عەنابی وشککراو دەستی تێ بدرێ. پاش سێ جار نوقمکردن لە ئاودا ئافرەتان تەرمەکەیان بە کافور داپۆشی، لەسەر داوای کیرا چەند دڵۆپێك زەیتی داری سەندەل و کەهرەمان و گوڵاویان بۆ زیاد کرد، لەکۆتاییدا بەقوماشێکی لۆکەیی ڕەنگ زیوی مەیلەو زەرد پێچایانەوە.

کەژاوەی جەنازەکە چاوەڕوانی دەکرد. دوای شۆردنی تەرمەکە خرایە ناو دارمەیتێك و ڕوومان کردە گۆڕستان. ڕۆمی و شەمس کە هەندێ لە باقی خەڵکەکە دوور بوون بەتەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن، نزیك کەوتمەوە تا ملپێچێکی خوری بدەمە شەمس کە بەردەوام هەستی بەسەرما دەکرد. دەستی ڕاکێشا ملپێچەکەی برد و بەبێ ئەوەی هەست بە بوونی من بکات درێژەی بەقسەکانی دایەوە ، وتی: "من پەیوەندیم بە نەهامەتییەوە نیە، نەهامەتی لە بوونەوە دێ. بوونی من خۆشی لێ ئەبارێ، بۆچی ڕێگە بە نەهامەتیی دەرەکی بدەم بێتە ناو بوونم؟ .. کەواتە من ڕەتی ئەکەمەوە و فڕێی ئەدەمە دەرەوەی ماڵ".

هەردوو شانی داپۆشی و بێدەنگ بوو. دوور کەوتمەوە تا بچمە لای خەڵکەکەیتر و بەشدارییان بکەم لە خوێندنی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز. کاتێ تەرمەکەی بەخاك سپێردرا تەماشایەکی دوو پیاوەکەم کرد. چاوەکانیان داخرابوون، هەروەها لەسەر ڕیتمێك سەریان دەلەراندەوە وەك ئەوەی مۆسیقایەکی نەبیستراو جوڵە و سەما ناوخۆییەکەیان ئاراستە بکات.

دوای مردنی لەناکاوی کیمیا هەڕەشەی دەرەکی زەقتر بوویەوە. پاسەوانێکمان لای دەرگای قوتابخانەکە دانا و داوامان لێکرد دەرگاکە دابخات و نەیکاتەوە تا لە ناسنامەی میوانەکە دڵنیا نەبێ. لیستێکم بەناوی ئەو کەسانە ئامادە کرد کە دەتوانێ بەبێ نیگەرانی ڕێگەی هاتنەژوورەوەیان پێ بدات. ئایا ناوی عەلا، کوڕەکەی ڕۆمی لەریزی ئەوانەدا دابنێم کە ڕێگەیان پێدەدرێ بچنە ماڵی باوکی، کە تێیدا دەژی. ئاخۆ ڕێگەی پێبدەم بێت و بچێ لەکاتێکدا سەرجەم شایيعەکان ئاماژە بە ناپاکیکردن و نیەتە تاوانکارییەکانی دەکەن؟

نەموێرا لەمبارەوە پرسیار لە سوڵتان وەلەد بکەم، دوای ڕاڕاییەکی زۆر لیستێکم دا بە پاسەوانەکە کە ناوی عەلای تێدا نەبوو. هەستم دەکرد بەدوور خستنەوەی لە ماڵەکەی بەشێوەیەکی ژیرانە ڕەفتار دەکەم. وا دیار بوو لەنێوان تووڕەیی کوڕە لاسارەکە و سەرکێشیکردنیدا بەکوشتنی شەمس هەڵبژاردنەکە روون و ئاشکرایە.

لە پێنجی شەوالی ساڵی ٦٤٥ کۆچی (٥ی کانونی یەکەمی ١٢٤٧) دوای دوو هەفتە لە مردنی کیمیا، ڕۆمی چاوەڕوانی گەیشتنی شەمس و هەندێ لە ژەنیارانی دەکرد بۆ سازکردنی کۆڕێکی بیستن لەژێر بنمیچی ماڵەکەیدا. دوای حەوت مانگ لە خۆحەشاردان لە ماڵی سەلاح، ڕۆمی بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی و ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی هەڕەشەکە ببێتەوە.

لەدەرەوە بەفر دەباری، لەهەمان ئەو ژوورەدا چاوەڕوانی شەمسمان دەکرد کە ڕۆمی تێیدا پاش دیداری یەکەمیان پێشوازی لە دەروێشە پیرەکە کرد. سەرەنجام گەیشت، خۆشحاڵ بوو بەو پرسیارانەی پاسەوانەکە لێی کرد.

"ئەو پاسەوانەی نامناسێ لێی پرسیم: تۆ کێی؟ منیش وەڵامم دایەوە ئەمە پرسیارێکی سەختە. پێویستە بیری لێبکەمەوە. کاتێ دەرگاکەی نەکردەوە جارێکیتر لەدەرگاکەم دا و بەم شێوەیە خۆم ناسان: "جارێکیان پیاوێکی گرنگ ژیا ناوی ئادەم بوو. من یەکێك لە کوڕەکانی ئەوم".

زریانوس کە لەپشت دەرگاکە وەستابوو دەنگی شەمسی ناسیەوە، هەروەها بینی پاسەوانەکە لە لیستەکە ورد دەبێتەوە و بەدوای ناوی "ئادەم"دا دەگەڕێ. بۆ ئەوەی کات بەفیڕۆ نەدەم زریانوس بائاماژەیەکی سەری داوای لە پاسەوانەکە کرد دەرگاکە بۆ "کوڕەکەی ئادەم" بکاتەوە کە ناوی لە لیستە باوەڕپێکراوەکەدا نەبوو.

شەمس بەختەوەر دیار بوو. دەربڕینەکانی ڕوومەتی، کە هەمیشە چرچ و مۆنە بەکراوە هاتنە پێش چاو. عەباکەی دانەکەند وەك هەموومان چاوەڕوانمان دەکرد. قسەی لەبارەی سەرماوە دەکرد. ڕۆمی بانگی کرد تا لە تەنیشتی دابنیشێ، هەردوو دەستی گرت و فووی پێدا دەکردن تا گەرمیان بکاتەوە. پاشان هەمان پرسیاری پاسەوانەکەی دووبارە کردەوە و لێی پرسی "تۆ کێی؟".

شەمس وەڵامی نەدایەوە.

مەولانا پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، "ئایا تۆ نوری جەوهەری خودایت؟ ئایا تۆ خودایت؟"

بێدەنگیەکی زیاتر بەدوای ئەوەدا هات.

ئەنجا رۆمی ئەم دوو بەیتەی وت:

**بەئاگا و ئاسوودە بووم،**

**بەیەك حەسیری نوێژ،**

**تۆ منت کردە گەمەیەك،**

**منداڵان لەسەر جادە گەمەی پێئەکەن.**

بێدەنگیی زیاتر، وەك ئەوەی هەردوو پیاو خۆیان بۆ ئەنجامدانی یارییەك ئامادە بکەن، پاشان رۆمی لێی پرسی "ئایا تۆ جادوگەری؟". شەمس زەردەخەنەیەکی کرد، زەردەخەنەکەی گۆڕا بۆ پێکەنین. لەکۆتاییدا وتی "ئەمە مەسەلەی جادوو نیە. بابەتەکە پەیوەندی بە ئامادەکردنی خوداوە هەیە".

شتەکان گۆڕان، لەگەڵ "تۆ کێی"دا شتێکی نوێ لەدایك بوو. ئەوە یەکەم جارە، لەوکاتەوە دەروێشە پیرەکە پێش ئەوەی لەهۆش خۆی بچێ لەپڕ لەبەردەم ئەو هێسترەی مەولانا سواری بوو پەیدا بوو، رۆمی لێی بپرسێ: تۆ کێی؟ عودژەنەکە لە رێکخستنی عودەکەی وەستا، زریانوس لە لاساییکردنەوەی پاسەوانەکە کاتێ لە لیستەکەیدا بەدوای ناوی کوڕەکەی ئادەمدا دەگەڕا، وەستا. سوڵتان وەلەد کە ماوەیەك بوو جگە لە سکەی ئاڵتون بیری لە هیچ شتێکیدی نەدەکردەوە، لەناو ژوورەکەیدا سەرسمی دا و خەریك بوو بکەوێتە سەر زەوی. من، حوسام، قەڵەم و کاغەزەکەمم دەرهێنا تا بەوردی ئەو قسە تەمومژاوییانە تۆمار بکەم کە شەمسی تەورێزی دەیانڵێ. ئەو کێیە؟ ئایا سەرەنجام پێمان دەڵێ؟.

بەدەنگێکی زۆر ئاسایی، ئەو دەنگەی عادەتەن کاڵەکی نەگەییو و کەبابی سووتاو و پەرداخی شەربەتی پێ رەفز دەکرێ وتی: "خۆشنووسێك سێ شێوازی لە نووسیندا بەکار ئەهێنا: یەکەم بۆ ئەو روون و بۆ ئەوانیتر ناڕوون، دووەمیان بۆ خۆی و ئەوانیتر روون، سێیەمیشیان نە بۆ خۆی و نە بۆ ئەوانیدی روون نەبوو. شێوەی سێیەمی نووسینەکە منم".

رۆمی پرسیارێکیتری لێ کرد، "چۆن ئەم پەیوەندییە لەنێوانماندا دروست بوو؟.

بۆ ئەوەی هیچ وشەیەك لە وەڵامەکەی شەمسم لەدەست نەچێ، شانم لە شانی توند کرد.

"لەو رۆژەدا من چی بووم؟ پیاوێکی لاوازی تەپیو، تۆیش لاوێکی جەستە قایم. هیچ شتێکم تێدا نەبوو بکرێ سەرنجی تۆ بۆ لام رابکێشێ. بەڵام تۆ بەنەرمی تەماشات کردم و پڕ بووی لە خۆشەویستیی من".

رۆمی بەردەوام بوو، "چیت لە من دەویست؟".

"من و سێ کەسیدی رازی بووین بەوەی تۆ پێتداین".

ئەو سێ کەسەیدی کێن؟" زریانوس پرسی.

"سەلاح و حوسام و بەها".

گوێم لەناوی خۆم بوو، ناوی نەگبەتی خۆم لە دەمی شەمس دەردەچێ، لەنێو کۆمەڵێ پیاودا کە بەشایستە دادەنرێن، من هەڵبژێردرام. بەدیدی من لەنێو هەر سێکماندا، بەها –ناوێکیدیکەی سوڵتان وەلەد بوو– تاکە کەس بوو شیاوی ئەوە بێ رۆژێ لە رۆژان جێگەی مەولانا بگرێتەوە. بەڵام کێ دەتوانێ لافی ئەوە لێبدات دەکرێ جێی شەمس بگرێتەوە؟ مەیلی ئاشکرای رۆمی بۆ سەلاح کەماڵەکەی هەڵبژارد و راسپاردنی کە بۆ هەموو دیدارەکان بانگ بکرێ، زیادەڕەویکردنی بەردەوام لە ناسینیدا جێی پرسیار بوو،.. چۆن دەکرێ زێڕنگەرێك جێگەی شەمس بگرێتەوە؟

ئەوە مەحاڵ بوو، شەمسیش ئەوەی دەزانی. بەڵام ئەوەیشی دەزانی رۆژێ لە رۆژان، جا زوو بێ یان درەنگ، سەلاح جێگەی دەگرێتەوە. هەروەها بەزمانی پیاوانی لەجۆری خۆی قسەی لەگەڵ دەکرد.

"کیانی من بەردی عیرفانیەکانە کە رێگەی پێ نادرێ لەگەڵ مسدا لێك بخشێ. لەبوونی مندا مس ئەگۆڕێ بۆ ئاڵتون. هەمان شت بەسەر کەمالی بەردی عیرفانیەکانیشدا جێبەجێ دەبێ".

بەڵام بەلای منەوە، بەدڵنیاییەوە لەسەر پێگەم لە قوتابخەکەدا ئیرەییم زۆر پێ دەبرێ.

کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات کە لە بازنەی یەکەمی موریداندا هەمان پلە لە هۆگری لەگەڵ شەمس هەیە، لەرێی ئەو هۆگرییەوە سەرنجی رۆمیم راکێشا. بەدانانی ناوم لە سیانەیەکدا کە کوڕی مەولانای تێدایە، هەروەها ئەو پیاوەی، بەپێی زانیاریی ئێمە، لەبەر هەندێ هۆ کە هێشتا بەلای ئێمەوە نەزانراون رۆمی کەمەندکێش کردوە، شەمس لە مانەوە بە نەناسراوی رزگاری کردم.

ئەو سەرنجەی ئەو دای، چرایەکی پرشنگدارە لە تاریکیدا بەرەو لای من راکێشرا، لەپڕ لەبەردەم دیدەی ئەوانیتردا ئاشکرای کردم، کە گوزارشتی لە سەرسامی دەکرد. ئێستا لەرێی چاوەکانی شەمسەوە بینیمیان. چیتر ئەو لاوە بەهێز و بەسوودە نەبووم، کە بۆ یارمەتیدانی هەر کەس داوای یارمەتی بکردایە، ئامادە بووم. ئەو پیاوەی بەشێوەیەکی غەریزی باز دەدات تا کتێبێك بێنێ قوتابیەك لەکاتی قسەکردندا باسی دەکات و لە لاکەیتری ماڵەکەدا دەمێنێتەوە. ئەو پیاوەی روودەکاتە مۆبەق بۆ ئامادەکردنی کەبابی گۆشت و مریشك تا ناوی لەگەڵ گۆشتە برژاوەکان و لە زاری سەردانیکەراندا بڵاو بێتەوە. ئەو پیاوەی رادەکات بۆ کۆگا بۆ کڕینی فەردە برنج و بتڵی پڕ لە گوڵاو و نەعنا و لەسەرەوە بەو شتانەوە کڕیونی دەگەڕێتەوە، هەر بۆ ئەوەی هەمووان بزانن چەند بەسوودە. ئەو پیاوەی بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە گۆڕستان و فرمێسك بەڕوومەتیدا دێتە خوارەوە، بەمەبەستی ئەنجامدانی نوێژی مردوو لای گۆڕی کەسێك پێش کەمێك مرد، تەنانەت پێش گەیشتنی تازیەبارانیش. ئەو پیاوەی لە ژوورەکەیدا وێنەی ئەو دوو مامۆستایە دەردەکەوێ کە دەزانرێ بسەردانیان بەم نزیکانەیە. ئەو پیاوەی شێوەی ریشی گۆڕی تا لە ریشی ئەم و ئەو بچێ.

ئەوەی خۆی بە شاڵێك داپۆشی کە لە دەشتاییە بەرزەکانی ناوەڕاستی ئێرانەوە هاوردە کرابوو، تا لەو سۆفییە لاوانەیتر جیا ببێتەوە کە هێشتا هەوڵ دەدەن پێ و باڵە وڵپنەکانی باوکە بەتەمەنەکان بشێلن. ئەو پیاوەی بانگ دەکرێ بۆ لای گەورەکەی، تا بە هێزی باسکەکانی لە دوژمنەکانی بیپارێزێ.

لەبەردەم چراکەی شەمسدا، بووم بە پیاوێك مەدح دەکرا، هەوڵی بەدەستهێنانی دۆستایەتی دەدرا. لەبەردەم چراکەی شەمسدا پرچم، ریشم، گرێی مێزەرەکەم بووەتە جێی رێزگرتن. لەبەردەم چراکەی شەمسدا هاتمە جیهان.

تەماشای ئەو پیاوەم کرد کە بەبێ دوودڵی خۆی بەراورد کرد بە "کەمالی بەردی عارفان"، من کە ئەوم باش دەناسی، سەرباری توانای بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو سەختیانەی دێنە رێگەی، ئازارێکی زەقم بەسیمایەوە دەبینی کە پێشبینی دابڕانی دەکرد، ئەو پیاوەی پێشبینی خەمێکی تاڵی کرد.

شەمس لەتەنیشت رۆمی دانیشتبوو، ئەگەرچی هەموو شتێك تێیدا هێمای بۆ رۆیشتن و دیارنەمان دەکرد. دوای چەند ساڵێك، کاتێ پرسیارم لە مەولانا کرد کە لە زمانی سۆفیەتدا دەستەواژەی "غەیبەی شەمس" چی دەگەیەنێ، پێداگری کرد کە ئەوە پێویستە، جەوهەرییە، بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە ویستبێتی روو بدات، بەڵام من دەتوانم بڵێم گۆڕانی راستەقینە پاش "فڕین"ی شەمس، راستەوخۆ پاش ئەو، بەسەریدا هات.

دوای چەند ساڵێك، کاتێ داوام لە مەولانا کرد باسی گۆڕانکارییە ناوخۆییەکانی بکات، وتی: "من کاڵ بووم، کولام و بوومە قەقنەس".

ئەمرۆ دەتوانم بڵێم "کولاندن"ەکە پاش دیدارەکەی شەمس رووی دا و "بەقەقنەسبوون"یش پاش ئۆغرکردنی. هەروەها دەتوانم ببینم چۆن چۆنی دەکرێ حیکایەتی "سێ پەپولەکە" کە عەتار گێڕایەوە لە هەمان کەسدا بەرجەستە ببێ، چۆن چۆنی دەکرێ شیعر ببێتە ئەزموونێکی مرۆڤانەی راستەقینە. سێ وێستگە یەکەمەکەی رۆمی لە گەڕانەکانی پەپولەیەك دەچێ کە فڕی تا بەدەوری مۆمێك لە قەڵایەکی دووردا بسورێتەوە، تا لە ماهیەتی ئاگر تێبگات. گەڕانەکەی دەرفەتی بۆ دەڕەخسێنێ هەست بە گەرمیی گڕ بکات. مەولانا مەبەستی ئەمە بوو کاتێ باسی لە "کاڵ"بوونی دەکرد. ئێمە دەزانین گڕ هەیە، بەڵام پارێزگاری لە مەسافەیەکی ماقووڵ دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆ ماڵ.

بەڵام پەپولەی دووەمیان ئەوەیان بوو کە "کولێنرا" پاش ئەوەی زۆر لە مۆمەکە نزیك کەوتەوە و یەکێك لە دوو باڵەکەی بەجێهێشت بسووتێ. ئەم زیاتر لە پەپولەی یەکەم لە ئاگرەوە فێر بوو. بەڵام پاش گەڕانەوەی سروشتی راستەقینەی گڕ بەردەوام لێی هەڵدەهات. من وای دەبینم رۆمی پاش دیدارەکەی لەگەڵ شەمس چووە ئەم حاڵەتە. چیتر ئەو زانا ئایینییە نەبوو کە لە قوتابخانەکانی لەبەرکردنی قورئاندا دەرس بڵێتەوە، یەکێك لە باڵەکانی گڕی گرت و دەستی بەسەما کرد.

هەرچی "بەقەقنەسبوون"ـە لوتکەی گەشتی نەگەڕانەوە بوو بۆ پەپولەی سێیەم، کە بە گڕی ئاگرەکە مەست بوو و لە عیشقدا نوقم بوو، لەبەرئەوە خۆی فڕێدایە ناو بڵێسەی ئاگرەکە و لەگەڵی یەکیگرت. عەتار دەڵێ تەنیا ئەم پەپولە بەقەقنەسبووە ماهیەتی ئاگری زانی، بەڵام نەیتوانی کەسی لێ ئاگەدار بکات.

ڕۆمیش دووچاری گڕ بوو، بەڵام جیاواز لە پەپولەکە، سووتا و گڕی گرت و ئاگر قووتیدا و زیاتر لە پەنجا هەزار بەیتە شیعری بۆ بەجێهێشتین، کە لەیاد ناکرێن.

لەکاتێکدا گوێم لەو وشانە دەگرت کە لەو ژوورەی ڕۆمی و شەمس بەتەنیا بۆ ماوەی چل ڕۆژ تێیدا مانەوە، دەوتران، هەستم لە ساردیی شەو رادەگرت. لە دەرەوە، دەنگی هەندێ هەنگاو دەبیستران کە بەفرەکەیان پیس دەکرد، هەندێ دەستی چڵکن کە یەکێکیان ئەویترپانی دەپرواند، پەنجەپێی خەنەکراو، نوکی چەقۆی تیژ کە بە سمتی ئێسك دەرپەڕیودا شۆڕ دەبنەوە. لە دەرەوە هەندێ کەسی نەناس بەردەوام بەدەوری ماڵی مەولانادا دەسوڕانەوە.

ئەمە ئەوەیە دەتوانم سەبارەت بەو دووایین ساتە پێتان بڵێم. لە دەرەوەوە، دەنگێکی کپ ئەو گفتوگۆ درێژەی بڕی کە سەبارەت بە سروشتی شەمس لەنێوانماندا لەئارادا بوو. بانگی کرد بچێتە دەرەوە، و وتی: "شەمسی تەورێزی، ئایا تۆ هاتی؟".

شەمس دەستبەجێ هەستایە سەرپێ بەبێ ئەوەی دەرفەتمان بداتێ هانی بدەین بمێنێتەوە، نەهێڵین کارێك بکات چاك ناکرێتەوە. بەدەنگێکی هێمن بە ڕۆمی وت: "ئەوان بانگم دەکەن تا بمکوژن".

کەس وشەیەکی لە زار نەهاتە دەر. چیتر بەبەشێك لە وتوێژێك نەماینەوە کە لە بێستانی مەلائیکەدا بەڕێوە دەچوو. ئێمە تاکە شایەت بووین لەسەر ئەم سووتانە خۆویستانەیە. دوای بێدەنگیەکی درێژ ڕۆمی وتی: "أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ" (ئافراندن و فەرمان هەر بۆ ئەوە، پیرۆزی بۆ پەروەردگاری جیهانییان) و چەند وشەیەکیتری زیاد کرد کە دووایین شت بوو شەمس لەو پیاوەی بیست، کە پێغەمبەران خەمبارن بەوەی هاوسەردەمیان نەبووە: "يفعل الله ما يشاء ويحكم مايريد". (خودا چی بیەوێ دەیکات و هەر بڕیارێك بیەوێ دەیدات).

ئەوە ئەو وشانە بوو کە ڕۆمی بەوردی گوتنی.

"يفعل الله ما يشاء ويحكم مايريد".

بەبێ چاوەڕوانی، بەبێ سەرنجدانێکی کۆتایی لەو پیاوەی ئەوی گۆڕی، ئەو بەرەی ئەوی پێگەیاند، بەبێ هیچ ئاماژە یان وشەیەکی ماڵئاوایی، شەمس عەباکەی ڕێك کرد –دوای ئەوە زریانوس دەڵێ، لەو ساتەدا گوێی لە فڕفڕی باڵ بووە– و نەعلەکەی لەپێ کرد، تەپلەکەی کە ئێمە ناومان نابوو تاجەکەی لەسەر نا و ڕۆیشت.

له دەرەوە، حەوت پیاوی چەکدار بۆ کوشتنی چاوەڕوانیان دەکرد. له ناوخۆدا، دەنگدانەوەی هاواری شەمس بیسترا. له دەرەوە چەند تکێك خوێن بینرا.

له ناوخۆ، بەقەقنەسبوون دەستی پێکرد.

# پەرتت دەکەم

نە شەمس و نە ئەوانەی لە دەرەوەی قوتابخانەکە دەستدرێژییان کردە سەری هیچ ئاسەوارێکیان نەبوو. من و زریانوس چووینە دەرەوە و سەرتاسەری قۆنیە گەڕاین بەدوایدا. لە مەیخانە و خان و گەرماوەکان، لە ژوورە گەرمکراوەکانی بازاڕدا تا دڵنیا بین ئاخۆ لەژیاندا ماوە یان نا. ئەو پیاوەی لەپڕ لەژیانمان دەرچوو. "ئەوە باشترین شتە کە بیکەی". شەمس کە هەمیشە سەرمای بوو، هەر دەبێ لەو ماڵانەدا بدۆزرێتەوە کە دەکرێ بۆ خۆپاراستن لە بەفر و سەرما پەنایان بۆ بدات. گەڕانەکەمان بێسوود بوو. بڵێی بۆ کوێ چووبێ؟ هەندێ وتیان "باڵندەکە فڕی"، هەندێکیتر وتیان گوایە مردوە و بینویانە بکوژەکانی لاشەکەی فڕێ دەدەنە بیرێك لە دەرەوەی شار، هەندێکیتر –بەڵام ئەمانە درەنگوەخت هاتن– وتیان گوایە شەمس باوکی ئەفسانەیی منداڵێکە کە لە خوێنی ئەوە. هەندێ لانەواز لە شەوی کوشتنەکەیدا بردویانە.

نە رۆژی دوای ئەوە نە لە رۆژانی داهاتووش، هیچ هەواڵێك لەبارەیەوە نەبوو.

مەولانا داوای کرد ئامێری رەبابە عەرەبییە شێوە چوارگۆشەییەکە دەستکاری بکرێ و بکرێتە شەشگۆشە، هەروەها روونیکردەوە ئەو شەش گۆشەیە شەش گۆشەکەی دنیا دەنوێنن، هەروەها ئەلیفی ژێکە ئولفەتگرتنی رۆحەکان دەنوێنێ لە گەڵ پیتی ئەلیف لە وشەی (الله)دا، بەڵام سەرباری گۆڕینی ئامێرەکەی کەس نەیتوانی لە دۆزینەوەی شەمسدا یارمەتی بدات.

سەرجەم گۆڕستانەکانم بشکنی، تەنانەت ئەو گۆڕستانانەی کۆرپەلە و زیندانییە شێواوەکان و زندیقانیان تێدا دەشارێتەوە، بەڵام هیچ شتێکم نەدۆزیەوە بەڵگە بێ لەسەر بوونی لاشەی شەمس. زریانوسیش سەرجەم بیرەکانی بشکنی، تەنانەت من خۆم بینیم جەستە بەهێزەکەی لە سەتڵێکی بچوکدا گرمەچۆڵە دەکات و دادەبەزێتە بیرێك، پاشان بەهەندێ ئێسکی قەلەڕەش و هەندێ پارچە ئاڵتونەوە هاتە دەرەوە، کە بۆ سەردەمێکیتر دەگەڕێنەوە.

هەرچی سوڵتان وەلەدە کە لە گەڕانی بەدوای وەڵامی پرسیارەکەیدا "بۆچی وازی لێهێنا بڕوات؟" خەو نەچووە چاوی. ئەو تاکە کەس بوو دەیتوانی گرفتاری باوکی ببینێ کاتێ شەمس پێش بیست و دوو مانگ بۆ یەکەم جار رۆیشت، هەروەها ئەو تاکە کەسە بینی هەردوو خۆشەویست دەبنە یەکێك کاتێ مەولانا و شەمس جارێکیتر یەکیان گرتەوە. جارێك و دوو جار و سێ جار، بگرە هەزار جار پرسیاری لە باوکی کرد. بەبێ دەنگی، لە خەوەکانیدا، لە نوێژەکانیدا، لەکاتی بەرۆژووبوونیدا، لەکاتی خەڵوەتەکانیدا، لێی دەپرسی.

رۆژێکیان ئەم تەفسیرەی خوارەوەی پێگەیشت:

"لە سەرەتای پەیوەندیەکەماندا، شەمس خووی گرتبوو بەوەی داوام لێبکات کائینێك لەو کائیناتەی بۆ ئاشکرا بکەم کە پەردەی عیشقەکەم دەیانشارێتەوە. نیگام بۆ هات: "مادام تۆ سووری لەسەر ئەوە،

کەواتە وەك سوپاسگوزاری لە بەرامبەر ئەوەدا چیم پێشکەش ئەکەی؟" شەمس وەلامی دایەوە "سەرم". کاتێ یەکگرتنی بەو جوانییە پێشکەش کرا، هەروەها کاتێ سەرەنجام توانی سوودەکانی هاوڕێیەتیەکەی بچنێتەوە نیعمەتەکانی بەچاوی خۆی بینی، ئیتر لەتوانیدا نەبووپاشەکشە لە قسەکەی بکات. بەلێنێکی لەسەر خۆی فەرز کردبوو، بەلێنی دا سەری خۆی لەبەرامبەر نهێنیی مندا پێشکەش بکات. ئەوە قەدەری ئیلاهی بوو کە بڕیاری ئەوەی دا، من هیچ رۆلێکم تێیدا نەبوو".

بەلام رۆلێکی گەورەی تێیدا هەبوو. هەموومان ئەوە دەزانین، نەخاسمە من.

تا ئەمڕۆ دەتوانم وێنای تینوێتیی شەمس لە حزروی مەولانادا بکەم. ئەم پیاوە ئۆقیانوسە ئاوی پێشکەش بەپیاوە تینوەکە دەکرد، بەلام دلۆپ دلۆپ، هێشتا دەتوانم شپرزی، پاشان خۆبەدەستەوەدان، پاشان جارێکیتر نیگەرانیی شەمس لە ئاست ساردی خۆشەویستیی مەولانا ببینم، ئەو خۆشەویستەی لەسەرەتاوە تا کۆتایی شوێن شەمس، تەنانەت سێبەرەکەیشی کەوت ، هەروەها ئەوەی ئێستا وا هەندێ نیشانەی رۆشن دەردەکەون ئاماژەن بۆ نزیکیی وادەی فیراق. جارێکیان مەولانام بینی لەپڕ شەمسی بەجێهێشت تا موریدێکیتر ببینێ کە پێش کەمێك لە دیمەشقەوە گەیشتبوو. پێشتر هەرگیز کاری وای نەکردوە. بەلام ئەوە دووبارە دەبێتەوە. شەمس کە زۆر شارەزای قۆنیەیە، بە پشتتێکراوی لە ناوەڕاستی شاردا، هەستکردنە وردەکەی بەئاراستەکان لەدەست دا، هەروەها بەبێ ئامانج ملی رێگەی دەگرتەبەر، تا لەکۆتاییدا بڕیاری دا نەگەڕێتەوە بۆ مالّ.

جارێکیتر گەورەمم بینی بازاڕی پێستەچییانی بەجێ دەهێشت و کۆمەلێ دەستنوسی بەرگکراوی هەلگرتبوو. لەپڕ بوخچەی کتێبەکانی دا بەشەمس و بازیدایە سەر گالیسکەیەك کە گەنجێکی تورکی لێی دەخوڕی، بەتەنیا تێی تەقاند رۆیشت و شەمسی بەتەنیا و پەرێشان بەجێهێشت، سەرما –هەمیشە سەرما– بەهۆی هەلگرتنی کتێبەکان و پشت تێکردنی هاوڕێکەیەوە بیهاڕێ. تەواوی گەشتەکەم بەپێ بەدوایدا بڕی و پەرۆش بووم بۆ ئەوەی نەمبینێ. حەپەساو دیار بوو. دەبێ بەخۆی وتبێ رۆمی ئیتر بەو خۆشەویستەی رۆژانی یەکەم نەماوە. دەبێ شپرزەییەکەی شاردبێتەوە، چونکە وەك هەموو ئەویندارەکان دەیزانی ئەو بەدرێژایی رێگەکە چەندە زیاتر پێویستی پێی هەبێ، کەمتر پێی دەگەیشت.

من، حوسام لەکاتێکدا ئەم وشانە دەنووسم دەزانم مەولانا چەند رۆژێك پێش ون یان کوژران یان رفاندنی شەمس قەسیدەیەکی نووسیوە، کە وشەکانی لەئایندەدا ئازار و خوێنێك لەدلّی هەلاتوەکەدا دروست دەکات بەئازارتر و گەورەتر لە خەنجەری دوژمنانی.

لە مالّی سەلاح، لەناو ئەو ژوورەی هۆگربوونی هەردوو خۆشەویستی بەدرێژایی حەوت مانگ لەئامێز گرتبوو، زریانوس ئامادەی یەکێك لە دواین دیدارەکانیان بوو.

شەمس کە هەمیشە سەر رووت دەردەکەوت لەبەر دەقگرتنی بەداپۆشینی سەری بەقوماش و شاڵی نەگونجاو، قسەی لەگەڵ کۆمەڵێکی بچوك خەڵك دەکرد و دەیوت: "هەر کەس بمناسێ. خۆشی ئەوێم. هەر کەس خۆشی بوێم. بەدوامدا ئەگەڕێ. هەر کەس بەدوامدا بگەڕێ، هەر کەس بمدۆزێتەوە کەسیتر جگە لە من هەڵنابژێرێ".

ئەو کاتە وامان بەخەیاڵدا هات مەولانا خۆشەویستێکیدی جگە لە شەمس هەڵنابژێرێ، هەروەها بوونی دڵنیای لە تەنیشتی مایەی ڕەزامەندی بوو. بەڵام بە بێزارکردنی بۆ ڕۆیشتن، بەدڵنیاییەوە ڕۆمی —لەڕێی ونبوون و لەدەستدانەوە— بوونی فرە و بەردەوامی خۆشەویستی تاقی دەکردەوە. لەبەر ئەوەی ئێمە لەباتی ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە هەمانە، بیر لەوە دەکەینەوە کە نیمانە. ڕۆمی لەبەر توانای بۆ زاڵبوون بەسەر هەستکردن بەڕیسوایی لە خۆشەویستیدا گرەوەکەی بردەوە، بەڕادەیەك خۆی بوو بە شەمسی تەورێزی، بەڕادەیەك وتی سەد هەزار شەمس بە هەر موویەك لە مووەکانیدا شۆڕ دەبنەوە، تا ڕادەی سڕینەوەی کەسایەتیەکەی، لەبەر ئەوە دیوانە شیعرەکەی ناونا "دیوانی شەمسی تەورێزی".

دەتوانین لە ژیانماندا لەسەر ڕووی شتەکان بمێنینەوە تەنها کەفی هەستەکانمان ببینین، هەروەها دەتوانین، کەمێك بۆ ناشەفافیەت لە ناخماندا دابەزین. ئەمە ئەوەیە من بەهەموو لەخۆبوردەییەکەوە هەوڵ دەدەم بیکەم.

لە سەرسوڕمانی زۆرمان بۆ ئەو فیراقەی لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا رووی دا، نەخاسمە پرسیارە بێزارکەرەکە، کە بۆچی مەولانا ڕێگەی بەو پیاوەی خۆشیدەویست دا بڕوات، ئیتر دەمانتوانی وەك هەر کەسێکیتر وەڵام بدەینەوە و بەسادەیی بڵێین: "لەبەر هەستکردنی بەوەڕسی وازی لێهێنا بڕوات، چونکە شەمس سیحری خۆی بەرامبەری لەدەست دابوو، لەبەرئەوەی خۆشەویستی ڕۆمی بەبەردەوام ڕووی لە شوێنێکیتر دەکرد".

ئەم هۆیانە پڕوپوچن. وای دەبینم هۆیتر هەن کە لەماوەی ئەو ساڵانەدا هەوڵم داوە دیارییان بکەم، لەسەروویانەوە ئەوەیە: مەولانا کولێنرا. ئامادە بووە. شاعیرێکی مەزنی تێدا لەدایك بووە، خۆی هەستی بەوە دەکرد. ئەم ئاوێنە خۆشەویستە، ئەو نەفسەیدی، لەوانەیە ڕێگەی کرانەوە و چرۆکردنی لێبگرن.

زۆر یەك هەبوو. ڕۆمی نەیدەتوانی ڕووبەڕووی جەوهەر و ماهیەتی شەمس ببێتەوە تا شەمس خۆی ون نەبێ، سەرەڕای زەحمەتیی دابڕانیان ئەوە زەرور بوو. لەبەرامبەر هێزەکانی دۆستایەتی و سەرسامی نێوانیان کە ڕۆژانە، بەشێوەیەکی ڕۆتینی ڕوو لەزیاد، دووبارە دەبووەوە، هەندێ هێزیتر توانیان بێنە ناو گۆڕەپانەکەوە ،کە لە لێڵترین بەشەکانی کیانیەوە سەرچاوەیان گرتبوو، ئەو هێزانەی داوایان دەکرد ڕۆمی سەرەنجام ببێتە حەقیقەتی خۆی.

بۆ ئەوەی ئەوە روو بدات، دەبوو شەمس بڕوات، تەنانەت ئەگەر ئەوە بشبێتە مایەی ئەو نەهامەتیەی پیاوانی ئاسایی بەهەموو هێزی خۆیان رەتیدەکەنەوە، کەسانی وەك ئێمە کە بێتوانان لە خوێندنەوەی سەرجەم نهێنیەکانی ئازار، پێویستە خۆشەویستی لەبەردەم پێویستی گەورەتردا بچەمێتەوە نرخەکەی هەرچی بێ. مەولانا رۆژێك پێویستی بەبوونی خۆی هەبوو، بەڵام ئێستا پێویستی بەغیابی هەیە.

لەو رۆژەدا سێ چوا مورید چاوەڕوانی وەڵامی مەولانایان دەکرد لەسەر سەرنجەکەی شەمس کە وتی: "هەر کەس بمدۆزێتەوە، کەسیتر جگە لە من هەڵنابژێرێ " رۆمی چەند بەیتێکی لەبەر گوت کە بەڕوونی پێشبینی دابڕان، تێکشکان، لەدەستدان، سەرسوڕان، نەزانی و قوربانیدان بەو پیاوەیان دەکرد کە زاتی کرد خۆشەویستی خۆی بۆ رابگەیەنێ:

خۆشەویستیت بۆ من نغرۆی کردی و
ناردیتی بۆ دوور،
باش گوێ بگرە.
من ئاگادارت دەکەمەوە، نەکەی هیچ بنیات بنێی،
چونکە من تێکت ئەشکێنم،
باش گوێ بگرە.

ئەگەر دوو سەد ماڵ بنیات بنێی،
وەك هەنگ و مێروله،
بێ خانە و لانەت ئەکەم،
بێکەسایەتیت ئەکەم،
باش گوێ بگرە.

ئەگەر تۆ چیای قاف بی
وەك ئاشێك بەخێرایی ئەسوڕێتەوە،
وات لێئەکەم بچیتە ناو ئاشەکە،
وات لێئەکەم بخولێیتەوە،
باش گوێ بگرە.

ئەگەر ئەفلاتون یان لوقمان بی،

بەزانست و شکۆت،

بەخێرایی بەیەك نیگا،

ئەتکەمە نەزانێك،

باش گوێ بگرە.

تۆ وەك باڵندەیەكی مردووی،

لەناو دەستما، کاتێ راوم کردی،

من، راوچیم، ئەتکەمە،

خۆراکێك بۆ باڵندەکانیدی،

باش گوێ بگرە.

نێزەی ئاسنەکان نانیشنە،

سەر قورگت، یان بریندارت بکەن،

لەگەڵ ئەوەشدا من ئەتکەمە قوربانی،

وەك کە ئیسماعیل کرایە قوربانی،

باش گوێ بگرە.

وەك زریانوس وتی شەمس دوای ئەوەی "بەباشی گوێی گرت" بۆ قەسیدەکە، ئەم بەیتەی زیاد کرد: "ئەگەر حەقیقەت بڵێم، هەموو شار بەپیر و لاوەوە، بە م–یشەوە دەرمئەکەن"، پاشان بێدەنگ بوو.

کێ لەو باشتر دەتوانێ تەقدیری وێرانەی خۆشەویستی بکات.

تائەمڕۆ هێشتا یەقینم هەیە شەمس، کاتێ لەسەر داوای پیلانگێڕە چەکدارەکان کە لە دەرەوە چاوەڕوانی بوون، حەوشەی قوتابخانەکەی بەجێهێشت، باوەڕی وابوو نێزە ئاسنینەکانیان ناتوانن بیگەنێ، چونکە تەنانەت پێش هێرشی بکوژان کە هەمیشە دوژمنی بوون، ئەو دەستەی سەروەختێکی زۆر خۆشی دەویست و یاری بۆ دەکرد، هاوشێوەی ئیسماعیل کردیە قوربانی.

لەڕۆژانی دواتردا هیچ هەواڵێکمان دەست نەکەوت.

لە رۆژی چلەمیندا رۆمی مێزەرە سپییەکەی داکەند و لە جێگەیدا مێزەرەیەکی رەنگ دوکەڵی لەسەر کرد و فەرمانی کرد عەبایەکی لە قوماشی خەتخەتی بۆ بدوورن، کە لە یەمەن و هیندەوە هێنراوە. وەك ئاماژە بۆ دابڕانەکە بەدرێژایی ژیانی ئەو عەبایەی لەبەر کرد. کاتێ لە ٥ی جمادی دوایی ساڵی ٦٧٢ی کۆچی (١٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٢٧٣ز) دوا هەناسەی دا من خۆم لەبەریم داکەند.

بەدرێژایی بیست و شەش ساڵ ئەو عەبا خەتخەتینە کە بەبەردوامی بەیەکێکیتری وەك خۆی دەیگۆڕی، غیابی شەمسی بیر دەخستەوە.

تا ئەمڕۆ و پاش تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی مەولانادا، هەر کات ئەو هێڵانە لەسەر ڕەفەی قوماش فرۆشەکان یان لە پارچە جلیتردا دەبینم دڵم لە سینگمدا بەتوندی لێدەدا، بگرە لە پارچەیەکدا ڕاستەوخۆ لەسەروو ناوکم و لەژێر قەفەسەی سنگمدا، هەستکردنێك کە لە گرژبوونێکی ماسولکەیی، یان لە برینێکی کولاوە، دەچێ.

دوای ڕۆیشتنی شەمس، مەولانا ئیتر بەشێوەیەکی جیاواز بۆ هەموو شتێکی دەڕوانی. کەوتە ئەوەی بایەخی بەهەر کەسێك دەدا، چ لە دوورەوە بووبێ یان لەنزیکەوە، پەیوەندی لەگەڵ شەمس هەبووبێ. بانگی خەڵکانێکی ئاسایی دەکرد، بازرگان و نووسەر و فەرمانبەران، پێشتر نەیدەناسین، بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان سەروساختەیان لەگەڵ شەمسی تەورێزی هەبووە، بەوردی هەر وردەکارییەکی سیمایانی دەپشکنی. خۆی حەپەسا کاتێ چرچێك لەسەر لای چەپی ڕووی لای سوچی لێوی چەپی دروست بوو. ئەو چرچەم باش دەناسی، لەبەرئەوەی هەندێ جار لەسەر ڕووی شەمس دەمبینی. چاو و گوێکانی وەك چاو و گوێکانی خۆشەویستە بێسەروشوێنەکەی دەیانبینی و دەیانبیست. دەستبەجێ دەنگی پینەچییەکە لەوسەری شەقامەکە، ئەگەرچی دەنگێکی ئاسایی بوو، بوو بە چاوەزارێك، ئەسەرێك، لەبەرئەوەی مەعبود جارێکیان گوێی لێ گرتبوو.

مەولانا کەوتە سەردانی ئەو شوێنانەی شەمس لە ڕابردوودا سەردانی دەکردن. دوای ماوەیەکی زۆر لای من دانی بەوەدا نا کە دڵی بەتوندی لێی داوە هەرکات بەبەردەم دوکانێکدا تێپەڕیوە کە پێشتر بەیاوەریی شەمس چوونەتە ناوی. گەرماوەکە، شوێنی جێپەسەندی کە بەنزیکەیی هەموو ڕۆژێك لەگەڵ شەمس ڕووی تێدەکرد، بوو بەشوێنی عیبادەت، کە هەزار و هەزار دڵۆپ لە یادەوەرییەوە هەڵدەقوڵێن. کاتێ لەگەڵ شوێنکەوتەکانی کۆدەبوویەوە، وای بەخەیاڵدا دەهات کە شەمس تەماشای دەکات و گوێی بۆ شل دەکات.

لە شەقامیش بەو شێوەیە دەڕۆیشت کە شەمس حەزی دەکرد بەو شێوەیە بچێ. وا خەیاڵی نەدەکرد لەتەنیشتیەوە دەڕوات، بەڵکو لە ناوخۆیدا شاراوە بوو. بەڵێ، لە دیارنەمانی شەمسی تەورێزییەوە، ئیتر بوو بە ماڵ و ئارامگەی. کاتێ ئەو نوکتانەی بیر دەکەوتنەوە کە شەمس دەیگێڕانەوە، ئەو نوکتانەی لە ڕابردوودا نەیاندەهێنایە پێکەنین، لەدڵەوە پێدەکەنێ، بگرە ئێمەیشی ناچار دەکرد پێبکەنین، وەك ئەو نوکتەیەی لەسەر "لابردنی تاڵە مووە سپیەکانی ناو ریشی من". سەرتاشەکە بێزار بوو لە ژمارەی مووە سپیەکان کە پەلاماری ریشی مشتەریەکەیان دابوو، لەبەرئەوە هەمووی تاشی، پاشان تۆپەڵە مووەکەی پیشان دا و پێی وت: "یەلا هەڵبژێرە کامەیانت دەوێ، کاتم نیە".

مەولانا پێکەنی کاتێ لە ریشی من و ریشی هاوڕێکانم ورد بوویەوە و نوکتەکەی دووبارە کردەوە، پاشان باسی نوکتەیەکیتری کرد، تێیدا وەزیرێك بەپیاوێك دەڵێ: "ئەو هەزار دینارە بگرە و یەك وشە لەبارەی ئەوەوە نەڵێیت کە ئێستا بیستت". پیاوەکەیش هەزار دینارەکەی وەرگرت و رووی کرە هەموو شوێنەکان و دەیوت: "ئاگاتان لە تڕەکەی وەزیر هەیە؟ من وام لێکرد بیکەنێ". بەزۆری ئەم نوکتەیەی بۆ دەستەی جیاواز لە خەڵك دووبارە دەکردەوە، هەر جارێکیش بیوتایە، تڕی دەکەند و پێدەکەنی.

هەندێ جار، بەهەمان گاڵتەجاڕی کە لە دەمی شەمسی بیستبوو وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، لەبەرئەوە کاتێ کەسێك سەبارەت بە مەیلەکانی دەروێشێکی گەنج پرسیاری لێکرد، وەڵامی دایەوە و وشە بەوشەی ئەوەی خۆشەویستەکەی رابردووی وتی، دووبارە کردەوە:

"کەسێك پرسی ئاخۆ پیاوەکە توانای هەیە هیچ بکات، وەڵام درایەوە "بەڵێ باوکی دەیتوانی"، پیاوەکە جارێکیتر وتی "من دەربارەی باوکی پرسیارت لێ ناکەم، دەربارەی ئەو لێت دەپرسم"، وەڵام ئەوە بوو "باوکی زۆر بەتوانا بوو"، پیاوەکە پێداگری کرد "ئایا گوێت لێیە چیت لێ دەپرسم؟" وەڵامی دایەوە "ئەوە تۆی نابیستی، من باش دەبیستم، خۆ کەڕ نیم"، ئیتر دەروێشە گەنجەکەمان نەدی". هەروەها لە کۆبوونەوەیەکدا کە والی بۆ رێزنان لە هەندێ سۆفی سازی کردبوو، دوای تەواوبوونی نانخواردن، مەولانا نوکتەیەکیتری لە نوکتەکانی شەمس گێڕایەوە:

"حەوت سۆفی پێکەوە لە ماڵێکدا کۆبوونەوە و چەندین رۆژی دوای یەك رۆژوویان گرت، خانەخوێکەیان بێزار بوو کە بینی دەستیان لە خواردنی ماڵەکەی نەداوە و لێی پرسین چۆن دەتوانێ وایان لێ بکات بخۆن. یەکێکیان پێی وت: برێکی پێویست خواردنمان بۆ بێنە، ئەنجا گەورە و بچوك ماڵ چۆڵ بکەن و رێگە مەدە کەس بێتە ژوورەوە، تۆیش ماڵەکە چۆڵ بکە. خانەخوێکە بەشی بیست کەس خواردنی ئامادە کرد، ئەنجا ژنەکان و منداڵەکانی لە ماڵ دەرکرد، هەروەها فزولیەکانی دەرکرد، بەڵام سەرەڕای گفتدانی بەوەی ماڵەکە بەجێ دێڵێ، خۆی لە ماڵەوە مایەوە و لە کونێکەوە چاودێریی میوانەکانی دەکرد، بینی سۆفیەکان کە وایاندەزانی بەتەنیان، بەهەڵپە خواردنەکەیان دەخوارد، بەڕادەیەك یەکێکیان دوای ئەوەی تووشی گرژبوونی گەدەی بوو لەسەر زەوی تەخت بوو، شەش سۆفیەکەیتر لە ورگئاخنین بەردەوام بوون. دوای کاتژمێرێك سۆفیەکیتریان کەوت و لەسەر زەوی تەخت بوو و جوڵەی لێ بڕا. بەو شێوەیە تا کەسی شەشەم بەردەوام بوو. خاوەن ماڵەکە بێزار بوو و هاتە ژوورەوە و وای پیشان دا هەر ئێستا لە دەرەوە گەیشتووە و پرسیاری لەوەیان کرد کە زیندوو بوو، ئایا خواردنەکە بەشی کرد؟ ئەویش وەڵامی دایەوە، نەخێر، بەشی نەکرد، ئەگینا منیشت بەمردوویی دەبینی".

کاتێ ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە، مەولانا خوێسەی لە میوانەکانی والی دەکرد کە بەهەڵپەوە گۆشتی گوێرەکەی بەسرکە مزرکراو و گۆشتی مامزی بە سیر و شویت خۆشکراویان دەخوارد. کەوتنە قوڕنیسکە

لێدان و بۆنیان دەدایەوە. لەبەرئەوەی بەئاشکرا دیار بوو مەبەست لە چیرۆکەکە ئەوان بوون، کەوتنە پێکەنین.

لە بۆنەیەکیتردا، کاتێ مەولانا بینی نای ژەنە ئازیزەکەی گەیشت، بردمیە لاوە و بۆی باس کردم کە چۆن دوای ئەوەی ئەو پیاوە شەمسی سەبارەت بەپەیوەندیی تەموژاویی نێوان ئەو دووانە پرسیارباران کردوە، شەمس پێی وتوە پەیوەندیەکەیان لە پەیوەندیی نێوان نای و ژەنیارەکەی دەچێ. کاتێ چووم دەفتەرەکەم بێنم تا ئەو قسانە تۆمار بکەم کە دواجار پەیوەندیەکەیان روناك دەکاتەوە، وەستاندمی و وتی: "پاش وتنی ئەوە، شەمس ترپێکی کەند، پاشان نایەکەی گرت و لەپشتی نزیك کردەوە و وتی: ئەگەر دەتوانی باشتر لەوە بژەنی، بیگرە و بیژەنە"، کاتێ ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە، نای–ەکەی باشترین ژەنیاری شارەکەی گرت و لاسایی ئەو جوڵەیەی شەمسی تەورێزی کردەوە.

ئێستا ئەو لەکوێیە؟ لە چ خانێك لادەدا؟ زەردەخەنە نامۆکەی بۆ کێ دەکات؟ کێ بە خوری دایدەپۆشێ کاتێ کزەی سەرمای زستان لە پەنجەرەکانەوە دزە دەکاتەوە ژوورەوە؟ لە شەودا، کێ وەڵامی دەدایەوە کاتێ بەسستی رادەکشێ؟

وەڵام نەبوو. هیچ هەواڵێکی شەمس نیە. هیچ نیە جگە لە بۆشایی.

هەندێ لە دۆستان هەوڵیان دا لەڕێی یادخستنەوەی هەندێ لە بەدرەفتی و سنوورشکێنیی شەمسەوە رۆمی هێور بکەنەوە، بەڵام بێسود بوو. بەلای ئەوانەوە مەولانا تەنیا یەك وەڵامی هەبوو ئەویش ئەوە بوو: "ئاماژەی خۆشەویستی ئەوەیە عەیبە وەك کارامەیی دیار بێ". زریانوس جەسارەتی بەخەرج دا و پرسی: "ئایا ناکرێ پیاوێکی عاشقی عەراف بێ؟" رۆمی دوای چەند ساتێك بێدەنگی وتی: "ناتوانین رێگە لەم جۆرە ئەگەرە بگرین".

من حوسام کاتێ زانیم شەمس بۆ هەتاهەتایە بزر بوو، دەستم کرد بە تۆمارکردنی هەر شتێك کە بیرم بێ وتوێتی. دەستم کرد بە نووسینی ئەو دەستەواژانەی بەلامەوە تەمومژاوی دیار بوون، بەئومێدی ئەوەی رۆژێ لە رۆژان مەولانا یارمەتیم بدات بۆ کردنەوەی تەلیسمەکانیان، زۆری نەبرد کۆمەڵێ وشەی سەیر لە دەفتەرەکەدا کۆبوونەوە، لەوانە بۆ نموونە: "پیاوانی خودا، برسین". دوای بیست ساڵ رۆمی بەدەستی خۆی ئەوەیشی زیاد کرد "شەمس بەدەستی ئەو موسڵمانانە زۆر خەمبار بووە. بە برسێتییان کوشتیان و بە ئیشتیایان لووشیان دا، لەکاتێکدا پیاوانی خودا هەر برسی بوون".

مرۆڤ تێیدا دەتوانێ، بەبێ تەرتیب، ئەوە بخوێنێتەوە، "یەکێکیان پرسی: ئایا واجبە نوێژ بکەین؟ یەکێکیتر وەڵامی دایەوە بەڵێ. یەکەمیان وتی: "ئاهـ"، دووەم وتی: ئەگەر ئەو ئاهەم بدەیتێ نوێژی تەمەنی خۆمت دەدەمێ".

یان "ئەم پەڵەیە لە ناوەوەیە، ١ ئاوێك دەكرێ لاییبات"، یان "با ئێستا بچین بۆ شوێنە بەدناوەكان و ئەوانە ببینین كە ڕێگەیان هەڵە كردوە، خوا ئەو ئافرەتانەی خەلق كردوە، ئەوە باش بێ یان خراپ، با لەواندا چاودێریی خۆمان بكەین"، یان "لە چەقدابە و بەتەنیابە".

ڕۆژێكیان لەكاتێكدا سەبارەت بەو خەڵوەتانەی لە بیابانەكان یان لە چیادا ئەنجام دەدران، پرسیاری لێكرا، شەمس وتی خۆی بەشەخسی زاهیدێك دەناسێ لە خەڵوەتدا لە چیایەك دەژیا. بەبۆچوونی شەمس ئەو پیاوە مرۆڤ نەبوو بەڵكو "شاخاوی" بوو. هەروەها وتی، ئەگەر مرۆڤ بووایە زیرەك ئەبوو، خەیاڵاوی ئەبوو، شیاوی ناسینی خوا ئەبوو. ئەی دەبێ پیاوێكی لەو شێوەیە لەسەر شاخێك چی بكات؟ پەیوەندی لەنێوان پیاو و بەردا چییە؟ پاشان قسەكەی بەوە تەواو كرد وتی: "لە چەقدابە و بەتەنیابە".

تا ئەمرۆ دەتوانم بێنمە بەرچاو كە بەدەم لاساییكردنەوەوە بەجوڵەی دەستەكانی، چیرۆكی ئەو شازادە نێرەموكەی دەگێڕایەوە كە پاشای باوكی پیاوێكی بەهێز و توند و ئازای بۆ هێنا تا فێری بكات، پاشا داوای لەو پیاوە كرد كوڕەكەی فێری هونەرەكانی شەڕكردن بكات، بەو شێوەیە ڕەفتار بكات كە نێرینەكان ڕەفتار دەكەن، هەروەها سیفەتەكانی پیاوەتی و پاڵەوانێتی فێر بكات، بەڵام فێركردنەكەی بەفیڕۆ چوو، چونكە سەرباری ئەو هەموو مەشقانەی پێی كرد تا ماسولكەكانی برەو پێبدات، شازادەكە وەك منداڵ هەر خەریكی گەمەكردن بە بوكڵە بوو. ڕۆژێكیان كاتێ گەورەی ئەمیندارانی كۆشك هاتنی پاشای بۆ سەردانی كوڕەكەی و مامۆستای ڕاگەیاند، شازادە دەستبەجێ سەری بە ملپێچێك داپۆشی و بوكەڵەیەكی گرت بەدەستیەوە. مامۆستاكەیش مێزەرەكەی داكەند و وەك كوڕەكە سەری داپۆشی و پەیكەرێكی بچوكی گرت بەدەستیەوە و لەتەنیشت قوتابیەكەی وەستا. كاتێ پاشا هات و پرسی مامۆستاكە لەكوێیە، پیاوەكەی دەموچاوی پیشان دا، لەبەردەم پاشادا كڕنوشی برد و بەلاساییكردنەوەی دەنگی ئافرەت وتی "من لێرەم، خاتوونی مامۆستا لێرەیە".

كاتێ شەمس ئەم چیرۆكەی گێڕایەوە، بە ملپێچێك كە هەمیشە —لەبەر سەرما، هەمیشە سەرما— لەسەر شانی دادەنا سەری داپۆشی و بەكزی لاسایی دەنگی كچێكی بچوكی كردەوە و كەوتە هاتن و چوون بەلەنجەولار وەك ئافرەت. ژمارەیەكی كەم لە ئێمە لەو ساتانەدا لەوێ بووین، كاتێ بەزیرەكیەكەی تەقلەی بە سەرجەم قۆشمەچییانی وڵات لێ دا.

كاتێ مەولانا لەڕێی زریانوسەوە بە بوونی ئەو دەفتەرەی زانی كە بەقسەكانی شەمس پڕم دەكردەوە، بانگی كردم، بگرە فەرمانی پێكردم هەموو ڕۆژێ بەشێكی بۆ بخوێنمەوە، بەوە توانیم زیاتر لێی نزیك ببمەوە، لەكاتێكدا من تا ئەوكاتە پێم وابوو بەلایەوە تەنیا لە موردێكی لاوی بەكەڵك و دارا زیاتر نیم و ئیمیتیازی ئەوەم هەیە شەمس تێبینیی بوونمی كردوە.

بەم شێوەیە بەیانی هەموو ڕۆژێك ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانی دەفتەرەکەم دەخستە بن هەنگڵم و دەچووم بۆ ژووری نووستنەکەی ڕۆمی و بەبێ دیاریکردن بۆم دەخوێندەوە، وەك پێشبینی قسەکانی "خۆحەشارداوەکە" —ئەمەی دەویست— و لەچاویدا گەورە بووم، هەروەها هەندێ نامەم بۆ گواستەوە کە لە تێگەیشتن یاخی بوون. من دەنگی عەڕافەکە بووم.

لەگەڵ ئەوەی مەولانا لە زۆربەی ئەو کاتانەدا ئامادە بووە کە شەمس ئەو قسانەی کردوون و بیستبوونی، هەستم کرد بەهاندانم بۆ خوێندنەوەیان، دوای چەند ساڵێك، دەیویست ڕێگە بە گوێکانی بدات جارێکیتر ئەو قسانە بەدەنگێکیتر ببیستن. بەئەنقەست هەوڵی دەدا لە وەهمەکانی هەڵبێ و لەڕێی کائینێکی ئێستاوە بەهەمان غیاب بگات.

هەرگیز خوێندنەوە یەکەمەکەم یاد ناچێ: بەشێوەیەکی سەیر چاوی تێبڕیبووم، ئاخۆ چی لە دەمم دەردەچێ؟ قسەکانی شەمس، ئەو پیاوەی بە "خۆشەویست بەبێ زەمان" ناوی دەبرد، دواجار لێخۆشبوونی پیشان دەدات؟ لەو ڕۆژەدا پاش ئەوەی سڵاوە باوەکانمان لەیەکتر کرد، دەفتەرەکەم لە باخەڵی ناوەوەی پاڵتۆکەم دەرهێنا و دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەوەی ناونیشانی "وتارەکانی شەمسی تەورێزی"م لێ نابوو. مەولانا لەپڕ لای پێکانمدا چەمایەوە، بەوە دەیویست ڕێز لەو قسە ئاساییانە بنێ، کە بەهۆی غیابیەوە، بوونە وشەی نایاب و پیرۆز.

سەربارى دوودڵیەکەی، یارمەتی مەولانام دا بۆ هەستانەوە و دەفتەرەکەم پێشکەش کرد تا چۆنی دەوێ بیخوێنێتەوە. چاوەکانی داخست، دەستی لە دەفتەرەکە دا و بۆنی کرد وەك ئەوەی بۆنی شەمس خۆی بکات و بەبێ دیاریکردن لە لاپەڕەیەکدا کردیەوە، پاشان بەبێ ئەوەی یەك وشە بڵێ بۆی گێڕامەوە. هەستم کرد بەهەموو ئەندامەکانی گوێم بۆ شل دەکات.

خوێندمەوە: "شێخێك بە دەروێشێکی وت: خەلیفە سەمای بیستنی قەدەغە کردوە، دەستبەجێ دەروێشەکە هەستی بە گرژبوونێك لە سینگیدا کرد و نەخۆش کەوت. بانگی پزیشك کرا و پشکنینی لێدانی دڵی کرد، بەڵام نەیزانی نەخۆشیەکەی چییە. کاتێ دەروێشەکە مرد، پزیشکەکە گۆڕی دەروێشەکەی هەڵدایەوە و تەرمەکەی دەرهێنا و سینگی لەت کرد و "گرژی"یەکەی لێ دەرهێنا کە لە پارچەیەك بەردی ئەقیق دەچوو. ماوەیەك دوای ئەوەی هەژاری پەرێشانی کرد، ناچار بوو پارچە ئەقیقەکە بفرۆشێ، بەم شێوەیە گرژییەکە دەست بەدەست ڕۆیشت تا گەیشتە خەلیفە، ئەویش موسیلەیەکی لێ دروست کرد و کردیە پەنجەی. ڕۆژێکیان خۆی بۆ سەمای بیستن ئامادە دەکرد، خەلیفە هەستی کرد چاکەتەکەی خوێنی پێوەیە، سەیری جەستەی کرد، بەڵام هیچ برینێکی نەدی، هەستی لە موسیلەکە ڕاگرت بینی ژوورەکە گەرم دادێ، گڕ دەگرێ، خوێنی لێ دەڕژێ. دەستبەجێ دەستاودەست بەدوای فرۆشیارە لەدوای یەکەکانی موستیلەکەدا چوو تا گەیشتە پزیشکەکە، کە چیرۆکی دەروێشەکەی بۆ گێڕایەوە".

ئەو چیرۆکەی تێیدا مردن وەك پارچە بەردێك دەگوێزێتەوە، زۆر کاری لە مەولانا کرد، دەستبەجێ بانگی ئەو ژەنیارە خۆشەویستەکەی و کوڕەکەی و ژمارەیەك لەو موریدانەی بەردەوام لە چواردەورین کرد بۆ سازکردنی کۆڕێکی بیستن. بەئومێدی ئەوەی سەماکە هەندێ باری خەم و پەژارەی باوکی سووك بکات سوڵتان وەلەد هانی هەمووانی دا گەرم و گوڕ و بەجۆش بن. هەرچی لەتوانامان‌دا بوو کردمان بەڵام بێسوود بوو، چونکە هەموو شت شەمس، ونبوونی شەمسی بیر دەخستەوە: زەوی ماچ کرد و دەستەواژە باوەکانی دووبارە دەکردەوە، گوێی لە دەنگی نای گرت، پاڵتۆکەی داکەند وەك ئاماژە بۆ ئەوین و سەرمەستی، جا خولایەوە و خولایەوە و خولایەوە، کۆتا پیتی "هوو"ی دەدرکاند و گوێی لە ئێمە دەگرت کە "هووووووووووو"ی کۆتاییمان دەوتەوە، تا هەناسەمان دەپچڕا. بەبێ ئەو جوڵەکان چەندن، خولانەوەکان چەندن، دەنگەکان چەندن، ژمارەی هەستەکان بەبێ ئەو چەندن. وەك دواتر بۆی باس کردم، یەکەم سەمای بیستنی بیر کەوتەوە کاتێ بۆ یەکەمین جار دەستی هەردووکیان بەر یەکتر کەوتن و هۆگری یەکتر بوون، یەکترییان خۆشویست، کشانەوە، یەکێکیان بەدوای ئەویتریاندا گەڕا، ئەمیان ئەویانی دۆزیەوە.
بەڵێ، بیری کەوتەوە چۆن دەستی هەردووکیانم ماچ کرد. سەمای بیستنێکیتریشی بیر کەوتەوە.
لەسەرەتای دیدارەکەیاندا، تێیدا ئامادەبووانیان لەبیر کرد، حیرەت، پلار، دزە روانین و روانینە فزولیەکان، لەبەرئەوە هەردوو تەنیا گوێڕایەڵیی یەك گەورەیان دەکرد: سەرسوڕمانی هەردووکیان لە دۆزینەوەی هەریەکەیان بۆ ئەویتریان لە سەماکردندا. هێشتا هەردووك چاوەڕانیان دەکرد. تا ئەوکاتە، شەمس لە هەموو ئەو شارانەی "بەسەریاندا فڕی" بەدوای رۆمیدا دەگەڕا، رۆمی هەستی بەلاوازی کرد بەئومێدی ئەوەی هەردووك بسووتێن. بەیەك گەیشتن و جازبیەتە دووسەرەکەیان یاسا ئەخلاقیەکان و ئەتەکێت و ئوسوڵە خێزانی و کۆمەڵایەتیەکانی دڕاند، تا هەریەکەیان ببێتە بەشێك لە سیستەمی ئەویتر، سیستەمێکی گەردوونی، ئەستێرەیی، فەوزەوی، سیستەمێك رێسا خەمناکەکانی، لە هەر بارێکدا، پۆلبەندییە رێژەییەکانی مرۆڤیان تێپەڕاند.

مەولانا دەستی بەسەما کرد، دەخولایەوە، ملی رادەوەشاند، پاشان کە هەستی کرد هەموو جوڵەیەك لە جوڵەکانی داوای شەمس دەکات، لەجێی خۆیدا وەستا و داوای لە ژەنیارەکان کرد ژەنین رابگرن و بچنە دەرەوە. وەختێکیدی پێی وتم: "سەمای بیستن بەبێ شەمس وەك نوێژکردنە بەبێ خوا"، بەڵام خوێندنەوەم بۆ "وتارەکانی شەمس" بەردەوام بوو. رۆژی دواتر جارێکیتر هاتم بۆ لای مەولانا، دەفتەرەکە لە بنباڵم بوو، جارێکیتر ئامادە بوو بۆ بیستنی و نواندنی دڵسۆزی بۆ قسە کۆنەکان کە خۆشەویستەکەی رۆژێ لە رۆژان کردوونی و ئێستا رۆمی تەفسیرێکی جیاوازیان بۆ دەکات. ئەو وشانەی بەبەریئی دەهاتنە بەرچاو، وایان لێهاتبوو ناڕوون دەردەکەوتن و لەناکاو دەبوو خۆی بەتەنها تەفسیریان بکات. گفتوگۆکانیانی بیر دەکەوتەوە و لەبەر رۆشناییەکی نوێدا شی دەکردنەوە. تەنیا بۆ من، جارێکیان چەند گوتەزایەکی

شەمسی بیر کەوتنوە کە جەختیان لەوە دەکرد باڵندە هەرگیز لە هەمان شوێندا دایناکوتێ، هەروەها بەبەختەوەریەوە واز لە هاوڕێکانی و لە خێزانەکەی دێنێ، لەبەرئەوەی کرۆکی ژیانێکیتر ، لەژێر ئاسمانەکانی هەندێ جیهانیتردا، دەدۆزێتەوە. بەڵێ، مەولانا یەکێك لە تەجەلیاتە بەراییەکانی شەمسی بیر کەوتەوە، کاتێ دەروێشە غەریبەکە بەڕوونی پێی وت دەبوو چەند جارێك ژینگەکەی بگۆڕێ و دەستوپێوەندێکی نوێ بناسێ. ئەوکاتە رۆمی هیچ بایەخێکی بەوە نەدا کە وتی. لەوکاتەدا رۆمی دەیپرسی چۆن دەکرێ شەمسی خاوەن هەڵسوکەوتی لەناکاو و چاوەڕواننەکراو ببێتە مایەی رقی دەستوپێوەندەکەی، بەڕادەیەك ناچار بە رۆیشتنی بکەن، چۆن دەکرێ مرۆۋ جوانی و دەهشەتی راستەقینە رەت بکاتەوە؟

رۆیشتنەکەی شەمس ئێستا ئەو نهێنییە کۆنانەی ئاشکرا کرد. خۆشەویستی یان بەگەورەزانین یان گرگرتن نەبوونە رێگر لە ئاشکراکردنی سروشتی راستەقینەی پیرە پیاوەکە بەسەرما و هەڵنان بۆ رۆیشتنی، هەروەها رێگرییان لێ نەکرد لە زرمە هەڵساندن لە دەرگاکە بەدووایدا و ونبوونی. بگرە ئەو بوو رێگەی گرت لەوەی عادەتەکان گەلاڵە ببن، "ئەو یەکەی گوێی خۆشەویست ناتوانێ ئیحتیوای بکات"، "مەزنترین مرواری لە دەریاوە بوو"، "پاشای جنۆکە کە سیحر کاری تێ ناکات"، "ئەو سووتێنەری سووتاوە، هەژێنەری هەژاوە، شکێنەری شکاوە، کۆچکەری کۆچلێکراوە".

لە ٥ی شەوالی ساڵی ٦٤٥ کۆچی، لە هەمان ساتدا کە شەمس لەسەر ئەو داوایەی لە دەرەوە هات تا خۆی بکاتە قوربانی، دەرگای ژوورەکەی تێپەڕاند و بەدەم دووبارەکردنەوەی وشەکانی دوایی رۆمییەوە "يفعل الله ما يشاو ويحكم مايريد" ئەسڵی ئەو فیراقەمان بینی کە شاعیرێکی دروست کرد. شەمس ژیانی خۆی بەشیعرێك گۆڕیەوە کرد کە لە ئایندەدا لەدایك دەبێ. میزاجە بێبارەکەی پاڵی پێوەنا بڕوات و دڵی لەنێوان: حەقیقەتی ئاڵوگۆڕ لە خۆشەویستی —بناغەی شادومانیەکی مسۆگەر— و ئەو گومانەی کە بەدڵنیاییەوە پاساوە بۆ کۆچ و کەوتنە رێ بەرەو لەوڕگەکە، نرکە نرکی بوو.

دانی ئەم بڕیارەی بەشێك لە ساتێکی نەخایاند: هەستێ و ژوورەکە بەجێ بێڵێ و دەرگاکە لەپشتیەوە دابخات لەسەر دوودڵیی رۆمی لە دانوستاندن، گۆڕینەوە (مقايضة)، فرۆشتنی لەبەرانبەر ئەوەی لە باشترین حاڵدا بێ. ئەگەر کەسێکیدی بووایە جگە لە شەمس دەمایەوە، گۆڕانەکەی، گۆشەگیربوونیان، یەکەمین سەماکردن، هەروەها ئەو شەوانەی بیر رۆمی دەخستەوە کە بە وجودی خۆشەویست، بەترس، بەگاڵتەوگەپ و تێوەگلانی هاوبەش، بەخێرایی تێپەڕین.

هەر کەسێکیتر بووایە جگە لە شەمس بۆ ماوەیەك لەپێناو رزگارکردنی ژیانیدا ون دەبوو و هەوڵی دەدا بۆ درێژکردنەوەی گوریسی خۆشەویست ماوەکە درێژ بکاتەوە. بەڵام شەمس ئەو پیاویترە نەبوو.

تا ئەمڕۆ، باوەڕم وایە ئەو فیراقە بەلای شەمسەوە حەتمی دیار بوو، چونکە ئەو باڵندەیە، باڵندەیش هەرگیز لەسەر لقێك نامێنێتەوە. من دڵنیام ئەو دەزانیٚ ڕۆمی بەتوندی بەرەو ئەو شتە کاتی، بەسەرچوو، تەمومژاوی و دوابڕاوەی تێیدا کێش بووە. باڵندە ناکریٚ خاوەخاو بکات، بەڵام دەتوانریٚ بگیریٚ، لەبارێکدا وەك پێشتر بەتوندی بەرۆمیەوە بەسترابوو، چۆن شەمس ڕێگەی بەخۆی دا بڕوات؟ خوا نەبیٚ کەس نازانیٚ.

من کە شەرەفی یاوەریکردنی شەمسم بەشاردا پیٚ بڕا، دەتوانم بڵێم لە کۆتاییدا لۆمەی ڕۆمی دەکرد لەسەر بێموبالاتی و جیابوونەوەکەی لێی. وەك هەر خۆشەویستێك، ئاخۆ لە رکابەرێك دەترسا؟ ئایا گومانی هەبوو لەوەی بتوانیٚ دڵی خۆشەویستیەکەی بەدەست بێنێتەوە؟ نازانم. هەستکردنی بەوەی خۆشەویستیەکەی کاڵ بووەتەوە و وای لێهاتووە لە شێوەی ئاماژەیەکدا دەردەکەویٚ: پێویستە بڕوات. بەڵیٚ، پێم وایە شەمس تەنانەت بەبیٚ گاڵتەپێکردنیشی لەلایەن تاوانبارەکان و بانگکردنی بۆ دەرەوە و بینینیان، هەر دەڕۆیشت. هەروەها دەتوانم بڵێم ئەم پاڵنەرە عادییانە لەوانەیە تەفسیری هەڵسوکەوتەکانی بکەن، ئەمە جگە لە هەستەکانی غیرە و پەشیمانی و خۆبەگەورەزانی، کە ئەوانە گرنگترین هۆکان بوون کە بوونە مایەی جیابوونەوەیان. جگە لە ڕۆمی کەس هۆ ڕاستەقینەکە نازانیٚ. ڕۆمی تاکە کەس بوو کە بینی، بەڵیٚ توانای بەهێزی شەمسی بینی بۆ گۆڕینی مامۆستا بۆ عاشق و گۆڕینی عاشق بۆ شاعیر. تا ئەوکاتە ئەرکەکەی بەتەواوی جێبەجیٚ نەبووبوو، چونکە بۆ ئەوەی شاعیر لەدایك بیٚ، پێویستە خەم و ئازار، جیابوونەوە، هاوار و فرمێسك هەبن. بەلای ڕۆمیەوە ئەو فرمێسکە بریتییە لە فرمێسکی فیراق (دابڕان). بەڵیٚ، کاتیٚ شەمس دەرگاکەی بەدووایدا توند داخست، ئەگەرچی هەستی بە سووکایەتی و کۆچ دەکرد، ڕێگەی لەبەردەم تاڵترین ئەزموونەکاندا خۆش کرد، کە فیراقە. کاتیٚ شەمس وەستا تا بڕوات، وام خەیاڵ کرد لەسەر ڕوومەتە زەردە بەردەوام تەزیوەکەی تروسکایی هەستکردنێك بە ڕەزامەندیم بینی، فیراقەکە بەرهەمدار بوو، ڕۆمی تۆوەکەی وەشاند، لەو جۆرەیش نەبوو کە چاوەڕوان دەکات ئەوەی وەشاندویەتی بیچنێتەوە.

دوای ساڵانێك، پاش ئەوەی لە خوێندنەوە و جارێکیتر خوێندنەوەی کارەکانی عەتار و سەنائی هیلاك بووم، داوام لە مەولانا کرد شیعر بهۆنێتەوە. ئەویش مێزەرەکەی شل کرد و هەژدە بەیتی لە یەکەم قەسیدەی مەسنەوی پیشان دام کە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

**گوێم لەم نای-یەیە سکاڵا ئەکا،**

**لەو کاتەوە لە دارستان هەڵکەنراوم،**

**پیاوان و ژنان لە دەنگی ناڵینمدا هاوار ئەکەن،**

**سینگێکم ئەویٚ دابڕان شڕو وڕی بکا**

**تا ئازارەکانی دابڕان بدرکێنم**

پێش ئەوەی نای بەتاڵ بێ، پێویستە لە دارستان بکرێتەوە، پێویستە ناسۆر بچێژێ.

دەزانم شاعیر لەو ساتەدا لە مەولانادا لەدایك بوو کە شەمس پێکانی نایە دەرگای قوتابخانەکە و دوای ئەوە هەرگیز ناگەڕێتەوە. ئۆغرکردنێکی بەرهەمدار بوو، ئەرکەکە جێبەجێ کرا، هەندێ دەڵێن ئەوە ئەرکێکی ئیلاهییە.

ئاخۆ دەیزانی ئۆغرکردنەکەی دەبێتە مایەی لەدایکبوونی رۆمیی شاعیر؟ من بڕوای تەواوم بەمە هەیە، چەندین کەسیتریش هەمان قەناعەتیان هەیە. شیعر لە ئازاری خۆشەویستەوە لەدایك بوو. ئەی ناسۆریەکانی ئەو چی؟ کێ کەزیەکانی پرچی دەکاتەوە، کێ دەستەکانی گەرم دەکاتەوە، کێ خەمی ئەوە دەخوات نینۆکەکانی بە مرەکەب پیس نەبن؟ چی لەو "پشکۆ"یە دێ کە مەولانای ئاگر دا؟ نازانرێ بۆ کوێ چوو. سەرجەم هەوڵەکانمان بۆ دۆزینەوەی بەفیڕۆ چوون، سەرجەم دۆستان و موریدان کە بۆ گەڕان بەشوێنیدا دەرچووبوون بە شەکەتی و شپرزی گەڕانەوە. ئایا مەولانا ئاواتی گەڕانەوەی دەخواست؟ پێم وایە بەڵێ. بەڵام بەشێکی، ئەو بەشەی بەسەر فریشتەکاندا فڕی، داوای پشوویەك، فیراقێکی دەکرد، وەك فیراقی نای لە دارستان، وەك جیابوونەوەی گەڵا لە درەخت، جیابوونەوەی پەپولە لە قۆزاخەکەی، باران لە تەم. داوای جیاکردنەوەی دوو جەستەی دەکرد کە رۆژێکیان بە کێشکردنێکی موگناتیسی یەکیان گرت، کە تەفسیرکردنی مەحاڵە.

ئەگەر نای لە دارستان جیا نەبێتەوە، چۆن دەکرێ دەنگی مۆسیقا بەرز بێتەوە؟

من حوسام، لەگەڵمدا سوڵتان وەلەد و زریانوس و کەسانیتریش، قەناعەتمان وایە رۆیشتنی شەمس شیعری تەنیا لە رۆمیدا زیندوو نەکردەوە بەڵکو لە شەمسیشدا. نازانم چۆن دەتوانم تەفسیری ئەوە بکەم. شەمس لە عەقڵماندا ئامادە نەبوو وەك پاش رۆیشتنی ئامادەیە. لە نوێژی بەیانییەوە تا نوێژی عیشا، ناوی وەك چاوەزارێکی حەتمی ناوی دەگەڕایەوە و دووبارە دەکرایەوە، بەتێپەڕبوونی کات وردە وردە دەمانبینی رۆمی بووەتە شەمس.

بەئومێدی ئەوەی بیرکردنەوەی لە شەمس دوور بخەمەوە، رۆژێکیان خولکم کرد بۆ باخەکەم لە فالیراس لەگەڵ ئەو گرووپە بچوکە کەسانەی بووبوونە بازنە راستەوخۆکەی. بەباخەکەدا گەڕا، هەندێ بەری لێ کردەوە، پاشان لە قەراغی جۆگەلەکەدا وەستا و هەردوو قاچی شەرواڵەکەی هەڵکرد، نەعلەکانی داکەند و پێکانی لە ئاوەکەدا نوقم کرد. هاوەڵان لەسەر زەوییەکە لە دەوری ئەڵقەیان بەست. خێرا کەوتە باسکردنی شەمس. وا راهاتبووین رۆمی تا بیتوانیایە و چەندە بیتوانیایە تەنیا باسی شەمسی دەکرد. یەکێك لە موریدە دڵسۆزەکان کە لە گەشتێکی درێژ گەڕابوویەوە و بەداخ بوو شەمسی نەناسیوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. گەورەمان بە سەدایەك کە لە کتوپڕی خاڵی نەبوو لێی پرسی:

"بۆچی ئاهی حەسرەت هەڵئەکێشیێ؟ چ حەسرەتێکە؟ حەسرەت بۆ چی هەڵئەکێشی؟ لە کێ حەسرەت هەڵئەکێشی؟ چ پێویست بەو ئاه هەڵکێشانە ئەکات لەنێوانماندا؟

موریدە پەشۆکاوەکە وتی: "رەنگە حەسرەتەکە لە حەقیقەتەکەوە هەڵبقوڵێ، کە من بۆم نەکرا سوود لە بوونی روناکیبەخشی شەمس ببینم".

دوای بێدەنگیەکی درێژ رۆمی وتی: "راستە تۆ شەمست نەدیوە، من سوێندت بۆ ئەخۆم بە رۆحی باوکم تۆ ئەو کەسە ئەبینی کە بە هەر موویەك لە مووەکانیدا سەد هەزار شەمسی تەوریزی شۆڕ دەبێتەوە، ئەو کەسەی کە ئاوێتە بووە بە تێگەیشتن لە نهێنیی نهێنیەکانی".

ئەم یەکگرتنە لەنێوان رۆمی و شەمسی تەورێزیدا بەجوانترین شێوە لە شیعرەکانی مەولانادا دەرکەوت کە دەستی بە هۆنینەوەیان کرد و ناوێکی خوازراوی بۆ هەڵبژاردن بریتییە لە "بێدەنگی"، بەڵام قەسیدەکانی تەنیا باسی شەمسیان دەکرد. ناوی شەمس بەبەردەوامی دەدەرکەوت لەکاتێکدا ناوی ئەو، جەلالەدین محەمەد، بەشاراوەیی و بێدەنگی مایەوە، پێش ئەوەی لەکۆتاییدا ببێتە "خامۆش" واتە بێدەنگ. گەورەترین شاعیری فارسی بڕیاری دا بەم شێوەیە خۆی بناسێنێ.

کاتێ لەبارەی ئەو خۆشەویستییە کڵپەسەندووە قسەی دەکرد، وای بەباش دەزانی لەباتی وشەی بێسوود و ناتەواو "بێدەنگیی ماسی" هەڵبژێرێ، وەك دەیوت "چاکەتی وشەم دڕاند، پشتمکردە وتاربێژی، دەستم لە دەربڕین هەڵگرت. وازم لە زمان هێنا". دەیوت:

بێدەنگی، لەبەرئەوەی لە ئێستا بەدواوە،
ئەوانیدی هەرچی بکەن،
هەرگیز ناتوانین،
گونجاندن لەنێوان شیعر و سەروادا بکەین.

یان:

واز لە خوێندنت بێنە
بێدەنگبە، ئارامبە
ئەوە تۆی ئەیخوێنمەوە
وەك کە قورئان ئەخوێنم

یان:

واز لە قسەکردن بێنە، ئەگەر کەسێك وتی:
"بەبێ وشە و دەنگ،

قسه شێوەی نابێ"-

درۆ بکە

ئەو "شێوەی قسەکردن"ـە چی بوو کە لە دەرەوەی وشە و دەنگەکەیەوەیە؟ گەورەترین شاعیران هەوڵ بۆ ئەوە دەدەن، بەڵام کەمێکی کەمیان دەتوانن ئەوە بەدیبێنن، تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورتیش.
غیابی شەمسی وەك بوونێك پێ ڕاگەیاندین، ڕۆمی خۆی وشەکانی "یەکگرتن و دابڕان"ی بەهەمان ئەو ڕۆحە بەکار هێنا، کاتێ باسی خۆشەویستی ئاگرینی دەکرد، ئاماژەی بۆ خۆی دەکرد بەوەی "خامۆشە"، "بێدەنگە". بینیم ئەو ماوەی دابڕانە گرنگ بوو، چونکە هەستمان کرد وەك ماوەی سکپڕی وایە. نەك وەك کۆتایی، بەڵکو وەك سەرەتا. شاعیر لەبەر چاومان لەدایك بوو. سپێدەی هەموو ڕۆژێك نوور و خشتەی خۆی لە وشە لەگەڵ خۆی دەهێنا، کە بەشێوەیەکی سەیر لە کەماڵی ئەو پیاوەدا کە ژیانی پێ بەخشیون تەقدیر کراوە، تا بێدەنگ بێ یان بکوژێتەوە.
دوای ماوەیەکی زۆر، کاتێ شەرەفی ئەوەی پێ بەخشیم ببمە یاوەری کۆتایی، مەولانا دانی پێدانا بۆم و وتی: "لە وڵاتەکەمدا، هیچ پیشەیەك نیە لە پیشەی شاعیر سووکتر بێ. ئەگەر لەوێ بمابام بەپێی حەزە ئانییەکانی ئەوان دەژیام و پابەندی ئەوە دەبووم داوایان لێ دەکردم، خەڵك فێر بکەم، کتێب بنووسم، وتار بدەم و ببمە زاهید —سەرجەم شتە دەرەکیەکان".
بەڵام لەبیری چوو بڵێ ئەگەر لەو وڵاتە بمایەتەوە، ئەگەر شەمسی نەبینیایە، هەرگیز نەدەبووە ڕۆمی.
لە نووسین بەردەوام بووم. ژمارەی لاپەڕەکانی دەفتەری "وتارەکانی شەمس" زیادیان کرد.
هەموو ڕستەیەکم نووسی.. لەو دەفتەرە بەنرخەی بەلای مەولاناوە بووەتە دەمی خۆشەویستەکەی. لەکاتی نووسینیدا لە پیاوان و ئافرەتان، گەورە و خزمەتکار، دۆست و دوژمنم دەپرسی. بەو شێوەیە توانیم بەو قسە کەمانەی شەمس چەند ڕۆژێکی کەم پێش لەوەی بەبەرچاوی خەڵکەوە دووچاری سووکایەتی ببێ، بزانم بەنیازی ڕۆیشتنە.
ماندوو بەهۆی پاشەکشەی بایەخدانی ڕۆمی —نازانین ئایا ئەوە بەئەنقەست یان عەفەوی بووە— دادڕاو لەنێوان هەستکردنی بەتێگەیشتنی کامڵی، تێگەیشتن لە کاردانەوەی، حەزکردن لەوەی هەر یەك لە دوو خۆشەویستەکە لە سەنتەر، لە نووردا بن، تەوژمی با کە ژیان بەبێ ئەوە بەردەوام نابێ. شەمس، ڕۆژێکیان ئەو تەلیسمەی بۆ زریانوس ئاشکرا کرد، تەلیسمێك، ڕۆژێ لە ڕۆژان، وەك ڕێبوارێکی نەناس لە دەرگای دوو عاشق دەدات:
"بەلای هەندێکەوە لەوانەیە گەیشتن (الوصول) ڕزگاربوون بێ، بەڵام بەلای هەندێکیترەوە ڕۆیشتن (الرحیل) ڕزگاربوونە. وریابە و باش سەیرکە بزانە ئایا ڕزگاربوون بەلای تۆوە گەیشتنە یان ڕۆیشتن".

ئێمە وەڵام نازانین. لە ٥ی شەوالی ساڵی ١٦٤٥ی کۆچی شەمسی تەورێزی ڕۆیشت. دەبێ لە دەرگای قوتابخانەکەوە دەرچووبێ تا خۆی پیشانی بکوژەکان بدات، یان بۆ ئەوەی بەدەم خواستەکانی ڕۆمیەوە بچێ —یفعل الله مایشاء ویحکم مایرید— بەڵام ئەوەی کرد لەبەرئەوەی ویستی ئەوە بکات. بەڵێ، شەمسی تەورێزی ویستی ئۆغر بکات. بەلای ئەوەوە رزگاربوون ئۆغرکردن بوو. هەستی بەوە کرد، تەنانەت ئەگەر ئەو بکوژانەیش نەهاتنایە کە کوڕە بچوکەکەی ڕۆمی بەکرێی گرتبوون، تەنانەت ئەگەر مەولانایش تکای لێ بکردایە بمێنێتەوە، شەمسی باڵندە، "هەناسە هەناسە هەناسە" —لێرەدا دەتوانم بەخۆشیەوە نزای خۆشەویست (مەحبوب) بژمێرم "کە لە دڵەوە دێتە ژوورەوە و لە عەقڵەوە دەردەچێ و بەرەو فیراق دەڕوات" و "ئاگردانی ئاو و قوڕ" و "تێکشکێنەری دێڕ و شێواز" و "باشترین شەرابی ساف و دڵۆپێنراو لە نهێنیەکان" و "بڵێسە لە جیهانی نوور" و "شەو" و "دەنگی عود" و "میسکی هاڕاو لەگەڵ عەتریات" و "یوسف خۆی" و "ژەنگ لابەر" و "چرا لەسەر تووری سینا" و "ئەوەی چاکەتی گوڵ دادەکەنێ" و "گەورەترین کان لەنێو کانەکاندا" و "ئەو یەکەی پێش ئەوەیە" و مانگ لەسەر زەوی" و "سپێدە لە ناوەڕاستی شەودا" و "قەڵغان لە مەترسیدا" و "هەوری بارانی شیرین" و "ئۆقیانوسی، هەڵگری مرواریيەکان" و "مەشخەڵی قاچاخچییان" و "زنجیری دڵڕەقان" و "بەختەوەریی پێکەنیو" و "هاوەڵی زیندان" و "دز و ڕێبەر بەدرێژایی ڕۆژ" و "مەسیحی گشت خەمەکان" و "بزوێنەری ئارامی" و "عەقڵدز" و "پێکهێنەری سیستم" و "دڵۆپ و ئۆقیانووس" و "نەرمی و تووڕەیی" و "شەکر و ژەهر" و "ئاو و گوڵدان" و "میوەی هەژاری" و "بەردی خۆر" و "تۆ و تەڵە" و "مەی و پێك" و "کاڵ و کوڵاو" و "وچان و بوورانەوە" و "ڕێبواری پێکەوتوو" و "تێکشکێنەری ئایکۆنەکان" و "شیفادەری ئاشقان" و "کورتکەرەوەی جیهان" و "ئێستا نیگەرانی" و "ئەو لافاوەی دەدزرێ" و "ئەو فریشتەیەی خۆراك دەبەخشێتە ئەوین" و "دەست و پێ" و "بوونی هەموو بوون" و "چاو و گوێ" و "ڕوناکیی ڕۆژ" و "ئەو خۆشیەی خەم دەسووتێنێ" و "هەوری شەکر هەڵگر" و "زانستی جیهانی نوێ" و "دڵی لەخوێن گەوزاو" و "هەناسەی نوح" و "حەزی ڕۆح" و "تەندروستیی نەخۆشان" و "ئەو ئاوەی لە جەرگەی جۆگەلەدا هەڵدەقوڵێ" و "کوێریی ئەوانیدی" و "باوکی خۆشیی نوێ" و "کونکەری شادەماری ژیان" و "ئەو تۆپەی جیهانی تێدا دەبینێ" و "ڕاستکەرەوەی نوکتە" و "خۆشی لە خۆشیدا" و "تیربڕ" و "گەورەی گەڕان بەدوای جیهان" و "ئەو مانگەی لە ئاسماندا فەیز دەکات" و "مەزنترین مرواریی دەریا" و "ئەو چیایەی دەست تێدەپەڕێنێ" و "پاشای جنۆکە کە قۆری دەتوانێ جڵەوی بکات" و "ئاوی زیندەگانی" و "سەرەتای کۆتایی" و "سەرخۆش و مەیگێڕ" و "بینراو و شاراوە" و "دابەشکەری سپێدە"، ئۆغری دەکرد.

بەزمان و بە ڕێگەی جیاواز باسی فیراقی شەمس و ڕۆمی، هەروەها باسی یەکگرتنیان کراوە. هەریەك لەو گێڕانەوانەیش باسی بەشێك لە ڕاستییان کردوە، ئەو ڕاستییەی ئەو ڕاوییە بینیویەتی یان ئاواتەخواز بووە ببینێ. بۆ نموونە بۆیان گێڕامەوە کە لە شەشی شەوالدا کاتێ ڕۆمی زانی شەمس چیتر وەك نەریتی خۆی نایەت بۆ لای، خۆی ئەزیەتی کێشا و چوو بۆ گەڕان بەدوایدا لە قوتابخانە. کاتێ لە قوتابخانە نەیبینی، چوو بۆ ئەو ژوورەی سوڵتان وەلەد تێیدا دەخەوێ و وتی: "کوڕم، واز لە خەو بێنە، هەستە و بڕۆ مورشیدەکەم بۆ بێنە. بۆ جاری دووەم هەناسەکانم لە عەتری نەرمییەکەی مەحروم بوون".

دەوترێ لە ٥ی شەواڵ کاتێ ڕۆمی و شەمس بەتەنیا بوون، کەسێك بەدەنگێکی نزم لە دەرەوە بانگی شەمسی کردوە. شەمس هەستاوە و بەمەولانای وتوە کەسێك بانگی دەکات تا بیکوژێ، ڕۆمی وەڵامی داوەتەوە "ئەوە باشترین شتە دەیکەی"، ئیتر شەمس ڕۆیشتوە. دەستبەجێ حەوت کەس داویانەتە بەر چەقۆ، ئەویش هاوارێکی کردوە گەیشتۆتە کەشکەشانی ئاسمان، بەشێوەیەك بکوژەکانی لەهۆش خۆیان چوون، کاتێ بەهۆش هاتونەتەوە، لە چەند دڵۆپێك خوێن زیاتر هیچیان لەسەر زەویەکە نەدیوە.

گوێمان لە زریکەکەی شەمس بوو، زریکەی ئازار، زریکەی تەنیایی، زریکەی دوورخستنەوە، زریکەی گەشەگیری و دابڕان، زریکەی ئۆغرکردن. بەلای ڕۆمیەوە زریکەیەك بوو هێزێکی داهێنەرانەی تێدا بوو. لە "فەهرەست"ی ئیبن ئەلنەدیمدا خوێندمەوە کە پێغەمبەر و وێنەکێش (مانی) باوەڕی وابوو ڕزگاربوون بانگێکە لە جیهانی ڕوناکییەوە دەنێردرێ بۆ جیهانی گومڕایی، بۆ مرۆڤی سەرەتایی هەڵواسراو لە ماددەدا، بانگێك وەك شمشێرێکی هەڵکێشراو کە ئەسڵە ڕوناکەکەی بۆ مرۆڤی سەرەتایی ئاشکرا کردوە. ماوەیەکی زۆر من خۆم هەوڵم دەدا ئەو بانگە لە خۆمدا ببیستم، دەبێ هاواری ڕزگاری، هاواری خەلق، هاوارێك گەردوون ئاوس دەکات، چۆن بێ؟ بەڵام بەبێهوودە لە فەقیهەکانم دەپرسی. بەلای کاهینەکانی ئاینی زەردەشتیەوە، مانی کافر بوو (جەستەی کرا بە دوو لەتەوە، پاشان بەبزمار بە یەکێك لە دەروازەکانی کتیسیفوندا هەڵواسرا)، بەلای موسڵمانەکانەوە بەهرەکانی لە بەهرەی وێنەکێشێکی نایاب زیاتر نین. هەستم بەنائومێدی نەکرد. زانیم شەمس، کە تووڕە و میزاج ساتساتی بوو، دەیتوانی وا بکات ئەو هاوارە ببیستم. ئەوەی لە ٥ی شەوالی ٦٤٥دا کرد. بەڵێ، هەموو لەناو خۆماندا هاوارێکمان بیست، کە بەلای ڕۆمیەوە دەبێتە هاواری خەلقکردن، هاواری لەدایکبوون، هاواری بەپیتی، هاواری ئاوس بە شیعر. بینیم ئەو هاوارە دزە دەکاتە ناو هەر شەشسەد و شەست و شەش دەمارەکەی مەولانا، بینیم مەولانا دەگۆڕێ بۆ کەسێکیدی، بینیم سووتان لەبەر چاوانمدا ڕوودەدات.

ئەو شتە تێپەڕی کا ناکرێ تێبپەڕێ. ڕۆمی پشتی کردۆتە شەمس. شەمس بەویستی ئازادی خۆی ڕۆیشتووە، جا چ ناچار کرابێ بەوە یان هەستی بە ئیهانە کردبێ، نازانم. دەنگدانەوەی ئەو هاوارە لەگوێچکەماندا زرینگایەوە. دیارنەمانەکەی بەشێك بوو لە سووڕێکی پێشبینیکارانە، کە لە دیارنەمانی

ئیمامی دوازدەیەمی شیعەکان دەچێ. ئەو ئیمامەی چاوەڕوانی ڕۆژی تووڕەیی و لێخۆشبوون دەکات.

شەمس بوو بەهەڵم. شیبوویەوە، توایەوە، پوکایەوە، شەمس نەگەڕایەوە. شەمس ڕۆچووە ناو ناوەوەی ڕۆمی.

ئەوە دووەم ڕۆیشتنی بوو. ئەمڕۆ ئەوەم زانی. ئەو هەرگیز ناگەڕێتەوە، لە یەکەم هاوارەوە ئەوەم زانی. هەندێ وتیان، بگرە نووسییان کە لە قۆنیە کوژراوە. دڵپیس و تووڕەکان بەهەڵنانی کوڕە لاسارەکەی مەولانا کوشتویانە.

من پێم وانیە، چونکە تەرمەکەیم نەدی، هەروەها هەرگیز تارماییەکەیم لە شەودا نەدی تا داوای تۆڵەکردنەوە بکات.

شەمس بۆ جاری دووەم ئۆغری کرد و قەت نەگەڕایەوە. ئەمە هەموو شتەکەیە. لە شارێکەوە دەچوو بۆ شارێکیدی، ناوی خۆی گۆڕی، بە قسە تەمومژاویەکانی زۆر ڕۆحی ساردوسڕی تۆقاند. ڕەنگە ئێستا لە شوێنێك مردبێ کە کەس لە ئێمە نایزانێ. ئێوارەی ڕۆژێکیان کەسێکیان ناسیەوە، کەی؟ لە چ شارێك؟ ئەو کەسە کێیە؟ ئەوانە هیچ گرنگ نین. من چێژ لە گێڕانەوەی ئەو دیمەنە دەبینم. کەسەکە لێی دەپرسێ:

"ئایا تۆ شەمسی تەورێزیت؟ چی دەکەی؟".

شەمس وەڵامی دایەوە "باسی چی دەکەی؟".

پیاوەکە وتی: "من باسی ئەو دەروێشە پیرە دەکەم کە بەرگە ناگیرێ، ئەوەی توانای گەورەترین مامۆستا بکاتە بەندە. من باسی شەمسی تەورێزی دەکەم، شەمسی سەرکەش کە دەستەمۆ ناکرێ، شەمس کە ڕێگەیەك نیە بۆ ڕزگاربوون لێی، شەمسی تووڕە، شەمسی ریسواکەر، ئابڕوبەر. شەمسی نادڵسۆز، من باسی تۆ دەکەم".

شەمس وتی "من ئەو پیاوە نیم تۆ باسی دەکەی".

"نەخێر ئەوە تۆی و کەسیتر نیە جگە لە تۆ".

شەمس وتی "من نیم".

"نەخێر تۆی".

پاشان شەمس چاوەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە، ئەنجا بەرەو خواری کردنەوە و سەری خستە ناو دەستەکانی و بەدەنگێك کە بەحاڵ دەبیسترا بەو کەسە غەریبەی وت کە لێی نزیك کەوتەوە "من شەمسی تەورێزی نیم، چونکە شەمسی تەورێزی مرد، من بەمردوویی بینیم".

پیاوەکە وتی "بەچی مرد؟ کوژرا؟ کێ کوشتی؟".

شەمس دەستەکانی بۆ پێشەوە درێژ کرد و بەدەنگێکی زرنگەدار وەڵامی دایەوە: "من بووم، من کوشتم. من شەمسی تەورێزیم کوشت".

پیاوەکە دوو هەنگاو پاشەکشەی کرد و لەو پیاوە راما کە بە شەمسی تەورێزی دەزانی و وتی —ئەوە ئەوە— "دیارە من بەتەنیا نەبووم، ئێمە بەتەنیا نابین کاتێ کەسێك ئەکوژین. مەولانا لە خۆشەویستەکەی جیا نەئەبوویەوە. چیتر بەرگەی ئەوەمان نەگرت، ئەمانویست لەگەڵ خۆمان بیبینین، ئەمانویست بگەڕێتەوە لامان. لەبەرئەوە هەموومان بەیەك دەنگ هاوارمان کرد "شەمسی تەورێزی" ئەگەر پیاوی وەرە دەرەوە بۆ سەر جادەکە! چەند جارێك بانگمان کرد تا بێتە دەرەوە".

پیاوەکە لێی پرسی "ئەی هاتە دەرەوە؟".

شەمسی تەورێزی —ئایا ئەو بوو؟— ئێستا بەخێرایی هەناسە دەدات، هەندێ دەنگی نزم کردەوە، وەك ئەوەی شتێك تێیدا بیەوێ هاوار بکات و وتی: لە یەك ساتدا، لە ناوەوە، گوێمان لە دەنگی مەولانا بوو. بەڕوونی گوێمان لێی بوو. گوێمان لەو دەنگە بوو دەیوت: "برۆ، ناتوانین لە قەدەرمان هەڵبێین".

"ئایا وای کرد؟".

"وای کرد. گوێڕایەڵیی گەورەکەی کرد. سەری داخست و رۆیشت. هەموو پێکەوە بووین، لەسەر جادە چاوەڕوانمان ئەکرد، تێڵا و چەقۆمان هەڵگرتبوو، من یەکێك بووم لەوان. هەر کە دەرچوو، کوشتمان".

"بەڵام ئەی شەمس بۆچی هاتە دەرەوە؟ خۆ دەیزانی سەرکێشی بەژیانی دەکات".

"هاتە دەرەوە لەبەرئەوەی گەورەکەی داوای لێکرد بڕوات".

"بەڵام گەورەکەی خۆشی دەویست! ڕێی تێناچێ بینێرێ بۆ لای مەرگ".

"لە خۆشەویستیدا هەموو شت ئەکرێ"، شەمس وەڵامی دایەوە "تەنانەت غیابی خۆشەویستیش".

بەبێدەنگی، غەریبەکە تەماشای ئەو پیاوەی کرد کە بە شەمسی تەورێزی دەزانی. پاشان جارێکیتر لێی پرسی: "ئایا رۆیشتی؟".

"بەڵێ رۆیشتم. هەرچی ئەوانیترن هیچیان لەبارەوە نازانم. نامەوێ بزانم ئەوانیتر چی ئەکەن. من رۆیشتم، لەو رۆژەوە من بەدووای ئەوەدا ئەگەڕێم کە ونم کردوە".

"چیت ون کردوە؟".

"نازانم" شەمس بەئاماژەیەکی دەستی ماڵئاوایی لە پیاوەکە کرد. سووڕایەوە و رۆیشت و هەندێ دەشەلی. روناکیەکە کز دەبوو. هەر زوو پیاوە پیرەکە ون بوو.

## من ئەوم...

لەو ماوەیەدا، رۆمی بەبەردەوامی کۆڕی بیستنی ساز دەکرد. ژەنیاران و سەماکەران و گۆرانیبێژە شەکەتەکان لە زۆر ماندوییدا هەرەسیان دەهێنا و لەسەر زەویی "بیستنخانە"کە خەویان لێدەکەوت، ئەمە لەکاتێکدا نالەی نای کە لە دوو لێوی شەکەتەوە دەردەچوو و کە ئێستا کز بووە، دەگەیشتە گوێچکە پڕ خەوەکانیان. مەولانا بەبێ ماندووبوون و بێزاربوون لە خولانەوە و هەڵبەستنی شیعر نەدەوەستا.

**شێخ، پزیشکی مەزن،**

**بووە بە شاعیری عیشق،**

**خواناس بووە بە مەیفرۆش و**

**عیشق بووە بە ڕێگەی،**

**بووە بە دین و دەیدەنی،**

**هەر شتێك عیشق نەبێ،**

**تەنیا وەهمە.**

**لە ڕێگەیدا، کفر نەماوە،**

**شەمس بووە بە پاشای پاشاکانی.**

بەم شێوەیە سوڵتان وەلەد وەسفی دۆخی باوکی کرد پاش دیارنەمانی یەکجارەکیی شەمس.

ڕۆژێك نەبوو کەسێکی غەریب نەیەت بۆ قوتابخانەکە تا ئەوەی دەیوت گوایە هەواڵە لە شەمسەوە بۆی بگێڕێتەوە. مەولانا داوای کرد ڕێگە بەهەر کەس دێ بدەین بچێتە ژوورەوە. ئامادە بوو گوێ بۆ هەر ریوایەتێك بگرێ ئەو غەریبە بۆی دەگێڕایەوە. گێڕانەوەی دژبەیەك هەندێ جار شەمسی دەخستە وڵاتی شام، هەندێ جار وڵاتی فارس، هەندێ جار تەنانەت لە چین. هەروەها لەگەڵ ژنێك و چەند منداڵێك بینراوە، هەروەها بەیاوەریی لاوێك، یان بەتەنها لە دۆخێکی دژواردا. یەکێکیان وتی گوایە شەوی رابردوو لە قۆنیە خۆی بینیویەتی، کە لە شێوەی فرۆشیاری جلوبەرگی کۆنەدا خۆی شاردۆتەوە، کە جلی کۆن بە دەرزی دەگۆڕێتەوە.

"بۆچی ڕاتنەگرت؟".

"دیار نەما تەنانەت پێش ئەوەی دەستم لەسەر شانی دابنێم".

ڕۆژێکیتر پیاوێك هات. هیلاك و هەناسکە هەناسکی بوو. باسی لەوە دەکرد بەبێ وەستان ڕێگەی نێوان دیمەشق و قۆنیەی بڕیوە، بەبێ ئەوەی پشوو بدات. بەڵام ئەو پەیامەی هەڵیگرتوە شایستەی ئەو برسێتی

و تینوێتی و شەکەتییە کە چەشتویەتی. بەڵام مەولانا سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو ڕێبوارە یەکەم جار پشوو بدات و وزەی بۆ بگەڕێتەوە. ئەویش وای کرد. هەموو لەدەوری ئەڵقەمان بەست، بەئومێدی ئەوەی باوەڕ بەو زانیاریانە بکەین پێشکەشمانی دەکات. کاتێ بەدەنگێکی بەرز قوڕنیسکی دا، ڕۆمی دڵنیا بوو گەدەی پڕ بووە، ڕێگەی پێدا قسە بکات.

"گەورەم شەمسی تەورێزیم لە مەیدانی دیمەشق لە ئێوارە ئاهەنگی ساڵانەی یاری ئاگریندا بینی. هەزاران مارەوان و عەڕاف و فرۆشیاری گەڕۆك شەقامەکانیان پڕ کردبوو کە چرا روناکی کردبوونەوە، فیلە هیندیەکان کە بە مەخمەڵ داپۆشرابوون و بەمۆم روناك کرابوونەوە لە نمایشێکی جوان لەسەر ریتمی تەپڵێدان دەڕۆیشتن، بەهلەوان و سەماکەرەکان پەپکەی ئاگرینیان دەهاویشت، حەشاماتەکە کە بە روناکی و قاڵەقاڵ و رەنگەکان و مۆسیقا دڵخۆش بوون، بەو شێوەیە رەفتاریان دەکرد کە زۆر منداڵی ترساو رەفتار دەکەن".

مەولانا لە دەمی هەواڵگوێزەکە راما. هەوڵی دا شەمس بێنێتە بەرچاوی کە عەبایەکی رەشی لەبەردایە، لاواز و روو گرژ، لەناو ئەو قاڵەقاڵ و روناکییە درەوشاوانەدا نوقم بووە. تەواو دەیزانی ناکرێ شەمس لەناو ئەو کەژاوەی ئاژەڵانەدا ئامادە بێ. هەروەها ناکرێ چاوەکانی بەرز بکاتەوە تا یارییە ئاگرینەکان ببینێ، چونکە رقی لە قەرەباڵغی و ئاهەنگگێران بوو. بەڵام بایەخی بەم حیکایەتە دا، ئەوەیش دەریدەخات چەندە تینووە بۆ بیستنی هەواڵ لەبارەیەوە. بەڵام پیاوەکەیتر، حیکایەتخوانە پرۆفیشناڵەکە، حیکایەتەکانی ترش و خوێ پێوە دەکرد، باسی لەوە کرد گوایە یەکێك لەو فیلانە دەفرێکی هەڵگرتوە کە کەلوپەلە پیرۆزەکانی تێدا دەپارێزرێن و تەڵەموویەکی پێغەمبەری تێدا بووە. کاتێ ئەم فیلە بەبەردەمی خەڵکەکەدا رۆیشت لەبەردەمیدا کڕنووشیان برد و زەوییەکەیان ماچ کرد. لەبەر کەمتەرخەمی ئاگر لە کوڕێکی شەش ساڵ بەر بوو کە سەما و یاری بەئاگر دەکرد. بۆ ئەوەی لە سەمای بلێسە کە بە نەریتێکی کۆن دادەنرێ نەوەستێ، باوکی کوڕە سەماکەرەکە کە ئاهەنگەکەی بەڕێوە دەبرد فەرمانی کرد سەرباری ئەو ئازار و سووتانەی دووچاری کوڕەکەی بوو، سەماکە بەردەوام بێ، لەبەرئەوەی ئەو سروتانە پێویستە بەو شێوەیەی نەخشەیان بۆ کێشراوە تەواو بن. لەوانەیە هەر وەستان یان گۆڕانێك کوشندە بێ، لەوانەیە ببێتە مایەی ساڵانێك لە وشکەساڵی و جەنگ و فیچکەبەستنی روباری خوێن و شەڕ و شۆڕ.

لەکاتێکدا گوێی لە قسەکانی ئەو پیاوە دەگرت، بیری مەولانا لای شەمس بوو کاتێ لەنێوان مارەوان و بەهلەوانەکاندایە. تۆبڵێی ئەو هۆی ئەو رووداوە بێ تووشی کوڕە سەماکەرەکە بوو؟ ئایا بەپاڵ پاڵی پێوە ناوە بۆ ئەوە، یان سەری پێیدا هەڵتەقیوە؟ ئەو دەتوانێ ئەوە بکات، رۆمی ئەوەی دەزانی. لەوبارەوە پرسیاری لە حیکایەتخوانەکە کرد، ئەو پیاوەی لە دیمەشقەوە هاتبوو وەڵامی دایەوە کە شەمس بەردەوام

لەنێو ئاپۆرای خەڵکدا بووە. تەنانەت ئەگەر تاریکیش بیشاردایەتەوە، پاش ماوەیەکی کەم جارێکیتر دەردەکەوتەوە  کە بەتیشکی ئەو روناکیەی لەیارییە ئاگرینەکان بەرز دەبوویەوە روناك دەبوویەوە.
لەکاتێکدا پیاوەکە لە گێڕانەوەی حیکایەتەکەی بەردەوام بوو، مەولانا بەدەنگێکی نزم داوای لە زریانوس کرد وەك پاداشت هەندێ پۆشاکی کەشخەی بۆ بێنێ. زریانوس زوو گەڕایەوە بەدەستێك جلوبەرگەوە کە شیاوی یەکێك لە شازادەکانی هەزار و یەك شەوەیە.
کاتێ جلەکانم دی خەریك بوو لەسەر جێگەکەم هەڵقونمە خوارەوە. چی؟ ئەو هەموو پۆشاکە بۆ ئەم پیاوە کە قسەکانی جێگەی متمانە نەبوون؟ ئەی مەگەر من حوسام ژمێریاری قوتابخانە نیم؟ پێشبینی روودانی کێشەی داراییم دەکرد: قەرز، دانوستان لەسەر نرخی سوو، دانەوەی قەرز لە وەرگرتنی چەردەی گەورە لەپێناو بینینی مەولانا،کە ئەوە شێوازێکی زرنگانە بوو بۆ کۆکردنەوەی پارە لەوکاتەوە شەمس لێرە بوو.
راویەکە وەڵامی گشت پرسیارەکانی دایەوە و کەوتە گێڕانەوەی وردەکاریی زۆر ورد. وەك ئەو وتی ماندوێتی و شپرزی بە شەمسەوە دیار بووە. تەنها بوو. هەندێ جار وا دەجوڵایەوە وەك ئەوەی کەسێك بەدوایەوە بێ، بەبەردەوامی سەیری ئەملاولای خۆی دەکرد، وەك ئەوەی بیەوێ دڵنیا بێ کەس بەدووایەوە نیە.
کاتێ شەمس جارێکیتر تێبینی راویەکەی کرد، تاریکیەکەی قۆستەوە و خۆی کرد بەناو حەشاماتەکەدا و ون بوو.
پیاوەکە کە چاوی لەسەر جلەکان بوو درێژەی بەقسەکانی دا.
"بەڵام من ناسیم، شوێن جوڵەکانی کەوتم. توانیم شوێنەکەی دیاری بکەم، تەنانەت کاتێ لەپشت فیلە زەبەلاحەکەوە کە دەفری کەرەستە پیرۆزەکانی هەڵگرتبوو خۆی حەشاردا، تەنانەت کاتێ لەناو خەڵکەکەدا خۆی شاردەوە. هەستم بەچاوەکانی دەکرد بەدوای مندا دەگەڕان، بەڵام لەبەرئەوەی من قەبارەم بچوك بوو، بەشاراوەیی مامەوە".
مەولانا داوای لێکردین چاکەت و نەعل و مێزەرەکان و چەند پارچەیەك قوماشی چنراو بە دەزووی ئاڵتونی و زیوی و مەخمەڵی نقێم لێدراو لەبەر چاوماندا، جیا بکەینەوە.
پێشتر شتێکی وام نەدیبوو. کەس لە ناسراوەکانمان هەرگیز رێگەی بەخۆی نەداوە سامانەکەی بەم شێوەیە بخاتە بەردەم ئەوانیتر. تەنانەت موعین سلێمانی بەرپرس لە کۆشکی سوڵتان و هاوڕێی مەغۆل، هەرکات بهاتایە بۆ قوتابخانە لە زەقیی رەنگە سپی و قاوەیی کاڵ و رەشیی چاکەتەکانی کەم دەکردەوە.
پیاوە لە دیمەشق هاتووەکەوە بەسەری پەنجەکانی دەستی دا لە دەزووە ئاڵتونیەکان کە قۆڵەکانی کراسەکەیان رازاندبووەوە و شەپۆلێکیتر وردەکاری ئاشکرا کرد.
"شەمسی تەورێزی لەگەڵ ئاپۆرای خەڵکەکەدا  چووە پێشەوە. کاتێ لەپڕ لێی نزیك کەوتەوە، شەمس سەیری ئەملاوئەولای کرد و وادیار بوو ناسیبووی. چەند وشەیەکیان ئاڵوگۆڕ کرد و چپاندیان بەگوێی

یەکتردا. پاشان شەمس جزدانێکی لە باخەڵی دەرهێنا و دای پێی. پیاوەکە جزدانەکەی وەرگرت و بۆ ساتێك دەستی شەمسی گرت".

مەولانا باش ئەو دەستە باریك و پەنجە بە مرەکەب یان زەعفەران پیسبوو و نینۆکە لە سەرما رەش هەڵگەڕاوانەی دەناسی. ئەو دەستانەی زۆر گرتوون کە لەکاتی سەمای بیستندا بەرز دەبوونەوە تا ببنە ئەو گوریسەی ئاسمانی بەزەوی دەگەیاند. ئەو دەستانە خۆشیان دەویست و گەمەیان لەگەڵ کرد، لە جیهانی دەقگرتووی هەستە ئاساییەکان رفاندی تا بیخاتە سپێدەری گەشەکردن و بەپیتیی هەتاهەتایی. سەرجەم هەستەکانی رۆمی ئەو دەستانەیان دەناسی. زمانی تامیان و لوتی بۆنەکەیان دۆزیەوە، پەنجەکانی بەر دەمارەکانیان کەوتن. ئەو دەستەی پیاوێکی نەناسراو لە شەوی ئاهەنگەکە لە دیمەشق گرتی، هەر بەڕاستی ئەو پیاوە بوو کە ناتوانرێ دەستەکانی لە دەستەکانی مەولانا جیا بکرێنەوە، کاتێ لەیەکتر ئاڵان، یەکگرتنی نێوانیان دووپات کردەوە.

دوای ئەوەی چای پێشکەش کرد، راویەکە هاوەڵەکەی شەمسی بەوردی وەسف کرد. پێنەدەچوو زۆر گەنج بێ. پیری پرچی هەندێ سپی کردبوو —بەو تاریکییەیش تێبینی ئەوەی کردبوو— و شێوەی رۆیشتنی جێگیر نەبوو.

تەماشایەکی مەولانام کرد. لەگەڵ ئێمە نەمابوو. گواستیەوە بۆ دیمەشق. نیگای لەسەر دوو دەستە لێکئاڵاوەکە چەقاند. دەبێ ئەو کەسە کێ بێ کە لە رۆیشتندا ناڕەحەتیی زۆری هەیە؟ لەناکاو، داوای لە زریانوس کرد یارمەتی بدات بۆ داکەندنی جلەکانی.

یۆنانیەکە پرسی "لەبەردەم هەمووواندا؟".

"لەبەردەم هەمووواندا؟".

زریانوس مێزەرەکەی رۆمی لابرد، پاشان جلەکەی، پاشان کراس و شەرواڵەکەی. بەپێچەوانەی روومەتە زەرد و لاوازەکەی جەستەی بەهێز و ماسولکەکانی تۆکمە بوون.

مەولانا بەڕووتی، یان نیمچە رووتی، ئاوریشمە دووراوەکانی لەگەڵ جلەکانی خۆی دایە ئەو پیاوەی لە دیمەشقەوە هاتبوو. زریانوس کە پێی وایە نرخی جلەکانی رۆمی زۆر زیاترە لە نرخی هەر جلێکی بەئاڵتون رووپۆشکراو، هەوڵی رێگە لەم بەخشندەییە بێپاساوە بگرێ.

"مەولانا تۆ ئەبینی درۆ دەکات. کەس شەمسی تەورێزی نەدۆزیوەتەوە".

لەسەر راشکاویەکەی هاوڕای بووم. لەبەرئەوەی ژمێریاری قوتابخانە بووم دەمتوانی پارچەیەك لە مێزەرەکەی مەولانا بەپیاوێکی دەوڵەمەند بفرۆشم و بەشی خەرجی هەفتەیەك بەڕێوەبردنی قوتابخانەکە بەدەست بێنم. کەوتمە حسابکردنی ئەوەی هەموو جلەکانی چەند دەکەن: سامانێکی بچوکە.

مەولانا زەردەخەنەیەکی بۆ زریانوس کرد. گوێرەویەکەی داکەند و بۆی رادا، پاشان وتی "هەموو ئەوەی بینیت دام بەو پیاوە لەبەرئەوە بوو درۆ دەکات، خۆ ئەگەر راستی بوتایە، هەموو ژیانی خۆمم پێ دەبەخشی".

هەمان دۆخ لەگەڵ سەرجەم ئەوانیتریش. لەگەڵ ئەوەی ناتوانرێ بخەڵەتێنرێ، بەڵام ئەو چیرۆکانەی قبوڵ دەکرد کە لەبارەی شەمسەوە دەیانگێڕایەوە. ئەوە بەلای ئەوەوە زەروری بوو. وەك ئەوەی، جگە لەو هەوایەی هەڵیدەمژێ و ئەو ئاوەی دەیخواتەوە، لە هەر ساتێکدا پێویست بێ هەستەکانی هەست بەشەمس بکەن. ئەوە بوو چیرۆکی ئاهەنگە شەوانەکە و دەستی خۆشەویست لەدەستی کەسێکی نەناسراودا، لەگەڵ ئەوەی هەڵبەستراو بوو و هەستی رۆمی تا رادەی غیرەکردن بزواند. بەڵام لەپاڵ هەستی کیبریا و پەستی و تووڕەییدا، هەستی کرد پێویستی بەوەیە ئەویتر بکاتە وجود هەمەکی (كلي الوجود)، تەنانەت ئەگەر ئەوە مانای ئەوەیش بگەیەنێ کە پێویستە ئازار بچێژێ.

مەولانا سەرکێشی دەکرد بە چوونە ناو جیهانێك کە چیتر دەسەڵاتی بەسەریدا نەدەشکا. بۆچی ئێستا سزای خۆی دەدات بەهۆی دیدارێکەوە لەنێوان شەمس و کەسێکی نەناسراودا بووە، کە ئەو هانی ئەو جۆرە کارەی دەدا کاتێ شەمس لە قۆنیە بوو؟ چەند جار هانی دا بۆ ئەنجامدانی سەمای بیستن لەگەڵ کەسانیدی تا سەرنجی ئەوانەی بەبەردەوامی چاویان لەسەر ئەو دووانەیە، دوور بخاتەوە؟. شەمسیش ئەوەی دەکرد. لە حزوری رۆمیدا داوای لە موریدانی لاو کرد لە سەما ویژدانیەکەیاندا لەگەڵیان بەشداری بکەن. مەولانا ئەوکات هیچ هەستێکی دوژمنکاری داینەدەگرت، بەپێچەوانەوە سەرسامی خۆی بە هەیمەنەی شەمس بەسەر سەماکەرەکانیتردا دەردەبڕی. چەند جار شەمس باسی زاڵبوونی بەسەر پیاوێکی بەساڵاچووی گۆشتن یان لاودا بۆ رۆمی گێڕایەوە، کە "بەخت هێنابووی" بەمانایەکیتر بەفارسی "ئامادە بۆ هاوسەرگیری". بەمەولاناوە دیار نەبوو ئەوە کاری تێکردبێ. لەڕاستیدا ئەو چیرۆکانە دڵیان دەدایەوە. مەبەستی ئەوە بوو شەمس خۆشی بخاتە دڵی پیاوان و ئافرەتان، گەورە و بچوك، هەروەها دڵی موریدان، ئەمە جگە لە وەزیران و دەوڵەمەندان و هەروەها هەژاران. شەمس لەگەڵیان هاوڕا دەبوو یان بەرپەرچی دەدانەوە. بەڵام مەولانا پێشوازی لەوانە دەکرد کە پێی سەرسام بوون و رێزی دەگرتن، هەروەها بەرهەڵستیی ئەوانەی دەکرد زەمیان دەکرد و لە قەدریان دادەبەزاند. ئێستا بۆچی کە گوێ بۆ ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوە دەگرێ ئازار دەچێژێ؟ رنگە ویستبێتی ئازار بچێژێ. رەنگە ئێستا ئیتر شیاوی ئازارچەشتن بێ.

مەولانا کەڵکەڵەی چوون بۆ دیمەشق و گەڕان بەدوای شەمسی دای لە کەللەی، کە لە ناخی خۆیدا بەهیوای ئەوە بوو نەیدۆزێتەوە. هەموو دەنگۆکان باسیان لە بوونی شەمس لە دیمەشق دەکرد. رۆمیش وەك ئێمە دەیزانی کەسیان جێمتمانە نەبوون و هیچ کەس لەوانەی بۆ بەدواداچوونی هەواڵدەرەکان ناردبونمان

نەیتوانی زانیاریەکی وردی دەست بکەوێ. لەگەڵ ئەوەیشدا مەولانا سوور بوو لەسەر ئەوەی بچێ بۆ دیمەشق. یەکەم دیداری نێوانیان لە گۆڕەپانی سەرەکی شارەکە رووی دا کاتێ شەمس بەمەولانای وت: "ئەی سەڕافی جیهانی ماناکان، فریامان کەوە". سوڵتان وەلەدیش پاش دابڕانی یەکەمی ئەو دووانە سەفەری کردبوو بۆ دیمەشق، تا بەدووایدا بگەڕێ.

من و زریانوس و سوڵتان وەلەد دەمانزانی جارێکیدی نایدۆزینەوە. تەنانەت سوڵتان وەلەد باوەڕی وابوو شەمس کوژراوە و ئەوەیش فەرمانی بەکوشتنی کردوە هەر براکەی خۆیەتی. بەڵام چۆن دەکرێ دان بەوەدا بنێ؟ چۆن دەتوانێ لەبەردەم باوکێکدا کە پارەیەکی زۆر دەدات تەنیا بۆ بیستنی هەندێ هەواڵی هەڵبەستراو، جەخت لەوە بکات ئەو کوڕەی خوێنی ئەو لە دەمارەکانیدا دەگەڕێ کۆتایی بە ژیانی شەمس هێناوە؟. دوای چەند ساڵێك کاتێ خەوێکی بینی کە شوێنی شاردنەوەی تەرمی شەمسی پیشان دا، سوڵتان وەلەد دانی بەوەدا نا کە ئەو گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی شەمس کوژراوە و لەشەکەی شاراوەتەوە.

نە من و نە زریانوس و نە تەنانەت سوڵتان وەلەدیش نەمانتوانی ئامۆژگاری رۆمی بکەین نەچێ بۆ دیمەشق. کەس نەیدەتوانی بەوە قایلی بکات سەڵاح نەبێ، زێڕنگەرەکە، کە تا دێ نزیکی لە مەولانا نزیکتر دەبێتەوە، بەڵام ئەویش وتی ناتوانێ رۆمی لەوە پەشیمان بکاتەوە.

رۆمی بەهاوەڵیی کوڕەکەی و ژمارەیەك لە موریدەکانی و چەند ژەنیارێك سەفەری کرد بۆ دیمەشق، گەشتێکی نەزۆك و بێسوود بوو.

وەك باو بوو، دوای ئەوەی مەولانا سەفەری کرد، دەرگاکانی قوتابخانەکەمان داخست و حەوشەکەمان گسك دا. رێك لەو ساتەدا لەکاتێکدا تەپوتۆز لە ژوورەکەی مەولانادا بەئاسماندا دەفڕی، لە روانینی سەڵاحدا کزیی روانینی شەمسم دۆزیەوە کاتێ رۆمی لە ژوورەکەدا نەبوو. هەمان کزی دوای دە ساڵ دەخزێتە چاوەکانی منیش، کاتێ من خۆم لە بوونی مەحروم کرام.

لە دیمەشقەوە نامەیەکم لەسوڵتان وەلەدەوە بەدەست گەیشت. لە سەرەتای نامەکەدا قەسیدەیەکی رۆمی لەبارەی شەمس هەبوو تێیدا باسی گەڕانە بێئومێدانەکەی دەکات:

چەند جار بۆت گەڕام،
ماڵ بەماڵ و
دەرگا بەدەرگا؟

چەند جار هەڵاتی،
لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر،
لە شەقامێکەوە بۆ شەقامێکیدی؟

وەك سوڵتان وەلەد باسی کرد، ستایشکردنی رۆمی بۆ شەمس لەکاتی سەمای بیستنەکەدا خەڵکی دیمەشقی، بەخوێندەوار و نەخوێندەوارەوە، بە دەوڵەمەند و هەژارەوە، بەمنداڵ و هەرزەکار و پیرەوە، دیل کرد. بەڵام لەسەروو هەموو شتێکەوە رۆمی هەستی دەکرد ئەو خۆی لە شەمسدا دەبینێ و ناکرێ یەکێکیان لەویتریان جیا بکرێتەوە.

رۆژێکیان باوکی بەنهێنی پێی وت:

**بە دوو کائینمان مەبینە، چونکە ئێمە یەکین،**

**دوو گومانی تێدایە،**

**بەڵام ئێمە گومانمان تێدا نیە،**

**وا تەماشام مەکە کە لە شەمس جیاوازم.**

**ئێمە یەك گیانمان هەیە،**

**برۆ، سیمامان لەیاد بکە.**

سوڵتان وەلەد وتی خەڵکی شام کە هیچیان دەربارەی شەمس نەدەزانی، تێنەدەگەیشتن چۆن دەکرێ زانایەکی گەورە کە دەکرێ بە پێغەمبەر ناو ببرێ، تووڕە ببێ و بلەرزێ و گێژ ببێ لەپێناو دەروێشێکی پیری نەناسراودا. "بەبێ سەر و دوو پێ". لە هەموو شوێنێك رێمان لە تێنەگەیشتنی خەڵك کەوت، چ لە قۆنیە یان لە دیمەشق، چ کەسەکە بیناسێ یان نەیناسێ، وادیار نەبوو شەمس شیاوی ئەو هەموو حەماسە بێ، تەنیا هەستی رق و دوژمنایەتی دەوروژاند.

لە قۆنیە شتەکان هەروەك رابردوو دەڕۆیشتن. ژیانمان پشتی بەو نامانە دەبەست کە لە دیمەشقەوە دەهاتن. رۆژێکیان زانیمان رۆمی و دەستوپێوەندەکەی خۆیان بۆ گەڕانەوە ئامادە دەکەن. جارێکیتر حەوشەکەمان گسك دایەوە، گوڵەکانمان ئاودا، سەرجەم فەرشەکانی قوتابخانەمان تەکاند وەك ئەوەی ئاهەنگ بۆ هاتنی ساڵی نوێ ساز بکەین. بەڵام لەناخی خۆماندا هەستمان دەکرد گەڕانەوەی مەولانا بەبێ شەمس خەم و خەفەت دێنێ.

تەنانەت کیرای ژنی کە پاش رۆیشتنی شەمس سەرەنجام توانی مێردەی بگێڕێتەوە، هەستی بەخەمۆکی دەکرد. ئەو ماڵ کۆکردنەوەی ئەو ئاواتی بوو شەریکێکی درەوشاوەی دەوێ، پیاوێکیش نیە بکرێ بەراورد بکرێ بەقامیشێك لە دارستان بڕابێ. گەڕانەوەی رۆمی "بەدەست بەتاڵی" مژدەی هیچ خۆشی یان سۆزێکی بۆ ژنە پشتتێکراوەکە پێ نیە. دەبوو ئەویش چاوەڕوان بکات.

له ماڵ ئەو پشیلانەی چاوەڕوانی گەڕانەوەی مەولانایان دەکرد، پشتی و بەتانی و بەڕەکانیان بەجێهێشت، تا خۆیان پاك بکەنەوە، تا لەشە پاکەکانیان بۆ دەست پێداهێنانە بێکۆتاکانی مەولانا پێشکەش بکەن، کە هەستیان کرد نزیکە.

زۆرجار دەیانپرسی ئاخۆ بوونیان بێزاری ناکات. ئاخر میزەکانیان هەموو سووچەکانی دیوارەکەی پڕ کردبوو، تەنانەت لەناو ژوورەکەدا کە هەردوو پیاوەکە خەڵوەتیان دەکێشا، هیچ ئاماژەیەك نەبوو بەڵگە بێ لەسەر تووڕەییان، چونکە مووی سپی رایەخەکەی داپۆشیبوو و بەشەرواڵە رەشەکەی رۆمی و کراس و پاڵتۆکانیەوە هەڵدەواسران.

مەولانا گەڕایەوە و لە قوتابخانەکەدا جێگیر بوو. بەحاڵێکی باشەوە گەڕایەوە. گەرموگوڕ بوو. وادیار نەبوو رومەتە زەردەکەی بەو گەشتە یان غیابی کاری تێکراوە. کەوتە سەماکردن، دەخولایەوە، دەچوو بۆ حەمام و شیعری دەهۆنیەوە و گۆرانی دەوت. ئێستا وام لێهاتووە دەزانم یەککگرتن و جیابوونەوە لەگەڵ شەمس، ریسوایی یەککگرتنێکی حەرام، ئازاری جەفاکێشان، حیرەتی گەشت و گەڕان، هیچی لێ نەکەوتەوە جگە لە کۆتاییەکی ناوەکی، ئەویش ئەوەیە ئەدەبی فارسی کردە خاوەنی جوانترین شیعرەکانی خۆی، کە دوورن لە هەر زۆر لەخۆکردنێك، ئەو قەسیدانەی وەك چەقۆیەکی تیژ دڵەکانمان بۆ هەتاهەتایە دەبڕێ "وردەکاریی عیشق لە جیهاندا".

جارێکیتر سەردانیکەران بەهەواڵی درۆوە داباریەنەوە بەسەرماندا. سیخوڕەکانیش ویستیان بەچاوی خۆیان "بلێسەی عیشق" ببینن.

بەلای ئەوانەوە، شەمس لە دیمەشق وەك مامۆستا لای خێزانێکی دەستڕۆیشتوو کاری دەکرد. زەحمەتە بتوانم بیر لەوە بکەمەوە ئەو قوتابیەکی بچوك فێر بکات. ئەوە دەیدەنی ئەو نیە. ئەو دەتوانێ بەچەند وشەیەك، بەنیگایەك، چارەنووسی منداڵێك بگۆڕێ. بەڵام بەدڵنیاییەوە نەك بەفێرکردن بۆ ماوەیەکی درێژ و بەئارامی. هێشتا چیرۆکی ئەو کوڕەم لەیادە کە قسەکانی شەمس تووشی حەپەسانیان کرد و وتی دەیەوێ لەگەڵیدا بمێنێتەوە "وەك زەوی دامەزراو"، کە مرد و هێشتا تەمەنی هەژدە ساڵ تێنەپەڕیبوو. ئەو کوڕە هێشتا پێنەگەیشتبوو تا باری شەمس هەڵبگرێ. هێشتا دەتوانم شەمس ببینم پێم دەڵێ: "رۆژێکیان دەرسم بەکۆمەڵێ قوتابی دەوت، بەپاڵنەری خۆشەویستی هەندێ شتی قۆڕم بۆیان باس کرد. سۆزیانم وێران کرد". چۆن دەکرێ سۆز وێرانکەر ئێستا جارێکیتر بیگێڕێتەوە بۆ بوون؟ دەنگێك چرپاندی بەگوێماندا کە رەنگە کاتی ئەوە هاتبێ دواجار قوتابیەکیتر تێبگات ئەو فێرکردنەی شەمس دەیکات خەڵاتە نەك بەندایەتی، بڵاوبوونەوەیە نەك کشان، تامی تاڵە، بەڵام لەکۆتاییدا دەبێتە مایەی ئازادی. بۆ جیاوازیی کەسایەتی.

دەبێ مەولانایش ئیتر بەهەمان ڕێگە بیر بکاتەوە. چونکە ڕۆژێکیان بڕیاری دا جارێکیتر سەفەر بکات بۆ دیمەشق تا بەدوای شەمسدا بگەڕێ. هەمان ئامادەکاریم بۆ دەستپێکردنی گەشتەکە کردەوە، هەمان عەرەبانەی پڕ لە نای و دەف، هەمان هاوەڵانی گوماندار، هەمان ماڵئاوایی خەمگین: هەمان بێئومێدییەکان.

سوڵتان وەلەد قەناعەتی وابوو دوژمنانی شەمس کوشتویانە، بەڵام زاتی نەکرد ئەوە بەباوکی بڵێ، چونکە تاسانی سێیەم، پاش یەکگرتن و جیابوونەوەیان، بکوژ دەبێ بۆی. لەبەرئەوە ڕاستیەکەی لێ شاردەوە. زریانوسیش باوەڕی وابوو باڵندەکە جارێکیدی فڕیوە، ئەگەرچی ڕەنگە هۆی ئەم فڕینەی دوایی خۆشەویستەکەی بێ. ڕۆمی وتی کش کش و باڵندەکە فڕی. مەولانام بینی تەواو قەناعەتی بە غیاب و فیراق هەبوو. بەلای ئەوەوە ئەم هاتن و چوونە هیچ ڕۆڵێکی لە دۆزینەوەی شەمسدا نەبوو، بەڵکو لە گەڕانە ڕۆحیەکەیدا ڕۆڵی هەبوو، کە نەوەستا. یانی مەولانا بۆ گەڕان بەدوای شەمسدا نەچوو بۆ دیمەشق، بەڵکو بۆ ئەوە چوو تا لە شوێنێکیتر دوور لە خۆی بیدۆزێتەوە.

لەبەرئەوە جارێکیتر سەفەری کرد بۆ دیمەشق. سوڵتان وەلەد جارێکیتر کۆمەڵێ نامەی بۆ ناردم پڕ بوون لەو قەسیدانەی باوکی نووسیبوونی. ڕۆمی لە شیعر هۆنینەوە نەوەستابوو. هەروەك لە ناردنی نێردراوان بۆ سۆراخکردنی شەمس کە هێشتا دیار نەبوو، نەوەستا. وەك عادەت، گەورەپیاوان و خەڵکی ئاسایی و بیرمەندان ڕوویان دەکردە ماڵی ڕۆمی، هەروەها وەك باو بوو، لەگەڵ ئەوەی لە وانەوتنەوە وەستابوو، بچوکترین قسە بەزاریدا دەهات بەلای ئێمەوە دەگۆڕا بۆ گوتەی سەر زاران.

لە یەکێك لەو نامانەدا سوڵتان وەلەد ناردنی، تێبینیەکی سەرپێیی سەرنجی ڕاکێشام. ئەوە بوو وتبوی ڕۆمی هاوڕێیەکی نوێی هەڵبژاردوە، ئەویش شێخ حەمیدەدینی نامییە "کە وێنەی خۆشەویستی لە ئاوێنەی سلوکیدا بینی".

کەواتە بەم شێوەیە ڕۆمی لە دیمەشق لەو ئاوێنەیەی هاوڕێیەکی لاو خستیە بەردەمی بۆ شەمس دەگەڕا. جگە لە ناوەکەی هیچم سەبارەت بەو پیاوە نەدەزانی، سوڵتان وەلەدیش هیچ وردەکاری لە وەسفکردنیدا نەوتبوو. نازانم چی وای لە مەولانا کردوە ئەو بە ڕەفیقی خۆی هەڵبژێرێ. کەس تەمەنی ئەو پیاوەی نەدۆزیەوە کە مەولانا هەڵیبژاردبوو جگە لە زریانووس: گەنج نەبوو، ڕەنگە چەند ساڵێك لە مەولانا بچوکتر بێ.

لە قۆنیە، کەس یەك وشەی سەبارەت بەم پەیوەندییە تازەیە بۆ سەڵاح باس نەکرد. گەشتکردنەکان بۆ دیمەشق بێزاریان نەدەکرد، چونکە دەیزانی شەمس جارێکیدی سەرهەڵنادانەوە، ڕۆمی بەجێهێشتوە وەك کە گەورەترین میرات بەجێ دێڵێ. بەڵام سەرباری ئەم دڵنیاییە کە باوەڕی بەهێزی پێی هەبوو، هێشتا

لەبەرانبەر  پەیوەندیەکانیتری ڕۆمیدا لاواز و هەستیار بوو. لەنێوان دوو سەفەرەکەی دیمەشقدا بەدوای هەر دیدارێکی نوێدا دەگەڕا، لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو لەدەستدانە بوونێکی جەستەیی بەرهەستیتر لەگەڵ خۆی بێنێ، لەترسی ئەوەی کەسێکیدی دڵی مەولانا بدزێ. هەستم کرد من بوومەتە جێگومان، لەبەرئەوە سەرکێشیم نەدەکرد بە خوێندنەوەی "وتارەکانی شەمس" بەئامادەبوونی سەلاح نەبووایە. هەندێ بڕگەیان باسی ئەو بوون، وەك ئەو بڕگەیەی دەڵێ قسەکانی سەلاح دەیشڵەژێنن.

لە قۆنیە، کەس یەك وشەی سەبارەت بەو پیاوەی ناوی حەمیدە باس نەکرد، سەلاح بەرگەی بیرۆکەی ئەوەی نەدەگرت کەسێکیتر لە خۆشەویستیی مەولانادا شەریکی بێ. بۆ پاڵپشتیکردنی ئەو پیاوەی کە دەبێتە پیاوە ئازیزەکە لای مەولانا، بڕیارمان دا کڕ و کپ بین و قسە لەبارەی هیچ شتێکەوە نەکەین پەیوەندی بە خۆشەویستیی ڕۆمی بۆ ئەو پیاوەی دیمەشقەوە هەبێ. دوای مردنی سەلاح، لەکاتی ئەو ساتە تایبەتانەی خەڵوەت لەگەڵ ڕۆمی، بڕیارم دا زیاتر لەبارەی ئەو پیاوە دیمەشقیەوە بزانم. ئەو هۆ چی بوو وای لە مەولانا کرد کە بۆ گەڕان بەدوای شەمسدا قۆنیەی بەجێهێشت، کەچی بەکەسێکیترەوە پەیوەست بوو؟ تاکە وەڵامی ئەوە بوو "شەمسی تەورێزی تەنیا بیانوویەك بوو".

جارێکیدی بێدەنگی باڵی کێشا.

هەندێ ناوچە هەن قەدەغەن عەقڵ تێیان بچێ. بەنێو لێدانەکانی دڵ و هەناسەبڕکێ و موچرکە و تربوونەدا تێدەپەڕن. بۆ ڕۆیشتن بەسەر ئەو زەویەی وا دیار بوو شەمس تەنیا بیانوویەك بوو بۆی، ئێستا دەزانم پێویستم بە دوو لاق و دوو پێی تەواو جیاواز هەیە".

لە دیمەشق گەڕان بەدوای شەمسدا بێسوود بوو، ژمارەی ئەوانەیش هەواڵی درۆیان دەگواستەوە، کە بێزار بوون لە دووبارەکردنەوەی ئەوەی شەمسیان لە سەرەتای شەقامێك، لە یەکێك لە خانەکان، لەسەر پردێك یان لەسەر کەشتیەك دیوە، کەمی دەکرد. وادیار بوو ڕۆمی ئیتر وەڕس بووبوو لەو درۆ و دەلەسانە کە بەبێ کۆتایی دووبارە دەبوونەوە. وردە وردە مەولانا خۆی لە گەڕانی دوور و درێژ  بەدوای شەمسدا ڕزگار کرد.

ئەم قەسیدەیەی نووسی:

سەد هەزار جار،

واز لە ئومێد دێنم،

ئومێد بەچی؟ بەشەمس،

وازم لە ئومێد هێنا.

لە هەمان کاغەزدا دەسخەتی سوڵتان وەلەدم ناسیەوە کە دوای ئەوە هاتووە:

**شەمسی تەورێز-ی لە شام نەبینی،**

**لە خۆیدا بەڕوونی وەك مانگ بینی.**

**وتی: لەگەڵ ئەوەی ئێمە زۆر لێی دوورین،**

**بەڵام هەردووكمان بەبێ جەستە و رۆحین، یەك نوورین.**

**تەماشای ئەو بكە ئەگەر ویستت، یان تەماشای من،**

**من ئەوم، ئەو منە، ئەی گەڕاو.**

**وتی: ئەگەر من ئەو بم، ئیتر بۆچی ئەگەڕێم؟**

**من خۆیم، ئێستا من باسی خۆم ئەكەم،**

**ئەی بۆچی زیاتر وەسفی جوانی ئەكەم،**

**ئەو جوانی و نیانییە خۆی هی منە.**

**من بەیەقینی  بەدوای خۆمدا ئەگەڕام،**

**وەك شەراب كە لە قازندا هەڵئەچێ،**

**شەراب لەپێناو كەسدا هەڵناچێ،**

**بەڵكو بەدوای جوانیی ئەودا هەوڵ ئەدا.**

گەڕانەوە نزیك بوو. ئەوەم دەزانی. جارێكیتر ژوورەكان و باخچە و سەرجەم رێڕەوەكانمان گسك دا و پاكمان كردنەوە. جارێكیتر، پشیلەكان و ئافرەتەكانمان لە ژوورەكانیاندا خەبەر كردەوە، رەنگە ئومێدیان بە دیداری دۆستانەتر بێ، لەبەرئەوە گەڕانەوە بۆ بازاڕ و چوونە گەرماو. كارەكەرەكەی كیرا بۆی باس كردم كە خانمەكەی گەشتر دەردەكەوێ. دیارنەبوونی دوایی شەمس هەموو دەرگاكانی واڵا كرد. بەڵام ئەوە بۆ چاودێریكردنی سەڵاح بوو، ئەو موریدەی نەگۆڕا، لە خەڵكی قۆنیە، كە هیچ سەرنجێكمان نەدەدایە.

## دەرگاکان دەخەمە سەر پشت

باسی رۆمیم کرد و تا توانای قسەکردنیشم هەبێ هەر باسی دەکەم. باسی شەمسم کرد و زیاتریش باسی دەکەم. باسی خۆمم کرد، بەپێی توانا کەمترین ئەندازە، بەڵام زیاتر باسی خۆم دەکەم. باسی زریانووسم کرد و زیاتریش باسی دەکەم. کەسێکیدی هەیە پێویستە ئێستا وەسفی بکەم تا بازنەی هاوڕێ نزیکەکان تەواو بکەم، ئەو پیاوەیش سەڵاحە، زێڕنگەرەکە.

سەرەتا رۆمی و سەڵاح یەك مورشیدی هاوبەشیان هەبوو، ئەویش تەرموزی بوو. هەردووکیان لە یەك تەمەندا بوون. هەردووکیان خوازیار بوون پریشکێك گڕی تێ بەربدات. بەلای سەڵاحەوە ئەو پریشکە تەنیا رۆمی بوو، کە لەکاتێکدا لەبارەی تەرموزیەوە –مورشیدە شاراوەکە– وتاری دەدە، بەچاوی دڵی بینی، سەڵاح گڕ دەگرێ. ئەو گەرمبوونەوەی بینی و زانی ئەو پیاوە گڕگرتووە ئەوە. بەڵام سەبارەت بە سووتانی خۆی، دەبوو ماوەیەکی زیاتر چاوەڕوان بکات تا بەشەمس دەگات.

بۆ ماوەیەکی زۆر من و کەسانیتریش دەمانپرسی چۆن دەکرێ خوتبەیەك دەربارەی تەرموزی کە رۆمی دای و دەیان باوەڕدار بیستیان، بەو قووڵاییە رۆبچێتە ناو رۆحی پیاوێك و وای لێبکات بنەماکانی لیاقە لەبیر بکات و کڵپە بسێنێ. پاشان هەمان پرسیار دەربارەی شەمس و رۆمیش کرا. چۆن دەکرێ ئەو وشە هێورکەرەوانەی لەنێوان دەروێشێکی پیری لەرزۆك و ئوستادێکی زانا و عارفدا ئاڵوگۆڕ کران، رۆمی، پاشان شەمس و پاشان ئەدەبی فارسی و لە کۆتاییشدا، رۆحی تەواوی گەل، بگۆڕن؟. ناتوانم وەڵامی ئەوە بدەمەوە. بەڵام ئەوە –لانیکەم بەلای منەوە– روونە کە خوا لە هەندێ بۆنەی لەم جۆرەدا بڕیاری داوە بۆ چەند ساتێك بەرجەستە ببێ. ئاخۆ رۆمی و شەمس لەو رۆژەی دوورەی ٢٦ی جەمادی دوایی ساڵی ٦٤٢دا چییان بینی؟ خوا خۆی یان خۆشەویست؟ ناتوانم وەڵامی ئەوە بدەمەوە. بەڵام قەناعەتی تەواوم بەوە هەیە کە بڵێسەکەی دیوە کە گڕی تێبەر دەدات و دەیسوتێنێ.

هەرچی سەڵاحی زێڕنگەرە، هەمان ئیدراك لەو رۆژی جومعەیە، لە مزگەوتی ئەبولفەزڵدا رووی دا، کاتێ رۆمی وتارەکەی دەدا. بەچاوە درەوشاوەکانی و گۆشتە بەخەڵوزبووەکەی قسەکانی بیست. پشکۆیەك کەوت بەسەریدا.

لەو رۆژەوە سەڵاح لە دەوروخولی مەولانا جیا نەبوویەوە و وادیار بوو بەوپەڕی دان بەخۆداگرتنەوە چاوەڕوانی ئەو ساتەی دەکرد رۆمی لە شەمس ببێتەوە و سەرەنجام روو لەو بکات. ئەو ساتە نزیك دەکەوتەوە. هەموومان دەمانتوانی هەست بەوە بکەین.

هەموو کۆك بووین لەسەر ئەوەی سەڵاح ناتوانێ بەباشی تەعبیر لە خۆی بکات، چونکە رۆژانی تەمەنی لە پشت ترازووەکەی لە دوکانەکەیدا لە بازاڕ، بەکێشانی ئەو ئاڵتونە بەسەر دەبرد، کە پاشتر شێوەیەکی دیاریکراوی پێ دەبەخشی. روانینەکەی، کەوتبایە هەر کوێ، جگە لە تیشك هیچیتری نەدەدی، شکانەوەی

کانزا و بەردە پیرۆزەکان. گوێکانی جگە لە تەقەتەقی کوتانی زێڕ و زیو هیچی نەدەبیست. چۆن توانی، لەو بارودۆخەدا فێری قیل و قاله ببێ؟ چۆن دەکرێ کەسێك لە باوکێکی ماسیگر لەدایك بووبێ وای لێبێ شارەزای رێساکانی زمان بێ؟ ئەو رستانەی دەربڕین تەنیا لێشاوێك هەڵە بوون، سەرباری ئەوەیش، مەولانا قەدەغەی کردبوو کەس ئاماژەیان بۆ بکات و راستیان بکاتەوە. پاشان کاتێ سەلاحی کرد بەهاوەڵی خۆی، بڕیاری دا وەك ئەو قسە بکات، بەوە ئەو هەڵە زمانەوانیانەی گۆڕی بۆ ئامرازی زۆر پێشکەوتووتری دەربڕین. پاشان هەموو شار کەوتنە لاساییکردنەوەی مەولانا و ئیتر بەشێوەیەکی هەڵە قسەیان دەکرد. من لەو رووە لە منداڵیمەوە تێکەڵی پیاوانی زانا و خوێندەوارم کردوە، لە چەند بۆنەیەکدا خۆمم دەبینی وەك سەلاح هەندێ وشەم دەشێواند.

جارێکیان شەمسی تەورێزی پێی وتم: "وشەکانی زێڕنگەرەکە مشەوەشم دەکەن".

ئەویش وەك رۆمی سەلاحی بە کائینێك دەبینی کە هاوڕێکیی وشەکان و جوانیی زمانی تێدەپەڕێنێ. سەلاح "ئەڵقەی کلیلەکان بوو کە دەرگاکان دەخاتە سەر پشت"، ئەو خۆی بایەخێکی زۆری بە بەهەڵە گۆکردنی وشەکان نەدەدا، بەڵکو زۆری نەبرد، لەژێر باڵی رۆمیدا بینی، دەستەبژێری شار لاسایی دەکەنەوە.

کاتێ جاری گەڕانەوەی رۆمی درا، سەلاح رووی کردە ماڵەکەی، کە لە رابردوودا دوو خۆشەویستەکە خەڵوەتیان تێدا کێشا و هەرچی ئاسەواری شەمس هەبوو سڕیەوە. کەواکانی و ملپێچەکانی و مێزەرەکانی و نەعلەکانی خرانە سندوقێك و نێردران بۆ گوند، هەروەها سێتی شەترەنجەکەی شەمس درایە خێزانی ژنی پێشووی (کیمیا)، کە شەمس لە ماوەی کورتی ژیانی هاوسەرییاندا بەسەریدا زاڵ بوو و "بەزاندی".

وتارەکانی دران بە زریانوس کە لەکۆتاییدا گەیشتنە دەستی من. بەم شێوەیە توانیم تێبینیەکانم تەواو بکەم. لە ماوەی ئەو ساتانەی شپرزیدا پێش دووەم گەڕانەوە لە دیمەشق سەلاح تاکە کەس بوو خۆی بۆ ئەوەی پاش شەمس هات ئامادە کرد. گومان لەوەدا نیە لە ناخی خۆیدا هەستی دەکرد ئەو میراتگرەکەیە، لەبەرئەوە سەرەنجام خۆی ئامادە کرد تا جێگەی باڵندەکە بگرێتەوە.

مەولانا گەڕایەوە و سەمای بیستن و کەیفخۆشی کە وەك جانەوەرێکی زیانبەخش لە ماڵەکە دەرکرابوون، گەڕانەوە. دەمتوانی هەندێ جار گوێم لە تریقەی پێکەنینی ئافرەتان بێ لەناو ژوورەکانیاندا. زریانوس خۆی لەڕێی شاشیی حیجابەکەوە هەردوو برۆ باریکەکەی کێرا و برژانگە چەماوەکانی و چاوە بەکل رەشتووەکانی بینی.

شەمسی ئازارچەشتوو، شەمسی زوو تووڕە و شڵەژاو، بواری بۆ سەلاحی هێمن و لەسەرخۆ کردەوە. قەت نەمانزانی کەی و چۆن ئاشتەوایی کرا، بەڵام دەتوانم بڵێم یەکگرتن لەگەڵ سەلاح کتوپڕ یاخود لابەلایی نەبوو. بەئاسانی و بەبێ دەرکەوتنی هیچ شتێکی نائاسایی رووی داوە. کتێب نەخرانەوە ئاو و بەسەلامەتی

بێنە دەرەوە، هەروەها بڵێسەی ئاگر لەپڕ کتێبی قووت نەدا و پاشان بەموعجیزەیەك بگەڕێنەوە دۆخی یەکەمیان.
سوڵتان وەلەد گۆڕانی لە شەمسەوە بۆ سەلاح بەم شێوەیە پاساودا:

**هاوڕێکە هەر خۆی ئەبێ،**
**بەڵام چاکەتەکە ئەگۆڕێ،**
**چاکەتە کۆنەکە ئەدڕێ و**
**جارێکیدی دەرئەکەوێتەوە.**

**شەرابەکە هەر خۆی ئەبێ،**
**بەڵام جامەکەی ئەگۆڕێ،**
**بڕوانە بۆ ئەو شادییەی،**
**پێی ئەدا لە سەری مەیگێڕ.**

**واز بێنە لە باسی زیندووبوونەوە،**
**با باسی یەکگرتنی تەواو بکەین،**
**لەو شەپۆلدانە،**
**دەریایەکی هار پەیدا بوو.**

سەلاح پاش بەخەڵۆزبوون و سووتان بەم شێوەیە دەرکەوت. ئارامییەکەی زۆر لە هەڵقوڵینی روبارێکی هێمن و بەتاڵ لە بیرۆکەی پردی خاپوور، درەختی لەریشك دەرهاتوو، تەرمی کفنکراو کە لافاو رایاندەماڵێ، دەچێ. بەڵێ، دەکرێ سەلاح بەجەستەیەکی هێمن لە ئاو دابنرێ، ئاو پاش ئاگر، سەلاح دوای شەمس، هەروەها وەك ناوی هەریەکەیان ئاماژە دەکات "تەبایی" دوای "شەمس".
لەناو کۆمەڵەی بازنەی یەکەمی دڵسۆزان، زریانوس سەلاحی بەدوو چاوی داخراو پەسەند کرد. دڵسۆزیی هاوڕێ یۆنانیەکەم بۆ مەولانا لە هەر هەڵبژاردنێکی شەخسی، لە هەر هەستکردنێك بە ئیرادەی ئازاد، گەورەتر بوو. لەو ساتەوە چاوی رۆمی دەکەوێتە سەر کەسێك، لەو ساتەوە ئەو کەسە هەڵبژێردراوە دەستبەجێ دەبێتە کەسە رێزدارەکە لای زریانووس. لەبەرئەوە هیچ دوودڵ نەبوو لە شوێنکەوتنی سەلاح. من هەندێ زیاتر دوودڵ بووم لە قبوڵکردندا، بەڵام ئاینده بەرەنگاریکردنە بێمانا و راگوزەرەکەمی شەلوپەت کرد، چونکە دوای مردنی سەلاح، وەك باسم کرد، ئەو پیاوەی جێگەی ئەو ئاوە هێمنە دەگرێتەوە من دەبم، حوسام.

هەرچی سوڵتان وەلەد بوو کاردانەوەکەی عەقڵانی بوو، چونکە ئەو کوڕە چاکە سەڵاحی بە مەرهەمی برین، قسە بۆ لاڵ، تروسکایی روناکی بۆ نابینا، دادەنا. هەروەها باوکی، دوای ئەو ئازارە زۆرەی تووشی بوو، هێور دەکردەوە و پێی وابوو ئەوە بەهایەکی هەیە بەهیچ نرخێ ناخەملێنرێ. هەروەها سوڵتان وەلەد بوو کیرای لەوە خەبەردار کرد کە سەڵاحی لەسەرخۆ و هێمن شوێنی شەمس دەگرێتەوە و پێویستە نیگەران نەبێ.

ئەمە بەلای ئافرەتانەوە چی دەگەیاند؟ رەزامەندی؟ رازیبوون؟ هێشتا دەپرسم. سەبارەت بەم گۆڕانە لە پیاوێکەوە بۆ یەکێکیکتر چییان وت؟ نازانم. بەڵام هەرگیز گوێم لە هیچ ئافرەتێکیان نەبوو بڵێ ئافرەت بۆ پیاو خەلق کراوە و پیاو بۆ ئافرەت خەلق کراوە، تەنیا بۆ ئەو. وابزانم مەسیحیەکان وا دەڵێن.

بەڵام سەبارەت بەم شتانە، هەمان وانەمان لە خواوە پێنەگەیشت.

مەولانا لە نووسینی قەسیدە لەبارەی شەمس و ناوبردنی لەکاتی خولانەوەیدا نەوەستا. بەڵام ئیتر ئەو کەسەی دوای تەواوبوونی سەمای بیستن دەستی کرد بە شێلانی پێکانی و ئارەقی وشك دەکردەوە، پێی دەوترێ سەڵاح. پاڕانەوەکانی رۆمی زۆر لە پاڕانەوەی ئاراستەکراو بۆ زاتی ئیلاهی دەچوون، یان رەنگە بۆ خۆی. بەڵام من هەندێ جار دەمپرسی بەڕاست شەمس لەکوێیە: ئایا لە شوێنێکیتر هەیە لە دەرەوەی ناخی رۆمی؟ ئایا هێشتا بە هەڵکردنی شنەبایەك هەڵدەلەرزێ؟ ئایا هێشتا پەنجەکانی بە مرەکەب رەش دەبن؟ ئایا هێشتا سەودا لەگەڵ ئەو سەردانیکەرانە دەکات کە دەیانەوێ رۆمی ببینن؟ "وتارەکانی شەمسی تەورێزی" ماوەیەکی زۆر بەبێ ئەوەی تەواو بن، مانەوە. کەس قسەکانیم بۆ ناگوێزێتەوە، من خۆم لەکاتی گەڕان بەناو توێژاڵەکانی زاکیرەمدا وشەکانیم دەقاودەق گواستەوە، سەرجەم "وتارەکانی".

سەردەمی شەمس بەرەو پوکانەوە دەچوو، ئیتر دەبووە بەشێك لە رابردوو.

لە رۆژێکی بەهاردا کاتێ خونچەی گوڵان و باڵندەکان و ئاسمان کۆتاییهاتنی وەرزی ساردی زستانیان رادەگەیاند، مەولانا هەموومانی لە ژوورەکەیدا کە پاش دەرکەوتنی سەڵاح تەواو گۆڕابوو، کۆکردەوە. ئەو کتێبانەی شەمس فرێی دابوون گەڕانەوە بۆ سەر رەفەکانی ژوورەکە کە داخرابوو و ئیتر وەك جاران بەکار دەهێنران. هەروەها ئەو ئاگردانە گوێزرایەوە کە بەهاوین و زستان پڕ دەکرا لە خەڵوز بۆ گەرمکردنەوەی شەمس کە بەبەردەوامی هەست بەسەرما دەکرد و لە ژێرخانێکدا هەڵگیرا. فەرش و پشتی بەدرێژایی دیوارەکە راخران تا سەردانیکەران وەك جاری جاران ئاسوودە دابنیشن.

لەو رۆژەدا، مەولانا کە دەستی سەڵاحی گرتبوو پێی وتین وەك شێخ لەسەر رێچکەکەمان دایدەمەزرێنێ تا ببێتە مورشید و مامۆستا و سەرمەشقمان. داوای لێ کردین شوێن ئەو پیاوە نەخوێندەوارە بکەوین کە نەیدەتوانی وشەکان بەڕاستی دەربڕێ. لەباتی قفڵ دەیوت "قلف"، لەباتی "مبتلی" دەیوت "مفتلی" و بەو شێوەیە.

بەڵام ملکەچ بووین. دەمانزانی بەرەنگاری و دوژمنایەتیکردن لە دەرەوەوە دێ، لە سەرجەم بازرگانانی بازاڕ کە زێڕنگەرەکە بە رکابەری خۆیان دادەنێن، لەلایەن پیشەوەرەکانیترەوە، لە نەحویەکانەوە کە رازی نابن پیاوێکی نەزان ببێتە گەورەیان.

لەو رۆژەدا، لە بارێکدا دەستی بەدەستی سەلاحەوە بوو، مەولانا وتی: "لەم دنیایەدا بایەخدانم بەکەسێك نیە، جا ئەگەر نهێنی شێخ لە سەرمدا دەرکەوت، هیچ باڵندەیەك لە توانای فڕیندا هاوبەشیم ناکات. من دڵم باشە، لە خەڵك گۆشەگیر دەبم، کەسم ناوێ و با هیچ کەسێکیتر وەك مێش تەنگاوم نەکات، بڕۆن و داوای ویسالی سەلاح بکەن، داوای یەکگرتن لەگەڵ رۆحی بکەن. ئەگەر فریشتە بن سەر رادەوەشێنن، ئەگینا ئەگەر گومانیان لێکرد وەك شەیتان دەبن".

وەك ئاماژە بۆ ملکەچی، سوڵتان وەلەد —کە هێشتا هەڵژەنرابوو لە ئارەقی باوکی— یەکەم کەس بوو هاتە پێشەوە لە سەلاح و دەستی ماچ کرد. پاشان لە مەولانای پرسی:

"ئایا سەلاحت لەبەرئەوە خۆش دەوێ لەناو نوورەکانتدا دەسوڕێتەوە؟".

رۆمی وەلامی دایەوە: "من بەپاڵنەری کێشکردن و پەیوەندی خۆشم دەوێ. کەهرەمانی زەرد پووش رائەکێشێ بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کۆیان ئەکاتەوە. کەهرەمان خۆی لەخۆیدا هیچ شتێکیتر کێش ناکات لەبەر نەبوونی پەیوەندیەك بەیەکیانەوە ببەستێ، ئەمە بەسەر بەچکە وشترێکیشدا دەچەسپێ کە بەدوای دایکە گولبووەکەیدا غار دەدات. ئەگەر کەسێك ئەسپێکی عەرەبی رەسەنی هێنا کە نرخەکەی هەزار دینارە و بە بەچکە وشترەکەی وت: "لەباتیی ئەوەی بەدوای دایکتدا بچی بەدوای ئەم ئەسپەدا غاردە"، ئەوا بەچکە وشترەکە بەدوای ئەسپەکەدا راناکات و شوێنی ناکەوێ، چونکە پەیوەندیەك نیە وشتر و ئەسپ بەیەکەوە ببەستێتەوە. سەلاح لەبەر ئەو پەیوەندیەی یەکمان دەخات کێشم دەکات".

ئەو پەیوەندییەیە کە تەواو جیاوازە لەو پەیوەندیەی لەگەڵ شەمس یەکیخستبوون، رۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد. رۆمی تەبا دیار بوو لەگەڵ ئەو هێمنی و ئارامییەی لەکاتی بوونی شەمسدا لێی بێبەش بووبوو. ئەوە پرۆسەی چاکبوونەوە بوو، هەستکردنەکەی بە ئارامی و سەفا بۆ ئێمە گواستەوە و پیرۆزبایمان لە سەلاحی پیاوچاك کرد.

دوای سەردانی زۆری ئافرەتان بۆ گەرماو و بۆ بازاڕ و باخچە و باخەکان کە لەکاتی بوونی شەمسدا هەڵوەشێنرابوونەوە، زانیم میزاجی باش و رۆحی گاڵتەوگەپ و نوکتەبازی بۆ ژوورەکانی ئافرەتان گوێزراوەتەوە و سەلاح هەرچی لەتوانایدا بوایە دەیکرد بۆ ئەوەی خۆشی و شادی بخاتە دڵیان. ئەو خۆی خێزاندار و باوکی دوو کیژ بوو —یەکێکیان وەك باسم کرد ئاشقی سوڵتان وەلەد بوو— و زۆر لە شەمس زیاتر لە خواستەکانی ژیانی هاوسەرگیری تێدەگەیشت. سەرباری ئەو پەیوەندیەی هەردوو پیاوی یەکخستبوو، لە نرخاندن و رێزگرتنی ژنەکانیان نەدەوەستان. هەرچی کیرایە چارەنووسی رۆژانەی بریتی بوو سەرکزی و

بێبایەخی و پشتگوێخستن و دووری بوو هەرکات بیری بکەوتایەتەوە مێردەکەی لەگەڵ شەمسە "خۆشەویست بەبێ زەمان"، بەڵام لێی تووڕە نەدەبوو لەبەرئەوەی دەیزانی پەیوەندیی ئەو دووانە حەتمییە و ئەملاوئەولا هەڵناگرێ. کاتێ لافاوێکی بەهێز هەڵدەکات، بۆچی ماسیەکی بچوکی سادە بەرەنگاریی تەوژمەکە بکات؟ لەبەرئەوە خۆی لە ئاوەکەدا نوقم کرد تا گەردەلولەکە نەما، تا ئەوکاتەی سەڵاح هات.

سەبارەت بەو پەیوەندیەی مەولانا و سەڵاح، خەزوری ئایندەی، بەیەکەوە دەبەستێتەوە لە پرسیارکردن لە سوڵتان وەلەد کۆڵم نەدا. کاتێ زانی پرسیارەکەم لە فزولیەوە نیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە تۆماری دەکەم، لەپێناو تۆمارکردنی ژیانی ئەو پیاوەی تەواو دەزانێ کاریگەری زۆری لەسەر زۆر دڵ و عەقڵ دەکات، سامانێك زانیاری دامێ.

بۆ نموونە زانیم سەڵاح بە رۆمی وتوە بەر لە یەکگرتنیان، نوور لە چاوەکانیدا شاراوە بووە و ئەو لێی بێئاگا بووە، رۆمی بووە چاوەکانی کردۆتەوە و لەپڕ "نوور فەیزی کرد و دەریا جۆشا".

پێشتر هەندێ ئاماژەی جیاوازم بۆ ئەو "نوور"ە کرد کە سەڵاح بینی. ئەو خۆی راشکاوانە لەبارەی ئەو دیاردەیە کە من خۆم جارێکیان توانیم بەچاوی خۆم ببینم، قسەی کرد. کاتێ بەسواری هێسترەکەی دەچوو بۆ دوکانەکەی، لەپڕ ئاوڕی دایەوە و تەماشای رووی کردم، دوای ئەوەی شتێکی دەربارەی کتێبەکانم لە قۆنیە باس کرد، دوکانەکەی لە هەفتەیەکدا دوو رۆژ دەکردەوە، پێی وتم: "ئالێرە، لەبەر چاومدا دەریای نووری سپی وەستاوە".

هاتمە پێشەوە و هەوڵم دا شەپۆلەکان و هەڵکشان و داکشانی نوورەکە لە قووڵایی چاوەکانیدا باش ببینم، ئاماژەیەکم نەبینی بۆ دەریای نووری سپی، بەڵام لە گلێنەی چاویدا خۆمم بینی، خۆم بەتەنیا. ئەنجا جارێکیتر کەوتەوە قسەکردن دەربارەی ئەو کتێبفرۆشەی کتێبەکانی تەنیا بە کتێب کۆکەرەوەکان دەفرۆشت. پاشان وەستا و وەك ئەوەی شتێکی تەواو سروشتی بێ، وتی: "دەریای نووری شین دەبینم، دەریای نووری سەوز، دەریای نووری زەرد، ئێستا من دەریایەك بەڕەنگی دوکەڵ دەبینم".

وەستا. چاوەکانی داخست، پاشان کردنیەوە و وتی:

"حوسام، ئێستا دەریای رەش هەڵچوو".

جارێکیدی وەستا. پاشان وتی لە کتێبخانەی کەسێکدا بەناوی عەزیز زیاتر لە یەك ملیۆن بەرگ کتێب هەیە و پێش کەمێك نوسخیەکی زۆر دەگمەنی کتێبی "لۆژیکی باڵندە"ی عەتاری دەست کەوت بەنرخێك کە بەلای سەڵاحەوە گران بوو. دوای ئەوەی جارێکیدی وەستا، وتی عەزیز خۆی پێی وتوە پازدە دەستنووسیتری "لۆژیکی باڵندە" دوکانەکەیان رازاندۆتەوە، یەکێکیان بەدەسخەتی شاعیر خۆی نووسراوە. هیچیترم دەربارەی هەڵچوونی دەریای رەش نەزانی.

ئەو دە ساڵەی سەلاح لەگەڵ رۆمی بەسەری بردن رووداو و موفاجەئەی توندوتیژیان تێنەکەوت وەك لەو بیست و سێ مانگەی لەگەڵ شەمس بەسەری برد تێی کەوت. من تا ئەمڕۆیش هەر دەپرسم چۆن یەکگرتنێك کە دوو ساڵ کەمتری خایاند توانی ئەو ئەندازە گۆڕانە لە ژیانی رۆمی و ژیانی ئێمەدا، هەروەها ئەو روبارە مەزنە بەفوارەیە لە شیعری فارسیدا دروست بکات.

رۆژێکیان، یاوەری مەولانا بووم لە بازاڕ. خۆر روومەتە زەردەکەی درەوشاندبووەوە. ئەو هەستەم لەلا دروست بوو هەر تیشکێك دەچێتە ناو روومەتی شەڕ لەگەڵ رەنگزەردییە هەمیشەییەکەیدا دەکات. بەکەمی لە ژوورەکەی دەردەچوو و زۆر شەیدای شوێنە داخراوەکان بوو، وەك گەرماو. پزیشکانی شار کە زۆربەیان لە موریدەکانی بوون ئامۆژگارییان کرد بچێتە دەرەوە و هەوایەکی پاك هەڵبمژێ، سەیران بکات و روومەتی بداتە بەر خۆر، بەڵام گوێی بۆ نەدەگرتن. هەر کە تاریکی و شێی گەرماوەکانی بەجێ دەهێشت، یەکسەر دەگەڕایەوە بۆ ژوورە داخراوەکە کە سێبەر خێوەتی لەسەر هەڵدابوو و سەمای بیستنی تێدا ئەنجام دەدرا. بەیانیی ئەو رۆژە لەنزیك بازاڕ، بەبازاڕی مسگەراندا تێپەڕین کە تەشت و کترى و دەفر و قازانی مسین پڕاون، تیر و کەوان و شمشێر و رم و قەڵغان و جۆرەها چەکی تێدا دروست دەکرێ. لە چاوی مەولانادا کەمترین بایەخدانم بەو چەکانە نەدی. بەڵام کاتێ بەبەردەم دوکانەکانی دروستکردنی دەرزی و قەڵەمە کوتراوەکاندا تێپەڕین، رۆیشتنی هێواش کردەوە. بایەخدان بە پرۆسەی یەکخستنی بارستەکان و کون و دوورییەکانی هەر دەرزیەکی پێوە دیار بوو.

زۆر لە بازاڕی زێڕنگەرانەوە دوور نەبووین کە سەلاح ئیشی تێدا دەکرد. کاتێ رۆمی دوکانی دەرزیسازەکەی بەجێهێشت لە ناوەڕاستی کۆڵانە سەرەکیەکەدا وەستا، لەپڕ گوێی لە دەنگی تەقەتەقی زێڕنگەران بوو، مەولانا لە ناوەڕاستی بازاڕدا لەسەر ئاوازی ئەو تەقەتەقانە کەوتە خولانەوە.

لەو ساتەدا، سەلاح بەدەم هاوارکردنەوە لە دوکانەی هاتە دەرەوە، بەناو ئاپۆرای ئەڵقەبەستووی دەوری سەماکەرەدا خۆی گەیاند و سەری خستە بەرپێکانی رۆمی و لێوەکانی دا لە پەنجەی پێ موبارەکەکانی و لەهۆش خۆی چوو، بەڵێ لەهۆش چوو. دواتر لای سوڵتان وەلەد دانی بەوەدا نابوو نیگایەك لە جیهانی شاراوەوە فەرمانی پێکردوە رێك لەو ساتانەدا دوکانەکەی بەجێ بێڵێ، لەبەرئەوەی رۆمی کە زۆر لێی دوور نەبوو، لە خولانەوەدا نوقم بووبوو.

لەسەر شۆستە بەرزەکەی بەردەم دوکانی کەرەستەکانی نەشتەرگەریدا مەولانام دی پرچ و روومەتی سەلاح ماچ دەکات، دەستی پێدا دێنێ، پاشان رایدەکێشێ بۆ سەماکردن، بەڵام سەلاح نەیتوانی پێ بەپێی ریتمی جوڵەکانی رۆمی بڕوات، لەبەرئەوە بازنەکەی بەجێهێشت و پێی وت: "من وەك مەولانا توانام نیە سەمای بیستن بکەم".

توندی زەبت و رەبت و زەحمەتی جەستەیی، جەستەی ئەو پیاوەیان زۆر لاواز کردبوو، کە بۆ چەندین ساڵ لە جەستەی تەنیا دەست و باڵەکانی لە جوڵەیەکی بەردەوامدا بۆ کوتانی زێڕ بەکار هێناوە. رایکرد بۆ دوکانەکەی و داوای لە کرێکارەکانی کرد لە کوتان نەوەستن تا رۆمی لە سەماکردن دەوەستێ، لەبەرئەوە ناچار بوون لە کوتان بەردەوام بن تەنانەت ئەگەر پلێتە ئاڵتونەکان شڕ و وڕیش ببن. کرێکارەکانی هەوڵیان دا بیری بخەنەوە کە کوتانی توند ئاڵتون لەناو دەبات، بەڵام گوێی بۆ نەگرتن، چونکە تاکە شت لەو ساتەدا بەلای سەلاحەوە گرنگ بوو خولانەوەی رۆمی بوو، ئەو خولانەوەیە کە نیوەڕۆ دەستی پێکرد تا نوێژی عەسر نەوەستا.

دوای ئەوە رۆمی رۆیشت، سەلاحی هێنا کە لە توندیی حیرەت و حەپەسانیدا جلەکانی دڕاندبوو، وەك چەند شریتێك بەدەوریدا شۆڕ بوویەوە و بازاڕەکەیان بەجێهێشت.

لە شوێنەکەم دابەزیم، هەوڵم دا حەشاماتەکە لە دوو پیاوەکە دوور بخەمەوە و لە کەسانی فزولی بیانپارێزم. وردە وردە سەرسامان بڵاوەیان لێکرد، لەگەڵ بانگداندا دوکانەکان داخران و بازاڕ چۆڵ بوو، یەکێك لە کرێکارەکانی سەلاح دوکانەکەی کڵۆم دا. لێی نزیك کەوتمەوە و لێم پرسی: ئەرێ ئاڵتونە کوتراوەکە چی بەسەر هات؟ وتی پلێتە ئاڵتونەکە تەلەف بوون، بۆ چەند ساتێك وا هاتە پێش چاوی ئەو کەرەستانەی بەکاریان دێنن بەئاڵتون داپۆشراون، پاشان کلیلەکەی خستە گیرفانی و رۆیشت و لە تاریکی شەودا ون بوو.

رۆژی دواتر کاتێ دەربارەی کۆتایی ئەو رۆژە پڕ لە سەیر و سەمەرەیە پرسیارم لە سوڵتان وەلەد کرد، دەقاودەق پێی وتم رۆمی هەمان شێوەکانی خۆشەویستی، هەمان چاکە کە بەسەر شەمسی تەورێزیدا رژاندبوو پێشکەش بە سەلاحیشی کردن. لەپڕ دڵم هەرەسی هێنا. رەنگە لە غیرە یان ئیرەییەوە بووبێ، تەواو دڵنیا نیم. بەڵام لەوەیش ترسام هەستی تووڕەیی و دوژمنایەتی لە تەواوی شارەکەدا پەرە بسێنێ، رێك وەك ئەوکاتەی شەمس لێرە بوو، ئەو شارەی نەیدەویست مورشیدەکەی خۆی ببەخشێتە یەك پیاو. ئەم هەستە قووڵ بوویەوە، لەبەرئەوەی ئەو پیاوە پیاوێکی ئاسایی بوو، پیاوێك رێك وەك ئێمەیە.

لەکاتکی درەنگی ئەو رۆژەدا گوێم لە یەکێك لە هاوڕێکانمان بوو قسەکانی سوڵتان وەلەدی دەشێواند. دەستەواژەی "شێوەکانی خۆشەویستی" لە دەمیدا گۆڕا بۆ "هاوڕێیەتی". بەڵێ، هەوڵیان دەدا، لەژێر سەقفی مەولانا و لەکاتی ژیانیدا قسە و کارەکانی دەستکاری بکەن و بیانشێوێنن.

بەزۆری گوێم لە دەستەواژەی "عیشقی ئیلاهی" دەبوو. لە هەموو شوێنێك دەمپرسی ئەوە مانای چییە. راستیەکەی من نەمدەتوانی لە ماناکەی تێبگەم، تەواو دڵنیا نەبووم لەوەی خوا عاشقی پیاوان دەبێ، لەبەرئەوەی یەك و بێ شەریکە، بەڕاستی وا نابینم بکرێ عاشق ببێ. هەروەك کەس ناتوانێ لێی بپرسێ. بەڵام هەندێ جار ئەو هەستەم لەلا دروست دەبوو کە ئەو رۆمی و شەمس و سەلاحیشی خۆشویستوە.

هەندێ جار بە خۆمم دەوت لەو دەربڕینەدا کە شاعیران زیادەڕەوییان لە بەکارهێنانیدا کردوە، پێویستە وشەی "عیشق" بیمانا جەستەییە رووتەکەی وەربگیرێ، وەك ئەوەی بڵێین "جنسی ئیلاهی". یۆنانیەکان باوەڕیان بەوە هەبوو، هەروەها هنیدیەکانیش کە بڕوایان بە بیروباوەڕی پڕوپوچ هەیە، بەڵام هەندێ نیشانەی راستییان تێدایە، بۆ نموونە دەڵێن خواوەندەکان غیرە لە پیاوان دەکەن لەبەر ئەو چێژە جەستەییەی کە تەنها ئێمەی پیاو هەستی پێ دەکەین. غیرە لە پیاوان و بەڕادەیەکی زیاتریش لە ئافرەتان دەکەن، چونکە چێژی ئافرەتان، وەك هیندیەکان و هەروەها یۆنانیەکان دەڵێن، لە هەر خۆشیەکیتر لە هەر سێ جیهانەکەدا، خۆشترە.

رەنگە لەبەر ئەم هۆیە بێ لە بەهەشت پەری (حۆری) بێئەندازە جوان پێشوازی لە باوەڕداران دەکەن دوای مردنیان، وەك ئەوەی چێژی سێکس باڵاترین پاداشت بێ بۆ ژیانێکی پڕ لە تەقوا و ئیستیقامە. کاتێ ئەم ئەفکارانە دەخەمە لاوە —کە دەزانم وەڵامێکی روونیان نیە— بیر لە مەولانا و ئەو عیشقە گەورە دەکەمەوە کە دایگرت کاتێ شەمسی تەورێزی بینی، هەستێك دامدەگرێ کە چێژی جەستەیی رۆڵێکی لەوەدا هەیە. تەواو دەرك بەوە دەکەم هەندێ عەقڵ یەکگرتنی جەستەیی بە شتێکی بازاڕی و بێزراو و بگرە رەنگە مەترسیدار دابنێن —ئەوە هەستێکە لەناو مەسیحیەکاندا زۆر بڵاوە کە لەبیریان چووە ئەو مەسیحەی ویستیان بیگۆڕن بۆ خواوەند، "قوتابیەکی خۆشەویست"ی هەبوو و قەت هاوسەرگیری نەکرد— و دەڵێن ناکرێ باوەڕ بە پەیوەندیی خۆشەویستی بکرێ لەنێوان شەمس و رۆمی و لەنێوان سەلاح و رۆمیدا و دەڵێن پێویستە ئەو بیرۆکەیە تەنها وەك خوازە (استعارە)یەك دابنرێ، چونکە ئەو یەکگرتنە لە سروشتدا یەکگرتنێکی جەستەیی نیە، بەڵکو یەکگرتنێکی رۆحییە پڕ لە خۆشەویستی و سۆز و ئەو جۆرە شتانە. بەدڵنیاییەوە من لەو بۆچوونەدا هاوڕایان نیم، چونکە من بەدرێژایی ئەو ساڵانە زۆر لە رۆمی نزیك بووم. بینیومە گۆرانی وتوە و سەمای کردوە و چین چین ئارەقی دەرداوە، لە توندیی نەشوە و شادیدا هاوار دەکات و بەبەرچاوی خەڵکەوە جلەکانی دادەکەنێ و فڕێیان دەدات. لەپڕ رێگە بە وشەکان دەدات، ئەو وشانەی لە دنیاکەیترەوە دێن، کە لە لێوەکانیەوە هەڵبقوڵێن. من دەڵێم ئەو پیاوێك بوو جەستەیەکی ئاسایی هەبوو، دەبێ مەزنیی راستەقینەی لەم شتەدا شارابێتەوە.

توانی دوالیزمەی عەقڵ و جەستە تێبپەڕێنێ. ژیان و فیکر و هەستکردنی یەکخست. ئەو سەرچاوە خاوێنەی دۆزیەوە کە ناکرێ هیچی رەفز یان زەم بکرێ. بەڵێ، بەلای شەمسەوە ئەو "مۆم"ێك بوو، ئەو مۆمەیش هیچ لە روناکیی خۆی لەدەست نەدا. ئەوە بەسەر پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئافرەتانیشدا پیادە دەبێ. کەسی دوور نەدەخستەوە. شتێکی بەرز و شتێکی نزم نەبوو. هیچ قیزەون نیە. هیچیش پاك و خاوێن نیە. کاتێ خۆشەویستی دۆزیەوە وەك مەزنترین نیعمەت قبوڵی کرد —لەگەڵ شەمس دۆزیەوە وەك ئەو ئاگرەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و حاسڵاتێك دەسوتێنێ. لای سەلاح دۆزیەوە،..وتی بەڵێ ئەوە عیشقی ئیلاهییە، ئەو

وشانە هێزێکی ئاشکرایان تێدا بوو کاتێ لە دوو لێوە کراوەکانیەوە بەرز دەبوونەوە. تەنانەت وتی ئێمە پێویستە گوزارشت لەو خۆشییە بکەین کە وەریدەگرین ئەگینا دەبێتە ئازار و پەشیمانی بۆمان. هەروەها وتی خۆشیی جەستە عەقڵ دەوڵەمەند دەکات وەك ئەو ئاو بارانەی لە ناخی زەویدا نیشتوە. ئەمەی وت و ئەوەی وت. هەزار شتی وت، کە پەشیمانم کە لەسەر کاغەز تۆمارم نەکردن، چونکە قەڵەمەکەم بەبەراورد بە قەڵەمەکەی ئەو زۆر لاوازە. هیچم بۆ نەماوەتەوە جگە لە هەندێ هەستی بەهێز، تیژ، بەڵام جەموجۆر نەکراون، بەزەحمەت دەتوانم جەموجۆریان بکەن و رێکیان بخەم.

جگە لەوە، ئایا پێویستە تەرتیبیان بکەم و رێکیان بخەم؟ وانازانم. شەمس خۆشیویست، شەمس کردی بەهی خۆی، سەلاحیش باوەشی پێدا کرد. مەولانا گۆرانیەکی نایاب بوو ئاسمان و زەوی تێدا ئاشکرا بوو، دوور لە هەر پیاهەڵدان یان لۆمەکردنێك. لەبیری چوو تەنیا پیاوێك بێ. حاڵەتی خۆی تێپەڕاند. ئەو یەکێتیی کائینات بوو.

هەندێ جار وام دەبینی خوا سەلاحی خۆش دەوێ. ئەوەم جارانی جاران دووبارە کردەوە، سەلاح، زێڕنگەر، جەستە لاواز، لە بازاڕی قۆنیە کە هیچ لەو سیفەت و تایبەتمەندیانەی نەبوو لە شەمسدا هەبوون، گاڵتەی پێدەکرا لەبەرئەوەی هەڵەی زەقی لە گۆکردنی وشەکان و لە رێساکانی زماندا دەکرد. سەلاح لەوانە تووڕە نەدەبوو کە زەمیان دەکرد. بەدرێژایی ئەو دە ساڵی ئولفەتە، هەرگیز بەتووڕەیی نەمدیوە.

وادەهاتە بەرچاو بەرجەستەی سەفا و ئۆقرەییە، ئەوەش ئەو شتە بوو مەولانا پاش رزگاربوونی لە گەردەلولی شەمس زۆر پێویستی پێی بوو. سەرەڕای پیشەکەی، کە یەکێکە لە بەربڵاوترین پیشەکان، بێ زانست و رۆشنبیرییەکەی و هێمنیەکەی، ئەوەی پێچەوانەی هەڵچوون و گرژییەکانی شەمس بوو، وا دەهاتە پێش چاوم خوا سەلاحی خۆش دەوێ. بەڵێ سەلاح. جا لەبەرئەوەی خوا خۆشی دەوێ، رۆمی هەڵیبژارد. بەم مانایە مەولانا ئەو پیاوەی فریودا کە خوا پێشکەشی کرد.

رۆژێ لە رۆژەکانی زستان بوو. نەعلەکانم لە هەر هەنگاوێکدا پڕ دەبوون لە بەفر. سەقفی ئەو ئاودەستەی بەرەو لای دەچووم هێندە فشۆڵ بوو خەریك بوو لەژێر قورساییدا بچەمێمەوە. کاتێ نزیك کەوتمەوە، گوێم لێ بوو دەنگی جوێندانی لێ بەرز دەبووەوە. زانیم دەنگی سەلاحە. گوێم نووساند بەدیوار بەکلس سواق دراوەکە تا بزانم ئەو جوێنانە بەکێ دەدات. زۆر سەیر بوو! سەلاح سکاڵای لە خوا دەکرد کە تەنانەت لەو شوێنە پیسەیشدا وازی لێ ناهێنێ بەبێ بێوەی دابنیشێ. بەئەنقەست هەموو ئەو هەڵانەم تۆمار نەکرد کە لە قسەکەیدا، لە وتارەکەیدا، هاتن. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی وتی: "خودایە. من شەرم لە بوونت ئەکەم. خەڵکانێك ئەناسم لە خۆشەویستیدا ئەسووتێن و خۆیان، شەو و رۆژ، لە خەڵوەتگەکاندا ئەفەوتێنن، لە مەینەتیی جەستەیی و لە نوێژکردن بۆ تۆدا ئەژین. خەویان لێ ئەزڕێ تا رەزامەندیی تۆ بەدەست بێنن، کەچی تۆ کەمترین بایەخیان پێ نادەی و کێشەکانیان چارە ناکەی، بگرە تۆ خۆت ئەزیەت نادەی نیو

سەعاتیان لەگەڵ بەسەر ببەی. بەڵام من، وازم لیّ ناهێنی! تەنانەت لێرەیش! نوورە بێگەردەکانت سەرم لیّ ئەدەن تەنانەت لەم ئاودەستەیشدا".

پاشان بێدەنگ بوو. سەڵاح، تەنانەت کاتێك لەو شوێنەیشدایە، هەست بەخۆی لە بوونی خوادا دەکرد. من دڵنیام نەیدەزانی کەسێك چاودێری دەکات و ئەو لەڕاستیدا لەگەڵ بوونێکی نەبینراو دەدوا.

بەبێدەنگی دوور کەوتمەوە. ئەو رۆژەم بیر کەوتەوە رۆمی شەمس و کیمیای ژنی لە گەرمەی ساتە خۆشەکاندا لە ژووری نووستنەکەیاندا بینی، دەستبەجیّ بۆی دەرکەوت شەمس لە ژوورەکەدا بەتەنیایە. لێکدانەوەی شەمس بۆ ئەو حاڵەتە –وەك گەورەم گواستیەوە– ئەوە بوو خوای گەورە زۆر خۆشی دەویّ و خۆی بەو شێوەیەی ئەو بەلایەوە پەسەندە پیشان داوە، کە لێرەدا لە شێوەی کیمیادا بووە. لەبەرئەوە مەولانا بەچاوەکانی خۆی بینی خوا دەست لە شەمس دەدات، ماچی دەکات، دەست بەقژیدا دێنیّ. بەڵیّ، رۆمی خوای لە شێوەی ئافرەتێکی عاشقدا بینی.

هە ئێستا گوێم لە سەڵاح بوو جوێنی بەخوا دەدا و وەك عەشیقێکی راونراو و شەکەت داوای لیّ دەکات دەرفەتێکی بچوکی ئازادی پیّ ببەخشیّ تا دواجار هەست بکات بەتەنیایە. لەو رۆژەدا تێگەیشتم بۆچی رۆمی بەو خێراییە شەمسی گۆڕی. تێگەیشتم بۆچی مەولانا تا ئەو رادەیە رۆیشت کە ماوەیەك لەمەوبەر بەکوڕەکەی وت:

ئەو شەمسەی زۆر باسی ئەکەم،
گەڕایەوە لامان، ئیتر بۆچی هێشتا خەوتووە؟

جلەکانی گۆڕی و گەڕایەوە،
تا جوانیەکەی بخاتە روو و لە شکۆدا.

شەرابی رۆح کە لە کاسەکە ئەیخۆیتەوە،
هەمان شەراب نیە کە ئەکرێتە ناو بەرمیل.

بەرمیل و کاسە و جام تەنیا دەفری هەڵگرن،
کیّ مەی ئەناسیّ، ئەو شیاوە پیاو بیّ.

سوڵتان وەلەد کۆمێنتی لەسەر قەسیدەکە دا و وتی: "بوونەوەرە پێشکەوتوو و پارێزەرەکان لە دەفرە هەڵگر (حاویە)ەکان دەچن، بەڵام حەقیقەت و مەعریفە و خۆشەویستی، وەك مەی وان".

دوای چەند ساڵێك، لەکۆتاییدا تێگەیشتم پاش بەرمیل و کاسە، شەمس و سەلاح، جام هەر دەبێ من بم، پاش ئەوەی ئەو دەفرەی ڕۆمی تێیدا خواردیەوە جارێکیدی بوو بە شەرابی عیشق.
بەوریاییەکی زۆرەوە بۆ ئەوەی نەمبینێ، سەلاحم بەجێهێشت تا لە ئاودەست بێتە دەرەوە و دوای ئەو من چوومە ژوور، پاشان دەرچووم. لە حەوشەکە تێپەڕیم. پێکانم لە بەفردا دەچەقین و ڕۆحم ئاسوودە بوو لەبەرئەوەی دواجار توانیم پەردە لەسەر یەکێك لەو نهێنییانە هەڵبدەمەوە کە تێکەڵ بە شەیدابوونی ڕۆمی بۆ سەلاح بووبوو. رووم کردە ژوورەکەی مەولانا. هەردوو پیاوەکە تەماشای رووی یەکتریان دەکرد. ڕۆمی کاتێ زانی من لەبەر دەرگای ژوورەکەدا وەستاوم، بانگی کردمە ژوورەوە و بەدەم درێژەدان بە تەماشاکردنی زێڕنگەرەکەوە وتی:

**"تەماشای رووی سەلاحەدین بکە،**

**چ زاتێك، ئەو سوڵتانە هەقبینە.**

**بڕوانە بۆ مورشیدی جیهانی ڕۆح،**

**ئەو پاشای زەوییە، پاشای ناشوین".**

میراتگری شەمسم تێدا تێبینی کرد و بینی، مەقامی خوا، کە دڵۆپێك دەگۆڕێ بۆ مرواریەك، ئەو قاچاخچیەی ئەو خۆڵەی پێی پێدا دەنرێ دەگۆڕێ بۆ ئاڵتون، بووژێنەرەوەی دڵی ماندوو، بەخشەری ڕۆحی پاك، رزگارکەر لە مردن و فەنا، ڕێپیشاندەر بۆ عەرشی پاشای ئەبەدی، پیشاندانی سەرجەم نهێنیەکان، میعراج لە زەویەوە بۆ ئاسمان.... لەوەیش زیاتر.
هەموو شت سەبارەت بە سەلاح، زێرکوت، کوڕی ماسیگرەکە ڕۆشن بوویەوە. ئەو کەسە سادەی خەڵکی قۆنیە، خاوەنی دوکانە سادەکەی قاڵبڕێژی، شێخی شێخانم بەڕوونی بینی. فریشتەی خوا لەسەر زەوی. تەوەرەی کات، مەسیحی ڕۆحەکان، ڕۆحی سۆفیەکان، پاشای ئەولیای سۆفییان، فریشتەی پاسەوانی دڵان، ڕۆژهەڵاتی نوورەکان، خواوەندی هەوڵدەران بۆ عیشق و بۆ ڕێبوارانی ڕێگەی عیشق و وەك ناوەکەی ئاماژەی بۆ دەکات "سەلاحی زوهد".
بەفەزڵی یەکێك لە موریدە هیندییەکان، زانیم بینینێکی هاوشێوە وەك نزایەکی جیهانی، وەك تەزبیحێکی وشە کە دەوری جیهان دەدات، رووی دا، یەکێك لە پیاوچاکانی خوا بەخشی، یانی ناوی "رەش"ە. بیرم نەماوە. پێش سەرەتای شەڕێکی گەورە بۆ هاوڕێ دڵسۆزەکەی دەرکەوت. ئەو پیاوە بینی وەك ئەوەی ملیۆنان پیاو ببینێ کە خۆیان فڕێ دەدەنە ناو دەمی، بینی وەك ئەوەی مردن و ژیان ببینێ، وەك ئەوەی بێدەنگی دەبینێ، وەك ئەوەی ئەو توخمە بێ هەموو شتێکی تێدا کۆبوەتەوە. وەك کۆمەڵە مرواریەك لە دەزوویەکدا، وەك عەتری زەوی، گەرمای ئاگر، دەرکەوتن و بزربوون، رەونەقی شتە درەوشاوەکان، بگرە تەنانەت فێڵ و تەڵەکەی فریودەریش.

دەزانم ئەم جۆرە پاڕانەوانە کە بەراوردەکان و پێناسەکان دووقات دەکەن و پیاهەڵدانیش دووبارە دەبێتەوە، لەبەرئەوەی ناکرێ گوزارشت لەو شتە بکرێ کە هەڵبژێردراوە بۆ ئاهەنگگێڕان بەهەر کۆمەڵە وشە یان دەستەواژەیەك. وشەکان بەدوای لوغزدا دەگەڕێن بەبێ ئەوەی بتوانن پێی بگەن.

سەبارەت بەمەولانا کە چاوی لەسەر سەڵاح بەرز نەکردەوە، ئەمەم وت و هیچیتر "یەکێك لەویتردا دەبینم، شەمس لە سەڵاحدا دەبینم و هیچ شتێکیدی نابینم".

وای دەبینم هەموو شت پێشتر وتراوە.

ژوورەکەم بەجێهێشت. نەعلەکانم کە بەفر داپۆشیبوون بە قەراغی دەرگاکە تەکاند. لە دەرەوە چیتر ئەو زوقمەی شەمسی بێزار دەکرد بەلامەوە گرنگ نەبوو. شەمس لە رۆمیدا بوو، ئێستا لە سەڵاحدایە. ئەو "لەناو هەردووکیاندا بوو".

بەخۆمم وت پێویست بە هێمنی و ئارامی و بوونی سەڵاح هەبوو، تا توانای گواستنەوە بۆ ئەودیو بۆ پیاوێکی ئاسایی وەك من برەخسێ، بۆ ئەو ساتە کورتە کاتێ هەست دەکەین نیعمەت داماندەپۆشێ.

سەرباری تاوسەندنی شەمس، یان بەهۆی ئەوەوە، دەرفەتی وچانمان لەگەڵی نەبوو "خۆشەویست بەبێ زەمان"، هەستمان بە متمانە، بەپارێزراوی نەکرد. بەپێچەوانەوە، سەڵاح دەرفەتی بۆ رەخساندین بەئاسوودەیی تەواوی سلوکی سۆفییانە بنرخێنین.

لەبەرئەوە کاتێ تێڕوانینی تایبەتی خۆم سەبارەت بە زێڕنگەرەکە بۆ سوڵتان وەلەد وەسف کرد، پێی وتم ئەویش هەمان هەستی هەیە، بەڵام لەسەر داوای باوکی لەبەردەم سەڵاحدا "بەگوێڕایەڵیەوە سەری راوەشاند" و بەدرێژایی ژیانی بوو بە موریدی. داوام لێکرد ئەو ساتەم بۆ وەسف بکات، وەڵامی دایەوە: "وەك ئەوەی سەرخۆش بم، نوور جەستە و رۆحی داپۆشیم. هەستم نەکرد ئەوە زیانە، بەڵکو هەستم کرد کەمالێکی بێکۆتایە. رۆحم، ئەو دڵۆپە بچوکە هەژارە، بوو بە ئۆقیانووس. دڵم لە بنەوە چوو بۆ لوتکە و هزرەکان بەتێپەڕینی کات پەرەیان سەند. رۆحم پێکهات. لەو ساتەدا پێغەمبەرانم لە شێوەی مرۆڤدا بینی، بە سەر و دەست و پێکانیانەوە. کەوتمە باسکردنی نهێنی بۆیان: بێدار بوومەوە و بەزمانم، بە روخسارم لەگەڵیان دووام. حوسام، ئەوەی ئەو رۆژە دیم، ئەوانیتر تەنیا وەك بەشێکی زۆر بچوك دەیبینن، وەك سەرابێك، لە خەونێکدا".

زانیم سوڵتان وەلەدیش بینیویەتی، هەروەها زریانوس.

بەڵام ئەوانیدی، ئەوانەی لەپێناو قاودانی شەمسدا پیلانیان گێڕا، دڵپیسەکان، ئاسۆ تەسکەکان، کە لەسەرەتادا ئۆخەییان کرد بەنەمانی ئەو پیاوەی بە سەرچاوەی گشت سەرێشەکانیان دادەنا، سەڵاحیان بە ئامانجێکی نوێ بینی. هەرچی عەلای کوڕە لاسارەکەیە، باوکی لە ماڵ دەریکرد و تا مردنی ناوی بەسەر زمانی کەسدا نەهات.

جارێکیتر زمانەکان کەوتنەوە بەخراپی قسەکردن. درۆ و دەلەسە دەستیان بە بارین کرد. ئەوانەی رەخنەیان لە شەمس دەگرت لەبەرئەوەی ئەسڵ و فەسڵی نەناسراوە، هەروەها لەبەر چڵێسی و توندی و بێزاری و بێسەبری و بێباریی میزاجی، کەوتنە کوتانەوەی سەلاح لەبەرئەوەی پیاوێکی نەخوێندەوار و رەچەڵەکێکی سادەی هەیە. وتیان چۆن دەکرێ زانای زانایان شەیدای کەسێکی ئاسایی خەڵکی قۆنیە بێ، کە هەمووان بینیویانە کاتێ گەشەی کردوە و گەورە بووە؟ بیریان کەوتەوە کاتێ منداڵێك بوو یارمەتی باوکی دەدا لە هەڵدانی تۆڕی راوەکەدا، بیریان لە کارکردنی لە داڕشتنی ئاڵتون لە بازاڕدا دەکردەوە، کە بەقەرز داینابوو. ئەوانەی هەوڵیان دەدا نرخی کەم بکەنەوە، وەك پێشتریش کردیان، لەوە دوورتریش چوون و بەدوای ئەو کەسەدا دەگەڕان قەرزەکەی دابوویە. چۆن دەکرێ رۆمی فەرمان بە کوڕەکەی بکات شوێن پیاوێك بکەوێ قەرزی لە جولەکەیەك کردوە و پاش ماوەیەکی زۆر توانیویەتی نرخی سووەکە یەك لەسەد داببەزێنێ؟ چەنەبازان هەروەها وتیان سەلاح پارەکەی، ئەگەرچی زۆر کەمیش بوو، بەئامۆژگاریی ئەو جولەکانە دەنارد بۆ هیند، بۆ دەلهی، کە پاش هەڕەشەی پەلاماری مەغۆل بوو بەو پایتەختەی سەرجەم دوورخراوە و موسافیران پارەکانیان لە ناوچە جیاجیاکانی جیهانەوە بۆ دەنارد.

غەیبەتکەر و زمانپیسانیش کەونە تۆمەتبارکردنی مەولانا کە "وەك توانەوەی شەکر لە شیردا" لە سەلاحدا توایەوە و وتیان: "رۆمی لە سەلاح زیاتر کەس نابینێ، چاوەکانی لەسەر روومەتی کلا ناکات، جگە لەو گرنگی بەکەس نادات، شەو و رۆژ لەبەردەمیدا دەنوشتێتەوە. هەرچی هەیەتی بۆ ئەوە، بەئاڵتون دایدەپۆشێ، بەزیو، بە پۆشاکی جوان.. سامانێك کە ئەمەیتر دەینێرێ بۆ سەر حسابەکەی لە دەلهی. ئەم سەلاحە لە شەمس بەدترە. شەمس لانیکەم دەیزانی چۆن قسە دەکات و بەزمانێکی پاراو و جوان دەینووسی، بەڵام ئەمە لەبەینی خۆماندا گەورە بوو و پێگەیشت، نازانێ چۆن دەنووسێ، رێساکانی زمان یان دەربڕینی وشەکانی بەدروستی نازانێ. ناتوانێ وەڵامی سادەترین پرسیار بداتەوە. بەڵێ، ئێمە بیری شەمسی تەورێزی دەکەین".

بگرە هەندێکیتر لەوە زیاتریش چوون و وتیان: "ئەویتر هیچ نەبێ لە تەورێزەوە هاتبوو. خەڵکی قۆنیە نەبوو، یەکێك نەبوو لە خۆمان".

هەرچی سەلاحە، هەموو رۆژ بەردەوام دەچوو بۆ دوکانەکەی، دەیبینی ژمارەی مشتەریەکان رۆژ بەرۆژ کەم دەکات. قەرزەدەرەکەی ئاشکرای کرد نرخی سووی ئەو بڕە قەرزەی کەم کردۆتەوە کە پێی دابوو. ئەو باخچەوانەیش کاری لەلای دەکرد وازی لە کارەکە هێنا پاش ئەوەی لە کۆکردنەوەی زبڵ و خاشاك کە رێبواران فڕێیان دەدایە باخچەکەی، بێزار بوو. هەروەها لە کۆڵانەکانی شاردا، خەڵك پاڵیان پێوە دەنا و سووکایەتییان پێ دەکرد و سەرکزیان دەکرد و مامەڵەی کەسێکیان لەتەکدا دەکرد کە تێکەڵیی ئاژەڵانی کردوە، ئەمڕۆ وای لێهاتووە بەبچوکی تەماشای گەورە پیاوانی قەوم دەکرێ.

وەك ناسینی ناولەپی خۆی خەڵکی شارەکەی دەناسی و لە رق و کینەیان نەدەترسا. بەپێچەوانەی شەمس تووڕە نەدەبوو، بەڵکو گوێی بە دەربڕینەکانی دوژمنکاری بەرانبەری نەدەدا و هەوڵی دەدا پارێزگاری لە بەختەوەری و ئاسوودەییەکەی بکات. لەڕاستیدا گوێم لە سەلاح بوو، ئەو پیاوەی نەیوێرا هەوڵی ئاشکراکردنی ئەو جۆرە توانایە بدات، یەکێك لە چوارینە نایابەکانی خیام دەڵێتەوە:

**ئاگر لە خەمەکانماندا پریشکە،**

**بەهەشت ساتی ئارامیمانە.**

**رۆژگار لەژیانی رابردوومماندا ساتێکە**

**جیحۆن[٤] تەنیا دڵۆپێکە لە فرمێسکە پاکەکانمان.**

هەرگیز خۆی بەدەست خەمەوە نەدا. گوێی بەو دێوەزمانە نەدا دەیانگرت. دەتوانم جەخت لەوە بکەم، لەکاتێکدا مەولانا لە غیابی شەمسدا سووتا، ئەوە تەنیا "هێمنی"ی سەلاح بوو ئەوی بۆ گێڕاینەوە، بۆ شیعر هۆنینەوە، بۆ سەماکردن، بۆ ژیان. ئەگینا وەك هەر تاوسەندنێك، تاوسەندنەکەی گەشتێکی بێ گەڕانەوە دەبوو.

لەگەڵ ئەوەی سەلاح متمانەبەخۆ دیار بوو، پاش ئەوەی ترساین توندوتیژیەك رووبدات. ئەگەرچی سەلاح بەپێچەوانەوەی ئەوەی باس دەکرد، هاوشێوەی دۆخەکە لەگەڵ شەمس، تەمومژ و گومان، ئیددیعا و نهێنیبوون و درۆ و دەلەسە و دەرگاکان و جاسوسەکان ژیانی رۆژانەمانیان سەرقاڵ کردبوو.

ئێوارەی رۆژێکی هاوین، کاتێ پەردەکوللە رەنگ شین و سپی و زەعفەرانیەکان بەرهەیوان (بەلەکۆن)ـەکەیان رازاندبووەوە و بۆنی کیار، دەگمەنترین جۆرەکانی بخوری ژاپۆنی عەقڵمانی هێمن کردبوویەوە، زریانوس نایەکی بەدەستەوە گرت و ئاوازێکی بۆ ئەم قەسیدەیە ژەنی کە چەند رۆژێکە رۆمی بەسەرپێیی وتی:

**کێ هات، لە نیوەشەودا،**

**وەك تیشکی مانگ؟**

**پێغەمبەری عیشق لە شوێنی نوێژەوە،**

**هات.**

**مەشخەڵێك هات،**

**خەو ئەسووتێنێ.**

---

[٤] روبارێکە لە ناوەڕاستی ئاسیا.

لەو شوێنەوە پاشای پاشاکانی خەوی لێیە،

هات

ئەڵقەی هەندێ کلیل شۆڕ ئەبنەوە،

لەژێر هەردوو باڵی خۆشەویستیدا.

بۆ ئەوەی دەرگاکان بخاتە سەر پشت،

هات.

دەرگاوانەکە هاتە ژوورەوە تا هەواڵمان بداتێ پیاوێکی نەناس و هەناسەسوار دەیەوێ مەولانا ببینێ، هەروەها وتی ئەو پەیامەی هەڵیگرتوە ناکرێ چاوەڕوان بکات و نایشتوانێ بۆ کەسێکیتری ئاشکرا بکات، لەبەرئەوە رێگەی هاتنەژوورەوەی پێ درا.

ئەو پیاوەی هاتە ژوورەوە کورت و تێسپڕاو و تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ دەبوو، کەمێك دەشەلی. بەزمانێکی شەقوشڕی فارسی قسەی دەکرد. وادیار بوو سڵی لە ئامادەبووان دەکردەوە. چاوەکانی لە خاڵێکەوە دەیانگواستەوە بۆ خاڵێکیدی. پاشان لەپڕ بێدەنگ بوو و نینۆنەکانی کەوتنە چەقین لە گۆشتەکەی، پاش سڵاو و بەخێرهاتنی ئاسایی و چەمانەوە، دەستی بەقسە کرد:

"مەولانا ناتوانم زۆر بمێنمەوە، من سەرکێشی بەژیانی خۆم دەکەم ئەگەر کەسێك هەواڵم لێ بدات. هیچ کاتم نیە تەنیا بۆ ئەوە نەبێ پێتان رابگەیەنم ژیانی شێخ سەڵاح لە مەترسیدایە و پیلانێك بۆ دەستدرێژیکردنە سەری دادەڕێژرێ. تاقمێك لە پیلانگێڕان بەنیازن بیڕفێنن، بەندی بکەن و ئەشکەنجەی بدەن و پاشان بیکوژن".

قسەکانی تەواو نەکردبوو سەڵاح دایە قاقای پێکەنین و ئامادەبووانی حەپەساند. بەدەنگێکی زیندوو و بەبێ هیچ نیشانەیەکی ترس وتی: "ئەو کوێرانەی دەستیان بە پیلانگێڕان لەدژی من کردوە، نازانن ئەوان ناتوانن هیچ شتێك دژی ویستی خوا بکەن. ئەگەر خوا بمپارێزێ کەس ناتوانێ بمکوژێ یان لە خوێندا بمگەوزێنێ. ئێوە پێتان وایە من کەسێکی بێنرخم لەم دنیایەدا، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی لە دڵمدا ئەتەقێتەوە ئەبێتە ئۆقیانووسێك. ئەگەر پاشام، گەورەم لە ناوەوە بمهێڵێتەوە، ئیتر بۆچی دەربچم، بۆچی خۆم لای دەرگاکەدا خۆم دەربخەم؟".

ئەو دەستەواژەیەی کۆتایی ئۆغرکردنی شەمس و رێگەدانی رۆمی بە بەجێهێشتنی ماڵەکەی بیر خستمەوە، لەکاتێکدا لەوانە بوو لەودیوی دیوارەکەوە بەمردوویی بیبینێتەوە. دیار بوو سەڵاح ئاماژەی بۆ ئەو رەزامەندییە دەکرد. وەك شەمس، دەیزانی ئەو خۆشەویستە، بەڵام جیاواز لە شەمس ئەوەیشی دەزانی

مەولانا دەستی لێ هەڵناگرێ. ئەگەرچی رۆیشتنی یەکەم بۆ رۆمی زەرور بوو، ئەوا بوونی هەمیشەیی دووەم هێوری کردەوە و ئاسوودەی کرد.

بۆ چەند ساتێك بیرم بەم بیرۆکانەوە پەرت بوو. بەزەحمەت توانیم بگەڕێمەوە و دەست بەسەرەداوی ئەوەوە بگرمەوە سەلاح دەیوت.

"من ئەو ئاوێنەیەم رۆمی رووی خۆی تێدا ئەبینێ. چۆن، ئەوەی عاشقی جوانیی خۆیەتی، دەتوانێ شتێکیتر بکات جگە لەوەی خۆی هەڵبژێرێ؟ دوالیزمە لەنێوانماندا نیە، ئێمە یەکین".

لە دەمی سەلاحەوە هەمان ئەو قسانەم بیست کە رۆمی لەبارەی شەمسەوە وتنی. لەبەرچاوانمدا خۆشەویستی و خۆشەویست و خۆشویستراو تێکەڵ و پێکەڵ بوون و لە گێژاوی وشەکاندا بوون بە یەك.

پیاوە هەواڵهێنەکە مۆڵەتی خواست و پرسی ئاخۆ جگە لە دەروازە سەرەکیەکە دەرگایەکیتر هەیە بتوانێ لێیەوە بچێتە دەرەوە. یاوەریمان کرد بۆ دەرگایەکی نهێنی لە ژێرزەمینەکەدا، کە چێشتخانەکە بە کۆلانێك دەگەیەنێ، لێیەوە دەچیتە لوتکەی گردەکە.

سەرەڕای دڵنیاییەکەی سەلاح، رۆمی فەرمانی پێکردم ئیحتیاتی پێویست بۆ پاراستنمان بگرمە بەر. رۆژ دوای رۆژ ئەو رێوشوێنانەمان پیادە دەکرد کە سەروەختی بوونی شەمس لەنێوماندا بەکارمان دەهێنان: کەوتینە وردبوونەوە لە ناسنامەی هەرکەس بێتە ناومان، هەندێ سەردانیکەرمان رەت دەکردەوە، لە بەیەکگەیشتن وەستاین و هاتوچۆمان سنووردار کرد. سەلاح بەبڕیارەکەی رۆمی رازی بوو و بەکۆی دەنگ بڕیارمان دا وریا بین و بۆ خۆلادان لە مەترسی و نەوروژاندنی ژیرانەتر رەفتار بکەین، تەنانەت ئەگەر وایش هەستمان بکردایە لەژێر پارێزگاریی خوای گەورە و بەدەسەلاتداین.

کەس لە بازاڕی دارێژەران سەمای بیستنی ئەنجام نەدا، کەس لە شاردا مورشیدە رۆحیەکەی نەدەدی کە لە قسەکردندا تەتەڵە و لە گۆکردندا هەڵە دەکات.

ئەمە وایکرد پیلانگێڕان شپرزە بن. لە شاردا دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کە پیلانگێڕان هێور بوونەتەوە و کەناریان گرتوە. ئەو دیوارە شاراوەیەی بەدەوری خۆماندا دروست کرد کاری خۆی کرد و یەك بەدوای یەك راوینان. لە هەرکوێی شەقامدا ببینرانایە نیگەرانی و ماندوێتییان بەڕوونی پێوە دیار بوو، کز و داماو بوون. بگرە دەنگۆیەك بڵاو بوویەوە کە زۆریان خەویان لێ تۆراوە.

رۆژێکیان پیلانگێڕانی پێشوو و ژمارەیەك خەڵکیتر لەبەردەم دەرگای قوتابخانەدا کۆبوونەوە. نیگەرانی بە روخساریانەوە دیار بوو. سەریان شۆڕ کردبوو. بەچاوی پڕ فرمێسك و دەنگێکی لەرزۆکەوە داوایان لە مەولانا کرد بیانبەخشێ و جارێکیتر گوێڕایەڵییان بۆ دووپات کردەوە. ئەوە چەند سەعاتێك درێژەی کێشا. رۆمی هیچ کاردانەوەیەکی پێوە دەرنەکەوت. تەنانەت زریانوس، ئەو پیاوەی سەرسەختانە رقی لە

حەسودان بوو، هەندێ دڵی نەرم بوو، دیم فرمێسك بە رووومەتە باریکەکەیدا، کە ریشێکی تەنکی رەش دایپۆشیبوو کە هێشتا تاڵی سپی تێیدا دەگمەن بوو، هۆن هۆن دێنە خوارەوە.

لەکاتێکدا لە مێشکی خۆمدا تاڵە سپیەکانیم دەژمارد: دوو تاڵ لە گۆشەی چەپی لێوەکانی، یەکێك لەسەر چەناکەی، لێم پرسی بۆچی خۆی بەستەوە دا، پێی وتم: "هەستکردنی ئەوانە بەگۆشەگیری بەردەکانی دڵمی وەك مۆم تواندەوە".

مەولانا باڵەکانی بۆ کردنەوە. لەبەردەمیدا چوون بەچۆکدا و بۆ ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مانەوە. پاشان یەکێکیان خەبەری دامێ کە رێك لەو ساتەدا هەستیان کردوە بەربەستەکان هەرەس دێنن و خەمەکەیان دەستودەم دەڕەوێتەوە. هەستیان کرد وا خەریکە باڵ و پەڕیان لێ دەڕوێ. هەستیان کرد سەرلەنوێ لەدایك بوون. جیهانی رۆحیان بینی. خۆیانیان بینی کە لە مادده رەها بوون، بینییان حیکمەت لە سینگیاندا دەکوڵێ و فیکر جێگەی نەزانی گرتەوە. لە سێبەرەوە بوونە نوور و لە خەمەوە گۆڕان بۆ شادی. لە شەوی تاریکەوە بوون بە مانگی پرشنگدار، لە دڕکەوە بوون بە گوڵێك لە باخچەیەکدا.

سەلاح یەك بەیەك یارمەتی دان، ئەوان لەکۆنەوە هاوڕێی بوون، لە هەمان شەقامدا پەروەردە بوون، لەنزیك هەمان کەناری دەریاچە. قەت هەستی نەکرد ژیانی لە مەترسیدایە. پێی وتن، ناکرێ مەترسی لەو پیاوانەوە بێ.

ماچی کردن و هەریەکەیان چوو بەرێی خۆیەوە. خوا کە تەنانەت لە سەرئاویشدا قسەی لەگەڵ سەلاح کرد، خۆشەویستی بۆ رۆمی و خۆشەویستی رۆمی بۆ ئەو مسۆگەر کرد. بەڵێ، زێرنگەرێکی سادە لە بازاڕی قۆنیە دەزانێ خوا و شاعیرە مەزنەکەی خۆشیان دەوێ.

# منداڵەکانمان جەرگمانن بەسەر زەویدا دەڕۆن

دوای ئاشتەواییەکەی نێوان ڕۆمی و سەلاح و خەڵکی قۆنیە، ئیتر سەرەنجام دەمانتوانی ئامادەسازی بۆ زەماوەندی هاوسەرگیریی سوڵتان وەلەد و فاتیمەی کچی سەلاح، بکەین.
ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد ئەو هاوسەرگیرییە زۆر لەمێژە بکرایە، هەر لەوکاتەی ڕۆمی و شەمس روویان کردە ماڵی سەلاح و ئیتر سوڵتان وەلەد دەیتوانی سەردانی ماڵی فاتیمە بکات، کە ئەوکات هێشتا لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو و زۆر دیدی بۆ دەهاتن. چاوەڕوانییەکە زۆری خایاند. تەمەنی کچەکە هۆی سەرەکی دواخستنی هاوسەرگیرییەکەیان بوو، بەڵام دیارنەمانی شەمس و ئەو خەمەیش یەخەی ڕێچکەکەمانی گرت ڕۆڵی هەبوو لەو دواخستنەدا.
ئەوانەی لە قوتابخانە ئامادە بوون زۆر باسی هاوسەرگیرییەکەیان دەکرد. فاتیمەم یەکەم جار لە ماڵی باوکی بینی لەکاتی خەڵوەتەکەی ڕۆمی و شەمس لە ماڵیان. دەمویست لە دوژمنایەتی کەسانی حەسود و فزوڵی و ئاسۆ تەسك هەڵبێم. فاتیمە تەمەنی دوازدە ساڵ بوو، ئەوەیش تەمەنێکە تێیدا ڕێگە بەکچان دەدرێ لە حەوشەکەدا بێن و بچن و لە ڕاڕەوەکاندا رابکەن و لەسەر شەقام گەمە بکەن بەبێ ئەوەی بکەونە بەر رەخنەی ڕێنماییەکانی ئاینەکەمان. کچێکی گەنجمان دی حیجابێکی سووکی هەبوو بەرەو ماڵ دەڕۆیشت، کە لەنێوان کچێکدا کە هێشتا پەنجەی دەمژی و کچێکدا خۆی بۆ ئاین نەزر کردوە و سەرتاسەری تەنە ئاسمانیەکان تەی دەکات، پەرت بووبوو.
بیرم دێ نانی کەمی دەخوارد، بەزۆری لە ڕۆژێکدا ژەمێك. شەمس دەیبینی بەدرێژایی شەو وەستاوە.
هەستمان کرد ئەو منداڵەی لە یەکگرتنی سوڵتان وەلەد و فاتیمە لەدایك دەبێ و خوێنی سەلاح و ڕۆمی بەدەمارەکانیدا دەگەڕێ، خۆشەویستیەك بەرجەستە دەکات کە جگە لە عیشقی ئیلاهی ناتوانم بەهیچیدی وەسفی بکەم. هەرچی خەڵکی قۆنیەیە رەنگە هاوسەرگیریی نێوان کوڕی مەولانا و کچێکی شارەکەیان بە یەکگرتنی ڕۆمی لەگەڵ شارەکەیان دیبێ.
بەڵام من حوسام، ژمێریاری قوتابخانە، بەرپرس بووم لە کۆکردنەوەی پارە بۆ سازکردنی ئاهەنگەکان: ئامادەکردنی زەماوەندی هاوسەرگیری، تەدارەکی بووك، پلاندانان بۆ ئەو دیارییانەی دێن. ئەم جارەیان شارەزاییەکەم یارمەتیدام و زەحمەتیم لە کۆکردنەوەی چەردەیەکی باش نەدی. کیرای ژنی مەولانایش هەموو کارامەیی خۆی بەکار هێنا. بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك، باشترین بازرگانانی کوتاڵ لە ناوچەکەدا لە سەردانی قوتابخانەکەمان بەسندوقی پڕ قوماشی دوراو و جۆرەها ئاوریشم و حیجاب، نەوەستان. لە بەشی ناوەوەی ماڵەکەدا ژوورێك بۆ ئەو ئافرەتانی رازێنەر و پرچ داهێن و بشێل تەرخان کرا و دەرگا لەبەردەم هاتنەژوورەوە و چوونەدەرەوەی ئافرەتان دانەدەخرا، ئەوەیش دەرفەتی بۆ ئێمە رەخساند بەدزیەوە

نیگایەك بگرینە سیحری ژیانی مێینە. لە ناوەوە دەنگی نای و ڕەبابە دەگەیشتە گوێمان، هەندێ جاریش گوێمان لە دەنگی کیرا بوو لەبەرخۆیەوە شیعرەکانی مێردەکەی بەدەنگ دەوتەوە.
لەو ڕۆژە پایزییە پیرۆزەدا، تەمەنی سوڵتان وەلەد گەیشتبووە بیست و شەش ساڵ. ژنەکەیشی گەیشتبووە شازدە ساڵ. چوار ساڵ بەسەر دیارنەمانی شەمسدا تێپەڕیبوو.
لە ڕۆژی زەماوەندەکەدا یاوەریی سوڵتان وەلەدم کرد بۆ گەرماو، لەوێ شۆردرا و بەزەیت چەور کرا و بۆنخۆش کرا و ریشی چاك کرا. جلێکی تازەی لەبەرکرد. کاتێ بەسواری ئەسپێك کە بەجۆرەها جوانکاری ڕازێنرابوویەوە گەیشتە قوتابخانەکە، دەیان دۆست و هاوڕێ بەهەلهەلە و قریوەقریو پێشوازییان کرد، کاتێ هاتە ناو دەروازەکە و ئەو داڵانە سەرەکیەی تێپەڕاند کە بەمیوانی گرنگ جمەی دەهات، چووە ئەو ژوورەی شەمس و کیمیا تێیدا هاوسەرگیریان کرد. ژوورێکی بێدەنگ و بچوك بوو، باوکی و سەلاح و فاتیمە تێیدا چاوەڕوانیان دەکرد. ڕۆمی چەند شیعرێکی لە پەسنی هاوسەرگیریدا خوێندەوە، ئەمەیش ئەو هاوسەرگیریەی بیر خستمەوە.
ڕۆمی دەستی ڕاستی درێژ کرد، ناولەپی ڕوو لە ئاسمان بوو، فاتیمە دەستی لەسەر دەستی دانا، پاشان سوڵتان وەلەد دەستی لەسەر دەستی هەردووکیان دانا، پاشان سەلاح دەستی لەسەریان دانا و بەوە ئەو یەکگرتنە تەواو بوو.
لە گۆڕەپانەکەدا خێوەتێك بۆ میوانان هەڵدرا. کۆمەڵێ وەزیر و بەرپرس کە بەئامادەبوونیان سەلماندیان لەپاڵ یەکگرتنی ڕۆمی و سەلاحدا پیرۆزبایی لەم یەکگرتنەیش دەکەن.
سوڵتان وەلەد سڵاوی لێکردن و داوای کرد شوێنی خۆیان لەسەر ئەو تەختانەی بەدەوری خێوەتەکەدا ڕیز کرابوون بگرن. پاشان خزمەتکاران هاتنە ژوورەوە و لەبەردەم هەر میوانێکدا مێزێکی بچوکیان دانا کە چەرچەفێکی نەخشین داپۆشرابوون و هەریەکەیان سینیەکی فەخفوری و چەقۆیەکی زیویان لەسەر بوو.
سەرەتا هەندێ ئیشتیاکەرەوی سارد پێشکەش کران لە گۆشتی مامزی بەسرکە خۆشکراو کە کیرا خۆی سەرپەرشتی ئامادەکردنی کردبوو، پاشان گۆشتی بەرخ و پۆڕ و قاپێکی تایبەت لە گۆشتی سینگی گوێرەکەی کوڵاو بە مۆخ و زەردێنەی هێلکە پێشکەش کران. شیرینیش، کێکی دۆشاوی بادەم و دەنکە هەنار پێشکەش کران. پاشان داوام لە خزمەتکارەکان کرد دەسشۆر و مەسینە و خاولیی دروستکراو لە باشترین جۆری قوماش و بتڵی گوڵاو بێنن بۆ میوانە زۆر سادەکان –چونکە تەنها پیاوە گەورەکان خوڵك نەکرابوون– تا دەستیان بشۆن و پاش نانخواردن عەتر پژێن بکرێن.
کاتێ ژەمی سەرەکی پێشکەش کرا، ڕۆمی و سەلاح بەخێرهاتنی میوانەکانیان کرد. دوای ماوەیەکی زۆر بۆ یەکەم جار بوو نیشانەی خەم و ئازارم لە ڕوومەتی مەولانادا نەدی، بەڵکو نیشانەی شەوق و ئاسوودەییم دی. سەلاحیش وەك عادەتی خۆی هێمن و لەسەرخۆ دەرکەوت.

پاشان ژەنیاران و گۆرانیبێژان و سروودبێژان هاتن ناو خێوەتەکە و دەستبەجێ سەمایەکی بیستنیان ساز کرد، کە رۆمی و سەلاح سەردەستەی بوون. سەما و زەماوەند بەدرێژایی شەو بەردەوام بوو. لەکاتێکدا مەولانا دەخولایەوە بینیم و بیستم ئەم بەیتانەی خوارەوە دەڵێ، کە ستایشی سەمای جیهان دەکەن:

جەژن و زەماوەندەکانمان پیرۆزە،
لەم جیهانەدا،
ئەوە خوایە بۆی داناوین
ئەم جەژن و زەماوەندانە

هەسارەی زوهرە مانگی خۆشویست،
شەکریش تووتی خۆش ویست،
با هەموو ئێوارەیەك بۆ زەماوەندەکانی،
پاشاکە جوانخاسەکەمان ئاهەنگ بگێڕین.

بۆ سەرەتا، ئەم ئێوارە ساردە،
رێگەت ئەبڕی بۆ زەماوەندەکە،
ئەبیتە زاوای پیاوە باشەکە،
تۆ پیاوە باشەکەی، زینەتی شار.

بەخۆشی بەکۆڵانەکانماندا ئەڕۆی،
بەبڵندی ئەڕۆی بۆ لامان،
بەخێرایی، باز ئەدەی بەسەر جۆگەلەکەماندا،
تۆ، جۆگەلە و رێبواری رێگەمانی.

ئەتوانی دڵڕەق بی،
بەڵام من ناتوانم وا بم،
داوای وەفا و دڵسۆزی ئەکەم،
پێی غەزو بخە سەر دەروونمان کە خوێنمان پاك ئەکاتەوە.

سۆفیەکان سەما بکەن،

سەما بکەن! ئێوەن بەویژدان، بخولێنەوە!

بەدەوری سامانی پاشای جیهاندا،

ئەو پاشایەی نەفس ئەبەخشێ.

تەپڵەکە لەدەوری ملمە!

لە ژووری هاوسەرگیری، گوڵەباخ و گوڵە نێرگس،

چونکە تەپڵەکە ئەمشەو،

جوانترین مەخلوقاتمان ئەبێ.

دوای ماوەیەك مەولانا هەواڵی دامێ کە ئەو شەوە هەستی کردوە گەورەی فریشتەکانی بەهەشتیش سەمای لەگەڵ کردوون، هەروەها وتی فاتیمەی بوکیشی ئەوەی بینی کە رۆمی هەستی پێکرد. بەڵێ، ئەویش حۆریەکانی بینی دەفیان لێدەدا و شادییان دەکرد. هەروەها وتی ئەو نیعمەتەی ئەو ئێوارەیە بۆی هات هەمان نیعمەتە کە یاوەری دیدارەکەی ئادەم و حەوا و یەعقوب و یوسف و میوانەکە و مەیگێڕەکە بوو.

دوای زەماوەندەکە  هێمنی باڵی کێشا. وەك ئەو هێمنییەی پاش هاوسەرگیرییەکەی شەمس نەبوو.

بەڕاستی شەمس لەکوێیە؟

رۆمی هەمیشە ئەوەی دەوتەوە کە ئەو بووەتە شەمس. دەڵێ شەمس هەر ئەوە. شەو ورۆژ ئەوەی دەوت بەڕادەیەك ئێمە هەندێ جار لەوە وەڕس دەبووین. تەماشام دەکرد کە دەخولایەوە. چاوەکانی نوقابوون و لەشی لە ئارەق هەڵژەنرابوو. وەك پاڕانەوە ناوی شەمسی دەوتەوە. هەزاران جار.

بەڵام سەرباری یەکگرتنی لەگەڵ مەولانا، ئەی بەڕاستی شەمس لەکوێیە؟ کاتێ دەستمان لە بەدوواداگەڕانی هەڵگرت و دەرگامان بەڕووی "گوێزەرەوانی هەواڵی درۆ"دا داخست، هەستم دەکرد شتێك لەناو دڵمدا گرژ دەبێ، وەك ئەوەی هەر ئومێدێکمان بەجارێکیتر بینینەوەی لەدەست دابێ.

رەنگە رۆمی شەمسی لەخۆیدا دیبێ. ئەوەی لە سەرجەم غەزەلیاتەکانیدا بەدەنگێکی بەرز و ئاشکرا باس کرد. لەبەرئەوە وادیارە بەئاسانی پیاوێکیتری هەڵبژاردوە، خۆشەویستیەکی جیاواز. بەڵام من حوسام، لەکوێ دەکرێ بیبینم؟ بێتاقەتی شەمسم. سەڵاحی نەرم و هێمن بەحاڵ دەتوانێ ئەو زیانە قەرەبوو بکاتەوە– کاتێ نەبێ لە ئاودەستدا سەرکۆنەی خوای دەکرد.

هاتنی فاتیمە کە لە بەشی ناوەوەی ماڵەکەدا جێگیر بوو، وەك بێداربوونەوەیەکی نیان بوو لە ژیانی هێمن و هەندێ خەواڵووماندا. سەفای رێساکانمان و هەستکردنمان بەڕەزامەندی لێڵ کرد. هەرگیز نەماندی بخوات یان بخەوێ یان قسە بکات. دەوترێ خواردنی ئاسمانییە و راخەرەکەی تا ئاسمان درێژ دەبێتەوە و قسە

لەگەڵ مەخلوقاتی جیهانیتر دەکات. عەین، کچی مورید موعین سلێمان کە بوو بە بەکرێگیراوی مەغۆل، هەروەها ئەمیرە غوردجی کە فاتیمە لە سەردانی نەوەستا، لە باسکردنی موعجیزەکانی نەدەوەستا. فاتیمە بوو پەردەی درِی. ئەو پاڵێوە بوو مرۆڤ دەیتوانی لەڕێیەوە هەموو شتەکان ببینێ، عەینیش نکوڵی لەو دیدە ئاسمانییانە نەدەکرد.

لەکاتی مێردکردنەکەیەوە، هەتیوو و بێوەژنانی هەژار دەستە دەستە بەسەر قوتابخانەکەدا دادەبارین. رۆژێك تێنەپەڕی تێیدا فاتیمە دەرگا بۆ ئاتاجان نەکاتەوە و باشترین خواردنیان پێشکەش نەکات، یان هەندێ جار جلوبەرگی قەشەنگیان لەبەر بکات. ئەوانە دوای ئەوەی خۆراك و پۆشاکیان دەست دەکەوت، بەئاستەم لە هەژارانیدی جیا دەکرانەوە، کاتێ دەرِۆیشتن سواڵکەرەکانیدی وایاندەزانی ئەوانە خەڵکانی داران و داوای چەند درهەمێکیان لێ دەکردن. ئەوە رۆژانە رووی دەدا. کۆمەڵێ هەژاری راستەقینە داوای یارمەتییان لە کۆمەڵێ دەوڵەمەندی ساختە دەکرد. کاتێ ئەم هەژارانە بۆ ماوەیەکی کورت لەبەردەم قوتابخانەکەدا دەوەستان، ئەوانیش وەك ئەوانەی پێش خۆیان بەشێوەیەکی کاتی دەبوونە دەوڵەمەند. دەبوو ئەوانیش دەستی درێژکراوی سواڵکەران بدەنە دواوە.

مەولانا کە لەسەر داوای شەمس وازی لە فێرکردن هێنا و گۆشەگیربوو، ئێستا لەگەڵ فاتیمەیە، دەستی بەفێرکردن کردەوە کە وازی لێ هێنابوو. خۆم فاتیمەم دەمبینی هەموو رۆژ دەچووە ژوورەکەی مەولانا و هەندێ جار تا شەو لەوێ بوو. چەندین سەعات لەوێ دەمایەوە، سەمای دەکرد و رەبابەی لێدەدا و باسی ئەو من—ی دەکرد کە نەفس نیە. ئێمەی موریدانی پێشوو دەمانویست سوود لەو تەلقینە وەربگرن، با بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ. بەڵام دەمانزانی ئەو دەرگایانەی بۆ ئەو دەکرێنەوە بۆ هەتاهەتایە بەرِووی ئێمەدا داخرابوون. هەندێ وتی وتیم بیست دەیانوت کیرا کە توانیبووی دڵپیسیی خۆی لەو پیاوانەی مێردەکەی هاوەڵی دەکردن کۆنترۆڵ بکات، بەرگەی هیچ ئافرەتێکی رکابەری نەگرت، لەبەرئەوە بەتوندی لۆمەی رۆمی کردوە لەسەر وانەوتنەوەی بە فاتیمە، تەنانەت زریانوس گوێی لێ بووە کیرا بەدەنگی بەرز قسەی کردوە و گریاوە و پێش ئەوەی بێدەنگ بێ قیژاندویەتی، دوای قسەیەکی زۆری مەولانا. کاتێ زریانوس زیاتر نزیك کەوتەوە گوێی لە رۆمی بووە بە ژنەکەی وتوە "کیرا، فاتیمە بەشێکە لە من، منداڵەکانمان جەرگمانن و بەسەر زەویدا دەرِۆن".

رۆژی دواتر کاتێ رۆمی ئەو بەشەی بەجێهێشتوە کە بە "ئەندارونی" ناسراوە، واتە ئەو بەشەی تایبەتە بە ئافرەتان و گەڕاوەتەوە بۆ "بیرونی" بەشی تایبەت بەپیاوان، لە سیمایدا بۆ نیشانەی شەکەتی گەڕاین، هەمان ئەو نیشانانەمان تێبینی کرد کە پێش چەند ساڵێك دیمان. دوای ئەوەی کیرای پشتگوێ خست، رێزی لێنا، وەك کیرا خۆی باسی کرد، حەفتا جار لە شەوێکدا چووەتە لای. ئەگەرچی ئەم ژمارەیە

بەزیادەڕەوی دەهاتە بەرچاومان، ئەوا ئەو ماندوێتیەی بە روویەوە دیار بوو، ڕێك وەك ئەو بەیانییە دوورە، ئاماژەیە بۆ شەوێك کاری تاقەتپرووکێن.

دوای لۆمەکردنی لەلایەن کیراوە، دەبوو مەولانا کێشەیەکی نێوان سوڵتان وەلەد و ژنەکەی چارەسەر بکات. فاتیمە هەندێ جار خۆشەویستیی خۆی لای هەژاران و پێگەی تایبەتی لای رۆمی دەقۆستەوە، چۆنی حەز بکردایە بەکون و قوژبنی ماڵەکەدا دەگەڕا، هیچ گوێی بەوە نەدەدا ئاخۆ پۆشتەییەکەی بەشێوەیەکە بەتەواوی لە چاو خەڵکی غەریبە بیپارێزێ یان نا. کاتێ لەگەڵ پیاوێك دەدوا ڕێك تەماشای چاوەکانی دەکرد و ئەو حیشمەتەی پیشان نەدەدا کە ئافرەتانیتر پیشانیان دەدا کە روویان هەندێ بەلای راستدا لادەدا و برژانگیان نزم دەکردەوە، بەپێچەوانەوە فاتیمە چاوەکانی بەپانایی خۆیان دەکردەوە، ئەو هەستەی دەبەخشی کە بەسەر گرووپە ریشدارەکەماندا زاڵە و بەچاوەکانی و وشەکانی قسەی لەگەڵ دەکردین.

چەندین جار گوێم لە سوڵتان وەلەد بوو رەخنەی لە ژنەکەی دەگرت و بیری دەخستەوە پۆشتە و لەخۆبوردە بێ، بەڵام ئەم قسانە لەم گوێیەوە دەهاتن و لە گوێکەیتریەوە دەردەچوون و سوودیان نەبوو. لە باش خۆدانەپۆشین و چاوقایمانە تەماشاکردنی رووی ئەوانەی قسەیان لەگەڵ دەکرد بەردەوام بوو. بەبەرچاوی خەڵکەوە دەمەقاڵەیان دەکرد، جارێکیان سوڵتان وەلەد دەنگی بەرز کردەوە، لەبەرانبەردا فاتیمەیش دەنگی بەرز کردەوە و ئامادەبووانی تووشی شۆك کرد. ئەوە یەکەم جار بوو هاواری ئافرەتێك — تیژ و بریندارکەر– بەرگوێی ئەو پیاوانە بکەوێ، کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەنگەکە لە گوێچکەیاندا —کە تووشی کەڕی بووبوو– دەزرینگایەوە، نەخاسمە کە ئافرەت بە بێدەنگیی قووڵ ناسراوە.

هاوارەکە موریدەکانی بڵاوە پێکرد، بۆ ماوەیەکی زۆر مێردەکەی دوورخستەوە، ئافرەتانی ئەودیو دیوارەکانی حەپەساند، بەڵام بەدڵی مەولانا بوو کە لە فاتیمە بێزار نەبوو، بەڵکو لێی نزیك کەوتەوە و دەستی بەقژیدا دەهێنا و وتی: "کێ هەیت ببە، دەزانم چونکە تۆ هەرگیز نە سۆز و نە غیرەت نەبووە".

پرچی رەشی تاریك و تەنانەت مەیلەوشین دەردەکەوت، چەند گەردانەیەکی مەرجانی ئەستووری لە ملدا بوو. موستیلە پەنجەکانیان دەستیان داپۆشیبوو. کاتێ دەرۆیشت، پێ پەتییە بە خەنە رازاوەکانی لەژێر پاژنەکانیدا یارییان لەگەڵ ئەو زەوییە دەکرد کە بەنەرمی و خۆشەویستیەوە بەسەریدا دەچوون.

بەیداخێکی داهێنا کە بەشکۆوە لەسەر دەروازەکانی شارێکی داگیرکراو، لەسەر سەربانی کۆشکی پاشا، لەسەر کاریتەی کەشتیەکی جەنگی، بەرز کرایەوە. چۆن دەکرێ کەسێك داوا لە بەیداخێك بکات لە بینین ون ببێ؟

ئەو بەیداخە سەرکەشە سەرنجی هەزار نیگای سەرسەڕماوی رادەکێشا. کاتێ بەیداخەکە دەشەکایەوە، بەسەر چەندین بەرزایی شیمانەنەکراودا دەفڕی، هەروەها وا پێدەچوو سوڵتان وەلەد، بنکە قایمەکە، خۆی

لەو جوڵە لەخۆڕازیەی ئەو بەیداخە بێئاگا بکات، فاتیمەی سەرسەختیش خۆی وای دادەنا لەناو دەستەکانی مێردەکەیدایە، وەك باڵندەیەك زۆر بەزەحمەت گیرا و بەخێرایی کۆچی کرد.

بەمەبەستی چارەسەری ناکۆکیەکەیان، مەولانا کە بەتوندی پشتگیریی بووکە گەنجەکەی دەکرد نامەیەکی بۆ کوڕەکەی پێ نووسیم:

"ئەم ئامۆژگاریانەت دەربارەی شازادە خاتونە گەنجەکەمان، سەفای دڵەکانمان و سەفای تەواوی گەردوونیش بۆ دەنێرم: ئەو وەك راسپاردەیەك، وەك تاقیکردنەوەی سەخت، بەتۆ بەخشرا. رۆحە ئاسمانیەکان کە پاسەوانی منداڵەکانی دەکەن، پاسەوانی ئەویش دەکەن، ئەرکی تۆیشە رێزی بگری وەك کە شەوی زاوایەتی رێزت گرت، بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ بکەی کە یەکەم رۆژ بینیت مامەڵەت دەکرد کاتێ منداڵێك بوو لەسەر پشتی ئەسپێك و بێباك بوو بەجیهان هەمووی، رەنگە بەخالقیش. ئەمە لەکاتی ئەو راوکردنەدا تێدەگەم کە بە تۆڕی دڵ و گیان دەکرێ. ئەو راوەی هێشتا راو نەکراوە. دەزانم تۆ پێویستە بەدرێژایی ئەم رێگەیە بگەڕێی، غار بدەی، لەگەڵی بسوڕێی، ببەزێنی، بەبێ ماندووبوون پێش بکەوی، جارێکیتر پێش بکەوی، بەدوویدا بچی، جارێکیدی بگەڕێی".

ئەو نامەیەم دایە دەست سوڵتان وەلەد کە شوێنی راوچی و نێچیرەکەی دیاری کرد. فاتیمە بۆ ماوەیەك، ئەگەرچی هەستی دەکرد لای مێردەکەیەتی، بەڵام دڵنیایش بوو لەدەستی راپسکاوە. دیلە، بەڵام هێشتا ئازادە.

ئاشتەواییەکە زۆری نەخایاند، چونکە سوڵتان وەلەد جارێکیتر داوای لە ژنەکەی کردەوە بەتەواوی ملکەچی رێسا باوەکان بێ. دامەزراو بێ و رووپەتی لەژێر پەچەدا بشارێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا چەندین کاتژمێر سەبارەت بە کرداری خودایی کە لە گوتاری مرۆڤدا تەجەلی دەکات گفتوگۆی لەگەڵ رۆمی دەکرد. دیار بوو نێچیر و راوچییەکە لەسەر هەمان زەوی نەبوون. جارێکیتر بوو بە دەمەقاڵەیان و مەولانا هەستی کرد پێویستە قسەی تێدا بکات. بینیم بەدرێژایی رۆژ لە ژوورەکەیدا دەمایەوە و خەریکی نووسینی نامەیەك بوو بۆ ئەو ئافرەتەی بەزیرەکترین موریدەکانی خۆی دادەنا، ئەویش هاوسەری کوڕەکەی بوو، فاتیمە.

دوای چەند ساڵێك، پەرۆشی ئەوە بووم ئەو نامەیە کۆپی بکەم کە تێیدا بەو ئافرەتە گەنجە دەڵێ خەمەکانی ئەو دە هێندەی خەمەکانی خۆی ئازاری دەدەن، نووسیوێتی:

"ئەگەر کوڕەکەم لە ئازاردانت بەردەوام بێ ئەوا دڵمی لێ دەردێنم و چیتر فریای ناکەوم. لە سەردانی گۆڕەکەم مەحرومی دەکەم. تۆ هەست بە نیگەرانی دەکەی، بەڵام پێویستە بزانی دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ، بوونی مێشێك نرخی نانی شیرین بێنرخ ناکات. ئەوەیش بزانە من فرمێسك و بڕوبیانوو و بەڵگەکانی ئەوانەی رەخنەت لێ دەگرن قبوڵ ناکەم. لەبەرانبەر ئەوەدا من چاوەڕوان دەکەم هەموو شتێکم

پێ بڵێی، چونکە تۆ قوربانیت. هەموو شتێکم بۆ باس بکە تا بتوانم بەپێی توانای خۆم یارمەتیت بدەم. تۆ لەم جیهانەدا پەرستگەی سەلامەتیی خوایت".

ئاشت کرانەوە، هەروەك ئێمە مەولانا گوێی لە سکاڵای سوڵتان وەلەد لە ژنەکەی شل دەکرد سەبارەت بە "سەفای دڵی و بینینی" بۆ چەندین ساڵ. بە سات ساتیبوون و بێموبالاتی و نادڵسۆزی و دەرکەوتنی بە ناپۆشتەیی تۆمەتباری دەکرد. ساڵانێك رۆمی بەرگری لە "شازادە خاتونە خاوەن سروشتە بێگەردەکەی دەکرد، جەوهەری ئارامگرتن و نەرمی".

هاوسەرگیریی کوڕی رۆمی و کچی سەلاح یەکگرتنیانی تەواو کرد. گوێم لێ بوو مەولانا کە باسی دوو کچەکەی سەلاحی دەکرد دەیوت ئەوان "چاوی راست" و "چاوی چەپ"ی ئەون. فاتیمە، چاوە راستەکە، کوڕێکی بوو کە خۆشەویستی ناو ناخی هەردوو باپیرەی بەرجەستە دەکرد. مەولانا هەرکات منداڵەکەی هەڵبگرتایە سەلاحی بیر دەکەوتەوە.

کاتێ هەدیە، چاوی چەپ، خوشکە بچوکەکە گەیشتە تەمەنێك ببێتە جێسەرنجی رەگەزەکەیتر، نیزامی خۆشنووس ئاشقی بوو و ویستی بیخوازێ. من یەکەم کەس بووم باسی ئەو حەزەی لەلا کردم کە هێشتا نهێنی بوو. لەمێژ بوو بیری لە خواستنی هەدیە کردبووە کە لە قوتابخانە دیبوی، بەڵام هێشتا کاتی شووکردنی نەهاتبوو.

بۆ ماوەیەك هەستم دەکرد ئازارێکی نهێنی نیزام دەگوشێ. ئەوە بەڕوونی بە هونەرەکەیەوە دەبینرا. خەتی فڵچەکەی و شێوەی نامەکانی ئاماژەی نیگەرانیەکی شاراوەیان پیشان دەدا، وەك ئەو باڵندە یان ئاژەڵە کێوییانەی کێش و کاریگەرییان نیە. سەرەنجام لێم پرسی چی ناڕەحەتی کردوە: تەندروستی، باری دارایی، ستەمی مەغۆل کە باری سەرشانی هەموومانی گران کردبوو؟ نا، هیچ لەمانە نەبوون. وازم لە پرسیار لێکردنی نەهێنا، بەپێچەوانەی رێساکانی هەڵسوکەوت لەبارەی ژیانی سۆزداریی خۆی پرسیارم لێکرد.

کەوت و پێی راگەیاندم ئەو ساڵانێکی زۆرە ئەوینداری هەدیەیە. تەمەنی —کە بۆ هاوسەرگیری بچوك بوو— تا ئەوکاتە دڵنیای دەکرد کە دەرفەتێك هەیە ئایندەیەکی پەمەییان هەبێ. بەڵام هەندێ نیشانەی لەسەر هەدیە دەرکەوتن کە وای لێهاتووە ئامادەیە کارلێك لەگەڵ ئەو قەسیدانە بکات کە باسی هاوسەرگیری دەکەن، روومەتی لەشەرمدا پەمەیی دەبوو. ئەمە هۆی راستەقینەی هەرەسی پیتەکان بوو لە قەڵەمەکەی نیزامدا. دەستبەجێ دڵنیام کردەوە و بەڵێنم دایە پرسیار لە سوڵتان وەلەد بکەم ئاخۆ هەدیەیش هەمان هەستی خۆشەویستی بۆ ئەم هەیە، ئاخۆ چاوی چەپی مەولانا شەیدای بەنەرمی روانینە بۆ روخساری خۆشنووسە بەناوبانگەکە.

زۆری پێنەچوو وەڵامی هێنایەوە. لە شێوەی وێنەی بولبولێکدا هات کە دەنوکەکەی شوێن وشەی قبوڵ دەکەوێ. لەوکاتەوە ئەو هێڵانەی نیزام دەیکێشان دامەزراوی و سەفاکەی جارانیان بۆ گەڕایەوە. بەڵام

شتێك من و سوڵتان وەلەدی نیگەران کردبوو. ئەویش ئەوە بوو سەلاّح توانای ئەوەی نەبوو تەدارەك (جەهاز)ێك بۆ بوکەکە دابین بکات شایان بەو بووك و زاوایە بێ. کاتێ سوڵتان وەلەد و فاتیمە هاوسەرگیرییان کرد بنەماڵەی رۆمی لەبەر دەسکورتی سەلاّح چاوپۆشییان کرد و ئەو بوکەیان قبوڵ کرد کە هیچی نیە، لەو رووەوە خەلاّتێکە لە ئاسمانەوە. بەلاّم نیزام کوڕەکەی رۆمی نیە، چونکە لەوانەیە چوونی هەدیەی هەژار بۆ ماڵێکی تەقلیدی هەڕەشە لە گوزەرانیان لە ئایندەدا بکات.

من و سوڵتان وەلەد بڕیارمان دا داوای یارمەتی لە مەولانا بکەین. مەولانا دوای ئەوەی گوێی بۆ خەمەکەمان گرت، داوای لێکردم پەیوەندی بە ئوستاوە بکەم، ئەو ژنەی کچانی سوڵتان پەروەردە دەکات. منیش پەیوەندیم پێوە کرد.

ئوستا کە ژنێکی خوێندەوار بوو، بەپەلە هات بۆ قوتابخانە.

ئوستا بەهەڵەداوان هات لەبەرئەوەی داوای رۆمی بەلای ئەوەوە فەرمانێکی گەورە بوو. مەولانا دەرفەتی دا وچانێك بدات، ئەنجا پێی وت: "برۆ بۆ لای خاتوو ئەمیرە غودچی و پێی بڵێ من پشت بەو دەبەستم بۆ دابینکردنی جەهازی بوکێنیی هەدیە، خاتونیان دەتوانن داوای یارمەتی لە ژنان و کچانی شازادەکان بکات و هانیان بدات بۆ بەخشین. دیارییەکە فەزڵ و پاراستنی سەلاّح مسۆگەر دەکات".

ئوستا رازی بوو. پاشان بازنە ئاڵتونەکانی و بازنە زمروتەکانی کە لە شێوەی لوتی فیلدا بوون داکەند و لەبەردەم مەولانادا دانان، وەك یەکەم خشت لە جەهازی بووکەکە. کاتێ چووە دەرەوە رازی نەبوو سواری ئەو گالیسکە شاهانەیە ببێ کە هاتبوو تا بیگوێزێتەوە بۆ کۆشك، بەڵکو سەبەتەیەکی کردە ملی و بەکۆلاّنەکانی قۆنیەدا دەگەڕا و هاواری دەکرد "شتێك بۆ خوا".

کاتێ گەیشتە بەردەرگاکانی کۆشك، نیوەی سەبەتەکەی پڕ بووبوو لە پارچە زێڕ و زیو، بەلاّم ئەوە بەس نەبوو، لەبەرئەوە راستەوڕاست رووی کردە ژوورەکانی خوشکی سوڵتان و داواکەی رۆمی پێگەیاند. ئەمیرە غوردجیش سوپاسی خوای کرد کە ئەو دەرفەتە نایابەی بۆ رەخساندوە تا کەرەمی خۆی پیشان بدات، فەرمانی بە یاریدەدەرەکانی کرد گەنجینەکانی و ئەو سندوقانەی گرانبەهاترین جلوبەرگەکانی تێدا هەڵگیراون بکرێنەوە، فەرمانی کرد چەند جۆرێکیان دەربێنن.

داوای لە یەکێك لە کەنیزەکەکانی کرد لە جەوهەرەکانی کۆشك ئەو خشڵانە هەڵبژێرێ کە بەرائەتی بووك پیشان دەدەن، کەنیزەکەکەیش یەك کاتژمێری تەواو لەبەردەم ئەو گەنجینەیەدا وەستا، پاشان ئەمانەی خوارەوەی پێشکەشی شازادە خاتون کرد: بیست جووت گوارەی رازاوە بەئەڵماس، بیست موستیلەی زومروت و یاقوت، چەند کلاّوێکی دروستکراو لە قوماشی بە زێڕ چنراو، چەند حیجابێکی بە دەزووی زیوین دووراو، چەند بازنێك لە بەردی پیرۆز و قورس بەڕادەیەك ئافرەت بەحاڵ دەتوانێ بیانکاتە مەچەکی.

ئەمیرە غوردجی لەسەر چەرچەفێکی سپیی مێزێك بلاّوی کردنەوە و ماوەیەکی زۆر لێیان راما. هەر

پارچەیەکی یادەوەریەکی دیاریکراوی هەڵگرتبوو، یەکێك لە حیجابەکان مارەکردنی بۆ موعین سلێمانی بیر دەخستەوە کە بۆ بەرژەوەندیی مەغۆل کار دەکات، ئەو رۆژە بەشانازیەوە لەبەری کرد وەك کە رێوییەك فەروە زیوینەکەی نمایش دەکات، تەنها یەك حەزی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو مێردەکەی حیجابەکەی لاببات، هەروەها سەرجەم جلەکانیتری کە جەستە بلوری و گەرمەکەیان شاردبووەوە، کە هەزار و یەك حەزی تێدا بوو.

هەرچی گوارە ئەڵماسیەکانن لەو کاتەوە هەڵیگرتبوون کە هێشتا کچێکی بچوك بوو. ئەوکاتە سندوقی خشڵەکانی دایکی دۆزیەوە و زۆری لە دایکی کرد هەندێ حشڵی بداتێ کە وەك بڵاوە بەپارە نەدەخەملێنران. ئەگەرچی ئەوە گونجاویش نەبوو بەڵام دایکی ملی بەداواکەی دا و ملکەچی ویستی کچە گەنجە فزولییەکەی بوو. کاتێ دایکی مرد و هەموو ئەوەی ناو سندوقەکەی دەستکەوت، گوارەکانی گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆیان و بەپەشیمانی عینادەکەی پێشووی بیر کەوتەوە.

کڵاوەکانیش کە لە مەنگۆلیاوە هاتبوون سەردانی ژنە کاهینێکی جادوگەری بیر خستەوە کە لە دەشتاییەکانەوە هاتبوو. کاتێ ئەو شتە غەریبانەی پێشکەش کرد پێی وت کڵاوە درێژ و بەرزەکان تایبەتن بەدانانی مار تێیاندا. هەروەها پێی وت ئەو خۆی سەفەری نەدەکرد تا مارێك لەژێر کڵاوە بەرزەکەیدا دانەنێ و لە شەخەڵی قژە پڕەکانیدا بیشارێتەوە. ئەمیرە غودجی ویستی لە قسەکانی ژنە جادوگەرەکە دڵنیا بێ. بۆ دووربوون لە هەر گاڵتەیەك، مارێکی بێ ژەهری بۆ هێنرا و خستیە پرچی لەژێر کڵاوەکەوە کە بەدەزووی ئاڵتونی دوورابوو، ماوەیەکی زۆر رۆیشت و کڵاوەکە لەسەر سەری بوو و چەندە توانی بەشێوەیەکی سروشتی قسەی لەگەڵ دەست و پێوەندەکەی کرد، بەبێ ئەوەی بەکەس بڵێ کە لەگەڵ هەر جوڵەیەکی مارەکەدا هەموو جەستەی دەست بە لەرزین دەکات و بەوە —کە ئەوە زۆر بەلایەوە سەیر بوو— سەرجەم هەستەکانی بێدار دەکاتەوە. هەندێ هەستی نوێ کە بەرەنگاری ناکرێن. دوای ئەوەی سەرپۆشەکەی لابرد و مارەکەی بەردا، پەنجەکانی یارمەتییان دا بۆ تێرکردنی حەزێك کە زۆر سەختگیر بووبوو.

ئەمیرە غودجی خشڵەکانی پشکنی. ویستی هەندێکیان هەڵبژێرێ. بەڵام ئەو یادەوەرییانە، جا چ خۆش بن یان خەمگین، رێگەیان پێنەدا هەڵبژێرێ. چۆن دەتوانێ دەست لەو خشڵانە هەڵبگرێ کە لە ئاهەنگی نیشانکردنیدا لەبەری کردون، واز لەو کڵاوە بێنێ کە سەرچاوەی چەندین خۆشی بوو؟ چۆن دەتوانێ ئەو سووکایەتیکردنەی بەدایکی لەیاد بکات کاتێ پێداگری کرد لەسەر بردنی گوارەکە، هەروەها رازیبوونی دڵنەرمانەی ئەو ژنە بە لەپڕ دەستهەڵگرتنی لە خشڵەکانی؟

بەئاماژەیەکی دەستی، لەبەرچاوی ئەبڵەقبووی کەنیزەکەکان فەرمانی کرد سەرجەم خشڵەکان بدرێنە هەدیە. ئوستای بەخێوکەریش بڕێکی زۆر لە خشڵەکانی کۆشکی سوڵتانی برد. کاتێ کۆی کردنەوە پرسی لە چارەنووسی ئەو موسیلە و جلوبەرگانە کە لە سندوقی خشڵەکانی شازادە خاتونەوە دەگوێزرێنەوە، یان

له دەشتاییە دوورەکانەوە هاتوون، تا ئێستا لەناو سندوقێکی سادەی ژنی خۆشنووسێکی قۆنیەدا خۆیان ببیننەوە.

جەهازی زەماوەندی هەدیە سات دوای سات زیادی دەکرد. هۆڵە ناوخۆییەکانی کۆشك پڕ بوون لە دەسترۆیشتووترین ژنانی شار. پێش گەیشتنیان، لەکاتێکدا شازادە غوردجی بەناو یادەوەرییەکانیدا دەگەڕا، خەساوەکان سەرقاڵ بوون بە پژاندنی گەڵای گوڵ و قەدی یاسەمین بەسەر مافورەکە و داپۆشینی قەنەفەکان بە پشتیی نەرم و پڕکردنی ئاگردانی بخورەکە بە چیلکەی بۆنداری نەد یان بە چەند پارچەیەك لە عەنبەر.

لەو فەنایەی دار بنارەکان سێبەریان لەسەر دەکرد، ژنە سەردانیکەرەکان کە جانتای قەبارە جیاوازیان هەڵگرتبوو، لەو بێشکانەی دەیانگواستنەوە، دابەزین، کە لەگەڵ خۆیاندا حیجابەکانیان رادەکێشا و هەوڵیان دەدا کێبڕکێی سێبەری پایزیان پێبکەن و بەهەنگاوی قورس و تەمەڵانە هاتنە ناو کۆشك. باڵەخانە لە بەرد دروستکراوەکە کە تاوەرێکی لەسەرەوە بوو، هەروەها قایمکارییەکانی بەبەردی یشبی پیرۆز رازێنرابوونەوە و دیوارەکانی بە ئەرابیسکی بەئاڵتون رووپۆشکراو زەخرەفە کرابوون، لە ناوەڕاستی چەند بینایەکدا بوو: ماڵ و گەرماو و مۆبەق و بەلەکۆنی چاودێریکردن.

ئافرەتێکیان حیجابێکی لە مەخمەڵی سەوز لەبەر کردبوو، دەڕۆیشت و وەك درەختی ئارەوان کاتێ با رایدەوەشێنێ، لەنجەولاری دەکرد. هەر کە پێی نایە ناو کۆشك حیجابەکەی لابرد و نەعلە بەبەردی پیرۆز نەخشاوەکانی داکەند. دەستە باریکەکانی بۆ کارەکەرە تورکی و مەنگۆلی و زنجیەکان درێژ کرد تا گوڵاوی ئەسفەهانی و شیرازی و سەمەرقەندی بەسەردا بپژێنن. پاشان ئەو داڵانە درێژەی بڕی کە دەچێتە هۆڵی پێشوازی و حیجابەکەی پێچایەوە و خستیە ناو شاڵێکی ئاوریشمی کە یەکێك لە کەنیزەکەکان لە دەروازەکەدا دایە دەستی. لەتەنیشت ئافرەتە ناسراوەکانیدی لەسەر قەنەفەکان دانیشت، دەستبەجێ لە جانتاکەی کە لە جانتای ئافرەتەکانیدی قورستر بوو کۆمەڵێ کاسە و قاپ و کەرەستەی ئاڵتوونی مۆبەقی دەرهێنا.

ئافرەتێکیتر دووابن حیکایەتی خورافی بۆ گێڕایەوە کە لە قۆنیەدا بڵاو دەبێتەوە، ئەویش چیرۆکی بیرێکە، دەوترێ ئیمامی دوازدەیەم کە شیعە باوەڕیان پێیەتی لەکاتی دیارنەمانیەوە تێیدا ماوەتەوە. شایعەکە دەڵێ ئەو بیرە دەتوانێ شووکردنی کچان رێك بخات ئەگەر سوێند بخۆن ئامادەن گوێڕایەڵی ئیمامی شاراوە بن و چل شەو لە گومان و خەڵوەت و نیگەرانی لەپاڵ ئەو چاڵە تاریکەدا بەسەر ببەن. لەکاتێکدا ئافرەتەکە چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە، بەچاوی فزوڵی بەشوێن دیارییەکانی دراوسێکەیدا دەگەڕا و بەراوردی دەکردن بەو دیاریانەی ئەو پێشکەشی کردن: چەرچەف و بەرگە نوێن و قوماشی گرانبەها کە لەسەر زەوییەکە راخرابوون و فەرشەکەیان داپۆشیبوو.

پاشان ژنە شازادەیەکی مەغۆلی گەیشت. پرچە درێژەکەی، کە خەریك بوو دەیدا لە زەوی، بە دەزووی ئاڵتونی کردبووە پەلك. دوو سورەیا و چەند قاپێکی گەورەی هەلگرتبوو، لەگەڵ مەنجەلێك لە زیوی رەق. شازادەکە باڵا بەرز بوو. شانە پانەکانی سەرنجی ئافرەتانیتری راکێشابوو. هەر کە هاتە ژوورەوە هەموویان ئەو پرسیارەیان کرد کە بووبووە خووی سەریان: ئایا راستە ئەو ئافرەتە پاش ئەوەی ئێرانی لەسەر پشتی ئەسپێك لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا ، لە شارێکی خاپوورکراو و سووتاوە بۆ یەکێکیدی، بڕیوە، هەرگیز لە نەسرخانی مەزن جیانەبووەتەوە کە لەسەر شانی راستی کەوتبوو؟ ئەویش بەدۆستانە و بەزمانێکی رەکیکی فارسی وەڵامی دایەوە و زەردەخەنەیەك لەسەر رووخساری بوو کە ددانە ئاڵتونیەکانی پیشان دا. ئەمیرە غوردجی شێوەی هێڵی چەپوچواری خاچی لەسەر یەکێك لە ددانە بڕەرەکانی بینی. لەوبارەیەوە پرسیاری کرد، پێی وترا دایکی ئەو ئافرەتە مەغۆلییە کە دیاریەکانی پێشکەش کرد مەسیحییە و وردتریش بڵێین نەستوورییە. کاتێ بە لازمانی ئەو ددانەی لێسایەوە کە لە شێوەی خاچدا بوو، وتی ئەو هەرگیز سەفەری نەکردوە بەبێ ئەوەی خێوەتی کەنیسەکەی لەگەڵی بێ، تا نوێژی مردوو بکات پێش ئەوەی بنێژرێ و تا هەرکات ویستی نوێژ بکات.

کەنیزەکێکی رەشپێست قاپێکی گەورەی هێنا چەندین پێشخۆر (موقەبیلات)ی تێدا بوو: گوێز و بادام و هەنجیر و هەڵوژەی وشك و قەیسی وشك. پاش ئەوەی لەبەردەم خاتوونی ماڵدا کڕنوشی برد، پرسی ئاخۆ ئەویش دەتوانێ بەشداریی کەرەمی پیرۆزیان بکات تا جەهازی چاوی چەپی گەورەی گەورەکان بەتاکە خشڵ کە هەیەتی بڕازێنێتەوە، ئەویش بە موسیلەیەکی پەنجەی پێ، کە دایکی پێش ئەوەی بۆ هەتاهەتایە ماڵەکەی و ئاسمانی گوندەکەی بەجێ بهێڵێ، پێی داوە. ئەمیرە دەستی لە پرچە لولەکەی کەنیزەکە نزیك کردەوە کە سەری هێشتا لە باری سەرکزکردندا خەریك بوو لە زەوی دەدا و رێگەی پێدا موسیلەکەی ببەخشێ. پاشان پرچی ئافرەتە رەشەکە کە لەژێر دەستە پێداهێنەکەدا وەك دارستانێکی چڕ دیار بوو، بەپارچەیەك قوماشی بەئاڵتون چنراو داپۆشی. ئافرەتە زنجییەکە سەری بەرز کردەوە، شکانەوەی کانزا بەنرخەکە لەسەر رووومەتە تاریکەکەی، ئافرەتانیتری سەرسام کرد.

ئوستای بەخێوکەر ئەو پارچانەی بۆ جەهازی بوکێنی کچەکەی سەلاح بەکار دەهێنران بردنی و باری کردن لە هێسترێك کە لە تەویلەی یەکێك لە ئەندامانی خێزانی شاهانە بوو و ناردنی بۆ قوتابخانەکەی رۆمی.

چەندە بگەڕێمەوە بۆ بیرەوەریی خۆم، ناتوانم شتێکی وام بیر بێتەوە. تەنانەت دایکم کە بەدەوڵەمەندی ژیا هێندە دیاری زۆری بەخەیاڵدا نەهاتووە.

رۆمی خۆی هات بۆ بینینی جەهازەکە. سەرسوڕمانی دەربڕی و داوای کرد بکرێ بە دوو بەشەوە. کچە گەورەکەی سەلاح کە پێی دەوترێ "چاوی راست" رازی بوو بەبێ هیچ مارەیيەك شوو بە سوڵتان وەلەد بکات. لەبەرئەوەی کەسایەتی فاتیمەی دەناسی ئەو دەستپێشخەریەی پێ باش بوو تا بەر بە سەرهەڵدانی

ناکۆکی لەناو خێزانەکەدا بگرێ. هەستم بە زەردەخەنەی سوڵتان وەلەد کرد، چونکە داواکەی باوکی ئەوی لە چەندین سەعات رەخنە و قاڵەقاڵ رزگار کرد.

نیوەکەیتریشی بەپشتی هەمان هێستر بەناو کۆڵانە تەسکەکانی قۆنیەدا گوێزرایەوە تا ماڵە سادەکەی خۆشنووسەکەی پێ برازێنرێتەوە. نیزامی سەرسوڕماو ژوورەکانی وەرشەکەی پڕ کرد لە جوانترین خشڵی زێڕ و زیو. کاتێ جلوبەرگ و کڵاوە درێژەکەی لە سندوقە کۆنەکەدا دانا کە عادەتی وابوو کەرەستە بەنرخەکانی نووسینی تێدا هەڵبگرێ، دەستی بە لەشی رەق و ساردی مارەکە کەوت کە یەکەم جار وایزانی قامیشە. مارەکە چاوەڕوانی ئەوە بوو کڵاوە درێژەکەی زاوا پڕ بکات. ئەم نەریتە کە باب و باپیران لە دەشتاییەکاندا دەیانکرد، بەشێك بوو لە راهێنانی دوور و درێژ بۆ بەدیهێنانی چێژ.

بەم شێوەیە هاوسەرگیریی نیزامی خۆشنووس و هەدیەی کچە بچوکی سەلاح، چاوی چەپی رۆمی، بەڕێوە چوو، پاشان.

پاشان دایکی سەلاح لە رۆژێك لە رۆژانی بەهاردا مرد و کۆڵانەکان پڕ بوون لە بۆنی گوڵی ئەکاسیا و سێبەری حەماڵەکان کۆڵانە درێژ و رێکەکەیان بڕی.

وەك ئەوەی خوشکی بێ، کیرای ژنی رۆمی بایەخی بە جەنازەکە دا. ئەو وەك کەسێك لە ئەندامانی خێزانی خوالێخۆشبوو تەرمە کفنکراوەکەی لەسەر تابوتێکی بەئاوریشم داپۆشراو دانا، چوار پیاو کە کیرا خۆی دەستنیشانی کردبوون هەڵیانگرت بۆ مزگەوت و باشترین سرودبێژان لەپێش کەژاوەکەوە بوون. لە پێشینەیەکی نائاساییدا کیرا بۆ یەکەم جار پاش ئەوەی رۆمی لە چوونەدەرەوە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن ئاگەداری کرد، لە ماڵ چووە دەرەوە و بەهۆی ئەو نەفرەتەوە بەدرێژایی ژیانی هەستیاری بەرانبەر سەرما هەبوو و تەنانەت لە چلەی هاوینیشدا خۆی بە فەروی رێویەکی رەش دەپێچایەوە و کەوتە پێش ژنە شیوەنگێڕەکان، تا بەهەموو شاری پیشان بدات چەندە وەلای بۆ بنەماڵەی سەلاح هەیە. بەم ئامادەبوونەی، سنوورێکی بۆ عادەتی بێمانای دڵپیسی دانا.

کۆمەڵێ خەڵك چوونە ناو کەژاوەکە، کە بەناو کۆڵانەکانی شاردا رێگەیان گرتەبەر. کاتی ژنە شیوەنگێڕەکان کە شیوەن و رۆڕۆکەیان لە پێشیانەوە دەرۆیشت، بە رووخسارە رەش و پرچە تەنکەکانیانەوە گەیشتن، کیرا فەرمانی پێکردن بێدەنگ بن، ئەوانیش لەبەرانبەر چەند درهەمێکدا بێدەنگ بوون. ئاشکرایە تێچووی بێدەنگی لە هی قاڵەقاڵ زیاترە. کاتێ کەژاوەکە گەیشتە دەرگای مزگەوت، سرودبێژان وەستان و چوار پیاوە ریش درێژ و رەنگ زەردەکان تەرمەکەیان لەبەردەم میحرابەکەدا دانا و ئافرەتەکان لە حەوشەی مزگەوتەکەدا مانەوە. پاشان کیرا نزای مردووی خوێند. دوای ئەوە رۆمی لای هەردوو پێی خوالێخۆشبوودا وەستا و نوێژی مردووی کرد. تەنانەت ئەو وشە پیرۆزانەی لە دەمیەوە دەرچوون شێوەی ئیقاعیان وەرگرت. لەدڵی خۆمدا ترسام دەست بکات بە خولانەوە و سەمای بیستن لەبەردەم تەرمەکەدا پاش ئەوەی

بەبیستنی وشەکانی قورئان ئەوین دایگرت. بەپێی نەریت گەورەترین پیاوی خێزان نوێژی مردوو دەکات، ئەگەر ئەو حازر نەبوو کەسێك لە بنەماڵەکە جێی دەگرێتەوە. بەڵام ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار و سەرەڕای بوونی کوڕی خوالێخۆشبوو، دۆستی خێزانەکە نوێژەکەی کرد. ئەوەیش شتێکی نوێ و ناکاو بوو.

کاتێ رێو ڕەسمە ئاینیەکان تەواو بوون، کیرا بەسەرۆکایەتی کەژاوەی ژنان یاوەریی تەرمەکەی کرد بۆ حەمام و داوای لە ژنە مردووشۆرەکان کرد روومەتە وشکەکە بەباشی بشۆن تا وای لێبێ وەك روومەتی بوکێکی گەنجی لێ بێ. تەرمەکە سێ جار بەئاو شۆرا و بە ئاوی زەیتون و پاشان کافور دەستی تێ درا، مووی بنباڵەکانی تاشران، بە پەشتەماڵێکی لۆکەیی داپۆشرا و بە دوو چەرچەف پێچرایەوە، پاشان تەرمەکەیان گێڕایەوە بۆ ناو تابوتەکە و هەڵیانگرت و بردیان بۆ گۆڕستان و لەوێ بەخاك سپێردرا، رووی کرایە قیبلە و سەری بە پارچەیەك خشت راگیرا. کاتێ خۆڵ بەسەر گۆڕەکەدا کرا سەقفێکی لەخشت بۆ دروست کرا کە لەسەر چوار پایە وەستابوو.. وەك دیاریەك لە رێچکەکەی سەلاحەوە.

دوای ئەوەی کیرا گەڕایەوە قوتابخانە، داوای کرد دەرگاکان واڵا بکرێن و خوانێك ساز بکرێ. خواردن بەسەر هەژاران لەوسەری شار دابەش کرا و قورئانخوێنایشن چەند ئایەتێك لە قورئانیان خوێند.

لەو ماوەیەدا، تاریکی باڵی بەسەر گۆڕستانەکەدا کێشا و تازیەکاران بەناو گۆڕەکاندا دەهاتن و دەچوون. رۆمی و سەلاح کە لەتەنیشت گۆڕەکە وەستابوون چاودێریی کرمێکی زەوییان دەکرد کە بەخاوی بەزەحمەت خۆڵە تەڕەکەی کون دەکرد تا دەست بەکاری دوور و درێژی شیکردنەوەی لاشەکە بکات.

کاتێ کردمەکە ون بوو، رۆمی بە سەلاحی وت: "با بڕۆین".

سەلاح چەمایەوە. بەبێ ئەوەی ببزوێ بەگەورەکەی وت: "مافی زۆری لەسەرمە. دەمەوێ لە سەختیەکانی گۆڕ و ترسی لە دوو فریشتەکەی مەرگ بیپارێزم. لەبەرئەوەی لە سزای گۆڕ دەترسێ من داوات لێدەکەم بەتەنیا جێی نەهێڵین. لە خوا دەپاڕێمەوە پەرییەکان یاوەری بن. دوای ئەوە، ئەڕۆم".

سەعاتێك تێپەڕی، هەردوو پیاوەکە وەستابوون و نەدەجوڵان. پاشان سەلاح بزەیەکی کرد و تەماشای رۆمی کرد و وتی: "ئێستا، دەتوانم بگەڕێمەوە".

لەوێ، لە گۆڕەکەدا، ئیتر خوالێخۆشبوو بەتەنیا نەبوو.

## لەسەر ڕێگەی گۆڕەکەم سەما دەکەم

ماوەیەکی زۆر بەسەر دانیشتی سوڵتان عیزەدین لەسەر تەخت تێنەپەڕیبوو. ئەسفەهانی وەزیری، یەکێك لە موریدەکانی مەولانا بوو و بەردەوام سەری لێدەدا. زۆرجار باسی ئەو سوودە ڕۆحیانەی بۆ سوڵتان دەکرد کە دەکرێ لەو دانیشتنانە و ڕۆچوون بەناو هەستەکانیدا بەدەستیان بێنێ. بەڵام سوڵتان کە مەیلێکی گومانگەرایی تێدا بوو، داوای بەڵگەیەکی دەکرد بۆ سەلماندنی ئەوە.

ڕۆژێکیان کاتێ عیزەدین لە گەشتێکی ڕاودا بوو لە دەشتەکانی قۆنیە، مارێکی بچوکی بینی بەرەو کەناری گۆمێك دەکشا. بەبێ ئەوەی دەستوپێوەندەکەی بزانن مارەکەی گرت و خستیە ناو سندوقێکی زێڕینی بچوك، کە ئیمپراتۆری قوستەنتینیە پێشکەشی کردبوو. بۆ هەرکوێ بچوایە لەگەڵ خۆی دەیبرد. کاتێ گەڕایەوە سەربازگەکە و چووە ناو خێوەتە شاهانەکە کە بەباشترین و گرانبەهاترین جۆری قوماشی نەخشێنراو بە ئاڵتون و بەردی پیرۆز ئامادە کرابوو، وەزیر و پیاوماقوڵ و فەیلەسوفانی کۆکردەوە و لێی پرسین ئاخۆ چی لەو سندوقەدایە کە بەتوندی دایخستوە.

"باش سەیری ئەم سندوقە بکەن کە ئیمپراتۆری مەسیحیی قوستەنتینیە پێشکەشی کردم وەك داننانێك بە ڕەسەنایەتی ئاینەکەماندا و پێی وتم: "ئەگەر دانایانی کۆشکەکەت زانییان ئەو سندوقە چی تێدایە، ئەوە بۆم دەردەکەوێ ئاینەکەی ئێوە ڕاستە". دەی بڕۆن و بیر بکەنەوە و ڕاوێژ بە ئەستێرەکان یان هەر کەسێك حەز دەکەن بکەن، بەڵام دەمەوێ بزانم ئەم سندوقە چی تێدایە".

دوای ئەوەی باش لە سندوقەکە وردبوونەوە و کێشایان، هەندێ لە پیاوەکان چوون خۆیان بەتەنیا بیر بکەنەوە، هەندێکیتریان گرووپیان دروست کرد بۆ تاوتوێکردنی ئەوەی لەو سندوقەدایە. هەندێکیتر پەنایان بۆ تۆمار و ئەرشیفەکان برد، وەزیرەکانیش چوون بۆ بەندیخانەکان و پرسیاریان لە هاوڕێکانی پێشوویان کرد، پاش ئەوەی بە دەسەسرەکانیان لوتیان گرت تا بۆنی بۆگەنی زیندانیەکان، کە ئەسپێ تێی داون، نەچێ بەسەریاندا. بەڵام کەسیان هیچی نەزانی لەبارەی ئەوەی چی لەو سندوقە ئاڵتونیەدایە ئەگەرچی ئەستێرەناسان تەنانەت پرسیاریان لە ئاسمان خۆیشی کرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدانەوە. عەڕافەکان بۆقەکانیان ڕیز کرد تا بەهۆیانەوە پێشبینی بکەن، کە ئەوە ڕێگەیەکی نوێیە بۆ پێشبینیکردن لە چین فێری بوون: باوەڕیان وابوو قیڕەی بۆق لە پیتە بزوێنەکان دەچێ. بەڵام دەنگی سەرەمێکوتەکان لە پیتە نەبزوێنەکان دەچێ. بەڵام ئەوانیش شکستیان هێنا، چونکە بۆقەکان هیچ وشەیەکی ماناداریان نەخستە ڕوو، بەڵکو خامۆش بوون و لە مەسەلەی ئەو مارەدا هیچ وەڵامێکیان نەبوو.

لەکاتێکدا هەمووان خۆیان بۆ نوێژی عەسر ئامادە دەکرد، ئەسفەهانی وەزیر داوای لە سوڵتان کرد سەردانی ڕۆمی بکات، کە دەکرێ ئەو لوغزەکە ئاشکرا بکات.

چەند ئەسپەوانێك كە سواری ئەسپی خێرا بوون هاتن تا هەواڵی سەردانی خاوەن شكۆیمان پێ رابگەیەنن. لەترسی بیرۆكەی هاتنی خاوەن شكۆ، بەپەلە خۆمان ئامادە كرد بۆ پێشوازیكردن لە سوڵتان بەو شێوەی شیاوی خاوەن شكۆیانە. مەولانا تاكە كەس بوو لەسەرخۆ بوو. سەڵاح هێشتا لە بازاڕ بوو دوكانەكەی دادەخست. ئێوارە كەژاوەی شاهانەی سوڵتان گەیشتە قوتابخانەكە.

یاوەریی سوڵتانمان كرد بۆ "بیستنخانە"كە. ئەوە یەكەم جار بوو سوڵتان لەنزیكەوە ببینم. جلە رەسمیەكانی لەبەردا بوو: كراسێكی ئاودامانی ئاوریشمیی سوور، كە دوگمەی زومروت و یاقوت و ئەڵماسی لێ درابوو. ئەو سندوقەی بەدەستەوە بوو كە نهێنییە پارێزراوەكەی تێدا بوو، وەك ئەوەی گۆچان یان هەڵۆیەكی ئیمپراتۆری بێ.

كاتێ سەڵاح لە بازاڕ گەڕایەوە، چووە ژوورەكە. مەولانا بانگی كرد بێ لەتەنیشتی دابنیشێ. ماوەیەكی زۆر بەسەر بەخشینی ئەو پێگە گەورەیە بە زێڕنگەرەكە تێپەڕیبوو. لەبەردەم سوڵتاندا چەمایەوە، پاشان بەبێدەنگی لەتەنیشت رۆمی دانیشت.

سوڵتان بەئاماژەكردن بۆ سندوقەكە لە مەولانای پرسی چی تێدایە، رۆمی ئاوڕی دایەوە بۆ لای سەڵاح و وتی: "با شێخەكەمان نهێنی سندوقەكەت بۆ شەرح بكات". سەڵاح بەبێ ئەوەی یەك ساتیش دوودڵی بنوێنێ جارێكیتر بۆ سوڵتان چەمایەوە و پێی وت:

"ئەی سوڵتانی ئیسلام، بۆچی مارێكی بچوكت هەڵگرتووە و دەسوڕێیتەوە؟ بۆچی ئەو حەیوانە بەستەزمانە ناچار دەكەی لەو زیندانە بێهودەیەدا دەردیسەری بچێژێ؟ جەنابی سوڵتان من دەزانم هۆی راستەقینەی سەردانەكەت تاقیكردنەوەی مەولانایە، بەڵام ئەو كە دەزانێ چی لە سندوقەكانی ئاسماندا هەیە، ناوچە دوورەكانی هەسارەكەمان، بیرە شاراوەكانی ئافراندن و نهێنیی لوغزە ئیلاهیەكان دەزانێ، بۆ دەبێ گرنگی بە سندوق و مارەكەی تۆ بدات؟

لەو ساتەدا دیم سوڵتان سەری پەتی كرد و بوو بە موریدی یەكێك لە شوێنكەوتە نەناسراوەكانی، واتە زێڕنگەرێكی خاكی لە بازاڕی قۆنیە.

لەوكاتەدا مەولانا داوای لە ژەنیاران كرد سەمای بیستن دەست پێبكەن. هەر كە دەنگی مۆسیقا بەرز بوویەوە هەستایەوە و پەلی خۆشەویستەكەی گرت تا لەگەڵی بخولێتەوە. سوڵتان و دەست و پێوەندەكەی چاوەڕوانیان كرد تا سەماكە تەواو بوو، پاشانیش رێوڕەسمی گەڕانەوە بۆ كۆشك تەواو بوو. كاتێ رۆیشت، عیزەدین، سێبەری خوا لەسەر زەوی، ئاوڕی لە وەزیرەكەی دایەوە و وتی: "ئەگەر موریدەكانی ئەو هێزەیان هەبێ، دەبێ ئەو مەزنییە چی بێ كە لە ژیان و زیرەكی و نهێنیەكانی خۆیدا هەیە؟!

وەزیر وەڵامی نەدایەوە. ماوەیەك بوو هەوڵێ دەدا هەندێ نهێنی بۆ باس بكات و لەبارەی تێگەیشتنی جیهانی بابەتە غەیبییەكان بێدەنگ بوو، چونكە وشەكان ناتوانن گوزارشت لەو شتانە بكەن كە وەسفكردنیان مەحاڵە.

لە سەرەتای كۆلانێكی بچودا كە شەبەقی بەرەبەیان هەندێ حەیا روناكی كردبووەوە، سوڵتان سندوقەكەی كردەوە و مارەكەی بەرەڵا كرد. پاش كەمێك دوودڵی، مارەكە جوڵە باوەكەی دەست پێكرد و بەجوڵەكانی لەشی ناوی "رۆمی" لەسەر زەوی وێنە كێشا.

ساڵی ٦٥٤ی كۆچی (١٢٥٦) فەرماندەی مەغۆلی بایدو هێرشی كردە سەر ئەنادۆڵ و هێزەكانی گەمارۆی قۆنیەیان دا. خەڵكی شارەكە شارەزای ئەو شێوازانە بوون مەغۆل بەكاریان دەهێنان، لەبەرئەوە چاوەڕوانیی خراپترین شێوەكانی مردنیان دەكرد. لەترسی ئەتككردن و خنكاندن و سووتاندن بەزیندوویی و لەتوپەتكردن و بگرە خواردنیان، ترس و بیم دایگرتن. هەر كەسێك بیری لەو شێوازە دەكردەوە كە پێی دەكوژرێ. دۆخەكە بێئومێدی دەگەیاند. خەڵك لە بازاڕ لە مامەڵەكردن لەسەر نرخی شمەكەكان وەستان و كەس گرنگی بە پاكوتەمیزیی گەرماوەكان نەدەدا. باخچەوانەكان وازیان لە بایەخدان بە گوڵەكانیان هێنا و سیس بوون. قوتابیان قوتابخانەكانیان بەجێهێشت. بانگدەران بانگكردن بۆ نوێژیان فەرامۆش كرد، منداڵان شیرخواردن لە سینگی دایكیان رەت كردەوە، دزەكان ئەوەی دزیبوویان گێڕانیانەوە بۆ خاوەنەكانیان، مشكەكان جیكاندیان، سەگەكان حەپاندیان، ژنێك زا و كیسەڵێكی بوو. توركیەك لەناكاو بەچینی قسەی دەكرد. پەڵەكان لەسەر جلەكان نەمان، ماسی لە رووبارەوە بازی دا، مانگاكان كەوتنە گۆشت خواردن، دراوگۆڕێك رووی كردە بازاڕ و هەندێ قوماشی دووراوی كڕی و كەوتە دورینیان.

لەلاكەیتری شوورەكانەوە، مەغۆلە داگیركەرەكان دەستیان دایە ئامادەكاری بۆ ئەنجامدانی هێرشەكەیان. كەس گومانی نەبوو لەوەی سەركەوتن وەك عەشیقەیەكی پشت تێكراو رادەكات بۆ دەست لەمل كردنیان. بەڵام ئێمە دەمانزانی مەغۆل تەنیا بە غەزوی دوژمنەكەیان رازی نابن، چونكە جەنگی راستەقینە بەلای ئەوانەوە دوای شەڕ دەست پێدەكات، لەپشت بەرەی جەنگەوە، لەناو شارەكاندا. ئەوان جەنگەكانیان تەنها لەپێناو كوشتن و تالان و راوڕووتدا ئەنجام دەدا.

بەڵام لە قوتابخانە هەموو شت هێمن دیار بوو. قەت مەولانام نەبینی پرسیار لە سەلاح بكات، كە بەهۆی پیشەكەیەوە زیاتر دەیزانی چ دەگوزەرێ و ئاگەداری هەڕەشەكانی مەغۆل بوو، نرخی ئاڵتون بەشێوەیەكی شێتانە بەرز بوویەوە، بەڵام ئەمەیش دیسان نەچووە ناو گفتوگۆكانی هەردوو خۆشەویست.

لە ماوەی ئەو رۆژە رەشانەدا كۆمەڵێ خەڵك هاتن بۆ قوتابخانە، تا لە مەولانا بپرسن ئاخۆ چۆن رزگاریان دەبێ لەو چارەنووسە شوومە خراپەی مەغۆل بۆیان حەشار داون.

ڕۆمی لە ژوورەکەی چووە دەرەوە و پێڵاوەکانی لەپێ کرد، مێزەرەکەی ڕێك کرد کە بەهۆی سووڕانەوەی بەردەوامەوە شێوابوو، لەو بەلەکۆنەی بەدرێژی ژوورەکە کشابوو بۆ ئەو خەڵکەی لە گۆڕەپانی قوتابخانەکەدا گرد بووبوونەوە قسەی کرد.

دەستبەجێ وەرەقە و قەڵەمێکم دەرهێنا لە گیرفانم تا قسەکانی تۆمار بکەم:

"مەترسن، چونکە ئێوە خەڵاتی خوان بۆ شێخ سەلاح. شارەکە تووشی وێرانکاری نابێ و تا ڕۆژی قیامەت شمشێری مەغۆلی ناگاتێ. ئەوەی هێرش بکاتە سەر قۆنیە ناتوانێ خۆی لەو برینانە لابدات کە تووشی دەکەین، هەروەها بزانن مادام ئێسکی پیرۆزی باوکم لە خاکی قۆنیەدایە، ئەوا ئەم خاکە لە نەهامەتی پارێزراوە. بەڵێ ئەم شارە لە بەناوبانگترین شارەکان دەبێ لە جیهاندا. نەوەکانمان بەئارامی و ئاسایش لێرە تاهەتایە دەژین".

پاشان گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، پێڵاوەکەی داکەند، مێزەرەکەی لابرد، پشیلەکەی گرت و گەمەی لەگەڵ دەکرد و دەستی  بە فەروەکەیدا دەهێنا و بەسەلاحی وت: "ئەو خەڵکە باوەڕیان وایە وێرانکاری و مەرگ و تیاچوون و فەوزا و ترس کاری مەغۆلن، بەلام ڕاستییەکە نازانن".

پاشان دیم مەولانا بەپێوە وەستا و باڵەکانی لەگەڵ دیوارەکەدا وەگەزدا و سەری لەلایەکەوە بۆ لایەکیتر دەبرد و ئەو بەیتانەی خوارەوەی وت، کە تێیاندا گەردوون و مرۆڤ، کاتێ دەسووتێن، دەبنە یەك شت:

ئەگەر هەناسەی خۆشەویست بەرز بوویەوە و
بەر گەردوونی لە ئاگر دروستکراو کەوت،
ئەو گەردوونەی بێ ئەسڵە،
ئەتوێتەوە و ئەبێتە تۆز.

گەردوون هەموو ئەبێتە دەریا،
لەوانەیشە دەریا ببێتە عەدەم،
ئەوکاتە نە خەڵك نە حوکمڕانان نامێنن،
ئەوکاتە مرۆڤ ئەپلیشێنرێ.

چڕە دوکەڵێك بۆ ئاسمان بەرز ئەبێتەوە،
نە خەڵك نە فریشتە نامێنن،
لەناکاو ئەو دوکەڵە،
لەو سەقفە گەورەیە ئاگر ئەدا.

**کاتێ ئاسمان پرزە پرزە ئەبێ:**

**نە کائین ئەمێنێ نە شوێن و**

**جوڵە لە گەردووندا،**

**دووچاری خەم و ئازار ئەبێ.**

**هەندێ جار ئاگر ئاو ئەبا،**

**هەندێ جاریش ئاو ئاگر لووش ئەدا،**

**لە دەریای عەدەمەوە، شەپۆلەکان،**

**لە رەش و سپی ئەدەن.**

**خۆر بێکۆتا بچووك ئەبێتەوە،**

**لە نووری هەناسەی مرۆڤایەتیدا،**

**هیچ لە موریدی تازەکار چاوەڕوان مەکە،**

**ئەگەر مامۆستاکە نەزان بێ.**

**مەریخ  پیاوەتی لەدەست دا،**

**کتێبی مشتەریش ئەسووتێ،**

**ئیتر مانگ جوانی نەماوە و**

**گەشانەوەکەی ئاوازێکی خەمناك دەرئەکا.**

**عەتارد ئەکەوێتە ناو قوڕ و**

**گڕ دەوری زوحەل ئەدات و**

**چیتر زوهرە خەمبار نابێ،**

**چونکە ئاوازێکی شاد ئەژەنێ.**

**نە پەلکە زێڕینە ماوە نە ئاسمانێك،**

**نە مەی ماوە نە جام،**

**نە چێژ و نە خۆشی،**

چیتر مەرهەم برینەکان چاك ناکاتەوە.

ئاو شێوە وێنە ناکێشێ و

با هەڵناکات و

باخچە هاوار ناکا: خۆشی بۆ تۆ،

هەوری نیسان: نەك یەك دڵۆپ.

نە ئازار ماوە و نە چارە،

نە دوژمن ماوە و نە شایەت،

نە نای هەیە و نە ئیقاع،

نە عودێك ئاواز ئەژەنێ.

سەرجەم هۆکان لەناو بران،

ساقی خزمەتی خۆی ئەکا،

هەناسە ئەڵێ: "ئەی خوای گەورەم!".

دڵ ئەڵێ: "ئەی خوایە کێ ئەزانێ!".

کەوتمە چاودێرییکردنی مەولانا کاتێ لەسەر ریتمی ئەم قەسیدە غەزەلییە، کە یەکێکە لە جوانترین ئەو قەسیدانەی تا ئەو کاتە نووسیبوونی، سەمای دەکرد و دەخولایەوە. سەلاحم دی و زانیم هەڕەشەی راستەقینە لەلایەن ئاپۆرای مەغۆلەکانەوە نایەت کە لەژێر شوورەکانماندا دەقیڕێنن، بەڵکو لە هەناسەی خۆشەویستەوە دێ، کە گەردوون دەکاتە تۆز و مرۆڤ و مەلائیکە بەبێ جیاوازی دەهاڕێ، کە خۆیان بەرەو عەدەم پەلکێش دەکەن.

وەرزێکی رۆیشت و وەرزێکیتر هات و قۆنیە نەکەوتە بەر هێرشی مەغۆل، لەبەرئەوەی دیاریی خوایە بۆ شێخ سەلاح. جارێکیدی وەرزی زستان عەبا بریسکەدار و ساردەکەی بەسەر زەوی و دەشتاییەکانی ئەنادۆڵدا کێشا، ئەو سەرمایەی گۆشت و ئێسکی شەمسی کون کون کردبوو —ئەو پیاوەی نینۆکانی رەش دەبوونەوە و پشتی دەچەمایەوە— و ئێستا لە درز و پەنجەرەکانی ژوورەکانی قوتابخانەوە دزە دەکاتە ژوورەوە، راستەوڕاست بۆ ژوورەکەی سەلاح.

وادیار بوو نەخۆشی ژیانی زێڕنگەرەکە لەبەین دەبات. هەمووومان ئەوەمان دەزانی. لەکاتێکدا چاوەڕوانی مەرگی دەکرد، کەس سەردانی نەدەکرد یەك کەس نەبێ، ئەویش رۆمی بوو. مەولانا شەوێکی تەواوی لەگەڵ

پیاوە گیانکەنشتەدا بردە سەر و لەگەڵیدا موعجیزە و نهێنیەکانی بەش دەکرد. شەبەق، کاتێ بەشەکەتی و پەرێشانی ژووری مەرگەکەی بەجێهێشت، من لە داڵانەکەدا کە دەچێتە لای ژووری نووستنەکەی چاوەڕوانم دەکرد. تاسەیەکم بەدەستەوە بوو. چەند قومێك چای خواردەوە، پاشان پەنجەکانمی گرت کە دەبێ بەبەراورد بە پەنجەکانی پیاوە گیانداوەکە، بەلایەوە وەك ئاگر بووبن، پاشان بەمنەتبارییەوە تەماشای کردم. لەو ساتانەدا ئیتر وشە هیچ مانای نەبوو.

هەیوانەکە کورت بوو و دەمزانی هەنگاوەکانمان کەم بوون: تەنیا بە سێ هەنگاو دەگەیشتینە بەردەم دەرگای ژووری نووستنەکەی. زانیم دوای پازدە ساڵ ئولفەتی رۆژانە، ویستم، بگرە بەکوڵ نزام دەکرد گەیشتنمان دوا بکەوێ، سێ هەنگاوەکە ببن بە چوار، بگرە پێنج و شەش هەنگاو، بەوەی خوای گەورە، کە بەدرێژایی ژیانم گوێڕایەڵیم کردوە، بەدەم نزولەکەمەوە بێ.

ژماردم یەك دوو سێ و دەرگا قایمەکە رێگەی داخستم. گەورەم چووە ژوورەکەی و منیش چوومە حەوشەکە تا قوتابخانەکە بەجێ بێڵم و بگەڕێمەوە بۆ لای ماڵ و خێزانەکەم.

بەرێگەدا بیرم لەو دە ساڵە کردەوە کە سەلاح و رۆمی پێکەوە بەسەریان برد. یەکێکیان ئۆغر دەکات و ئەویتریشیان قەدەرەکە قبوڵ دەکات، کە وەك بای پاییز لە سەلاحی دا، "تیرە وێڵەکە".

پێش دە ساڵ، ئۆغرکردنی شەمسم لە شەوێکیتر لە شەوەکانی سەرما و بەفردا تۆمار کرد، پاش ئەو سووکایەتیانەی پێی کرا.

لەکاتێکدا بەسەر بەفرەکەدا دەڕۆیشتم، هێشتا دەمتوانی گوێم لە دەنگی لەسەرما لەرزیوی شەمس بێ لەو رۆژە سەختانەدا، کاتێ رۆمی بەئەنقەست جیابوونەوەیانی دەوروژاند، سووتانی ئامادە دەکرد.

"لەڕاستیدا تۆ، بەڵێ م تۆ بووی وتت من بەدقدوم و توند تەبیاتم. نەهامەتی لە منەوە هەڵئەقوڵێ، چونکە تۆ رۆحمت کردوە بە وڵاتت. رۆح گومڕا ئەبێ ئەگەر مەیلی دەستلەملان و ماچماچێن و دەسبازی دایگرت، کە لە شێوەی قەسیدەیەکدا پێشکەش کرابێ. لە ناخمدا نیشانەی لێخۆشبوون هەیە. هەر زوو ئەکەومە سەر لاکەیتر و لە غوفراندا نوقم ئەبم. ئاماژەکان لەوێن. بەڵێ، من ئەیانبینم، ئەوانە لەوێن".

پێش چەند رۆژێك لە دیارنەمانی شەمس پێی وتم "زستان بەڕێوەیە، شەمس پێویستی بە پاڵتۆیەك هەیە". بیرم نایەت ئەو پاڵتۆیەم بۆ کڕیبێ کە داوای کرد، تاکە خەمم پێش لە رۆیشتنی ئەوە بوو لە هەر دەستدرێژیەك بیپارێزم و پەرۆش بووم بەتەنیا پێ نەخاتە ئەودیو دەرگای قوتابخانەکە. بەڵێ پاڵتۆکەی شڕو وڕ بووبوو، بەڵام من بیرم تەنیا لای لادانی بوو لە رووداوی ناخۆش. ئاخۆ ئێستایش هەر سەرمای بێ؟ بۆچی گوێنەدانم بەکڕینی پاڵتۆیەکی تازە بۆی ئێستا لەپڕ ئازارم دەدات لەکاتێکدا من بەرێگەیەکی بەبەفر داپۆشراودا دەچم بۆ ماڵەوە؟ سەلاح گیان دەدات و منیش سەرزەنشتی خۆم دەکەم لەسەر هەڵەیەکی پێشوو کە بەرانبەر شەمس کردومە، کە رەنگە هێشتا زیندوو بێ. لەکاتی رۆیشتنمدا رۆیشتنەکەی شەمس و

قسەکەی سوڵتان وەلەدم بیر کەوتەوە کە وتی "لەپڕ، لێمان ون بوو". بیرم دێ زریانووسیش وتی "بەڵێ، لەپڕ دیار نەما". من کە هەستم دەکرد ماڵەکە ئەوی تێدا نیە، گوێم لە ڕۆمی بوو لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

**وەك مۆمێك روناکی کردینەوە، بۆ کوێ چوو؟**

**بەبێ ئێمە بۆ کوێ چوو؟**

**هەموو ڕۆژ دڵم**

**وەك گەڵای دار ئەلەرزێ.**

**بەتەنیا، لە نیوە شەودا،**

**دڵدز، بۆ کوێ چوو؟**

**وەك شێتێك وێڵی بیابان بووبێ:**

**لەو بیابانەدا.**

**مامزەکە، بۆ کوێ چوو؟ ئەو لەگەڵمانە،**

**تەنانەت ئەگەر لەگەڵ خەڵکیدیش بێ،**

**مادام لێرە نیە،**

**ئەی بۆ کوێ چوو؟.**

سەڵاح لە گیان کەنشتدا بوو. لەو شەوەدا لەکاتێکدا بەپەلە هەنگاوم هەڵدەگرت، وەك ئەوەی شەوقی برقێك لەپڕ ئاگری بەردابێتە ئاسمانی تاریك، تەنیا هەندێ یادەوەریی یەکەم دیداری گەورەمم بینی. پێکانم لە بەفردا چەقین، بەکۆڵانە تاریکەکانی قۆنیەدا تێپەڕیم، بەلای هەندێ پشیلەدا گوزەرم کرد کە گوێیان بەمن نەدا، سەگ دەوەڕین، گوێم لە دەنگی شەمس بوو بە ڕۆمی دەوت "پەیمانێکم لەگەڵ شادی گرێ داوە، پەیمانەکەم ئەوەیە شادی بۆ من بێ".

لوورەلووری کزەبای بەفرین، ئەو بایەی ڕێگەی لە شەمس دەگرت لەکاتی وەرزی زستاندا لە دەرەوەی قوتابخانە بگەڕێ، ڕێگر نەبوو لەوەی گوێم لە رازیبوونی مەولانا بێ:

**ئەگەر تۆ عاشقی،**

**پشت لە خەم کە،**

**بەشداریی زەماوەند و جەژنەکان بکە،**

**واز لە شیوەن بێنە.**

هەروەها دەتوانم گوێم لێی بێ کە دەڵێ:

**قەدەری گوڵ پێکەنینێکە، ئەتوانین چی بکەین،**

**ئەگەر فرمێسکی نەبێ؟**

**بەهۆیەوە، نێرگس و گوڵ نەشونما ئەکەن،**

**لە دڵی بێدارمدا.**

**دڵم ماڵی شادییە،**

**ئەتوانم چی بکەم ئەگەر خەمبار نەبم؟**

**خۆم لە هەر شتێکی خەماوی لائەدەم لە دنیادا،**

**رقم بە رقە.**

لەو ساتەدا سەلاح دووایین هەناسەکانی دەدا. پێیان وتم پێش ئەوەی گیانی بەپەروەردگاری بسپێرێ، بیری رۆمی خستەوە کە ئەو کاتێ لەژێر کاریگەریی شەمسدا بوو، بڕیاری دا واز لە فێرکردن و بانگەواز بێنێ، ئەو کەسەی وای لێکرد وتارێکی کۆتایی بدات نە سوڵتان بوو نە وەزیر و نە کوڕە ئازیزەکەی، بەڵکو کوڕی ماسیگرێکی سادە بوو لە گوندی کامیلا، پاش ئەوە بوو بە زێڕنگەر لە بازاڕی قۆنیە، سەلاح خۆی. پاشان وتی:

"تەرمەکەم بەهەموو جۆرە تەپڵێك داپۆشە: تەپڵ و کەوانە و دەف. بەشادومانی بچۆ بۆ لای گۆڕەکەم و بخۆرەوە و چەپڵە لێبدە. لە رێگەی چوون بۆ سەر گۆڕەکەمدا سەما بکە.

پاشان چاوەکانی لێکنا و "لە دنیای شێوەکانەوە سەفەری کرد بۆ ئەو ناشوێنەی رۆحەکانی تێدا نیشتەجێن".

رۆمی بەدەمی دووایین هەناسەی سەلاحی وەرگرت. بەپێکانی گۆرانیی تازیەباریی چڕی و ئەم قەسیدەیەی خوارەوەی وت، کە هەموو بەیتێکی بە وشەی "گریان" کۆتایی دێ:

**لە بێ تۆییدا،**

**زەوی و ئاسمان گریان.**

**عەقڵ و رۆح کە،**

**لە خوێندا دانیشتبوون، گریان.**

**خەمبار،**

**توانای قسەکردنم نیە.**

تا باسی بکەم چۆن،

ئەوانە سەرپاك گریان.

هەزار گەردوون بووی،

یەك کائین نەبووی.

دوێنێ دنیاکەیترم دی،

بۆ ئەم دنیا، کەوتە گریان.

لە چاو دوور کەوتەوە،

چاو شوێنت کەوت.

رۆح، بەدوای چاودا،

چەند فرمێسکێك لە خوێن، گریان.

ئەی سەلاحی فریشتە،

رۆیشتی.

بازی دەریایەکی خێرا،

نوشتەی بەختێکی باش،

وەك تیر فڕیت،

کەوان دایە پڕمەی گریان.

کەس ناتوانێ بەسەر تۆوە بگری،

ئەو کەسە پێویستە بزانێ،

چۆن دەکرێ رۆحە مەزنەکان،

بکەونە گریان.

کاتێ ئەو شەوە بەپەلە بانگ کرام بۆ قوتابخانە، ژەنیارەکان هێشتا لەدەوری مەولانا ئەڵقەیان بەستبوو کە شیوەن و سەمای دەکرد. سەرەڕای دەنگی تەپڵ و ئامێرەکانیدی کە "مزگێنی"یان رادەگەیاند، کەس لەوانەی رۆمی بانگهێشتی کردبوون زاتیان نەکرد دەست بەسەما بکەن. کاتێ هەستی بە دوودڵیمان کرد دەستی منی گرت، پاشان دەستی سوڵتان وەلەد و ئەنجا هی زریانوس و رایکێشاین بۆ سەمایەکی شێتانەی

درێژ. تا شەبەق سەمامان کرد، تا یەکەم تروسکایی ئەستێرەی رۆژ یاری لەتەك رووی ئەو پیاوە کرد کە مەولانا لە ماوەی دە سالّی رابردوودا ناوی نابوو "رۆژهەلاّتی نوور".

لە یەکی موحەڕەمی سالّی ٦٥٧ی کۆچی (٢٩ی کانوونی یەکەم/دێسەمبەری ١٢٥٨ ز) کاتێ پروشکە بەفر بەهێواشی ئەو تابوتە بەمەخمەلّ داپۆشراوەی دادەپۆشی کە پیاوماقولاّنی شاری لەسەر هەلّدەگیرێ، مەولانا بەسەر پەتی بە تازیەباری، شوێن کەژاوەی جەنازەکە و هەشت کۆمەلّە سرودبێژەکە، کەوت.

بەدەم رێوە سەمای بیستنی دەکرد و دەخولایەوە. بەفر لەژێر پێکانیدا دەبووە تۆپەلّ و بازنە. بەهێواشی شیوەنگێڕان بەرگە بەنرخەکانیان لابرد و پۆشاك و مێزەریان دەدایە سوالّکەران، کە لێرە و لەوێ بەناو کەژاوەکەدا پڕژابوون.

لە گلّکۆکەدا لەنزیك گۆڕی باوکی رۆمی گۆڕێك هەبوو چاوەڕوانی تەرمی دەکرد. دەنگی تەپلّلێدان و دەنگی سروبێژەکان چپەچپەکانی مەولانای کردبوو بەژێرەوە کە نوێژی مردووی دەکرد. تابوت هەلّگرەکان و زێڕنگەران کە تا لەژیاندا بوو دەرفەتێکیان لەکیس نەدا تێیدا زەبری لێ نەدەن و ناوی نەزڕێنن، لەبەردەم کێلی گۆڕەکەیدا چوون بەچۆکدا و داوای گەردن ئازادییان لێ کرد.

سولّتانی نوێ روکنەدین (١٢٥٧–١٢٦٦) کە لە شوێنکەوتووانی مەولانا بوو، پیاوماقولاّنی کۆشك و گەورە بەرپرسانی سەربازی نوێنەریان ئامادە بوو، لەنێویاندا، سەرباری روانینە خەمبارانەکەی و دوودلّییەکەی، ئەفسەرێکم ناسیەوە، بەلّێ خۆی بوو. ئەو پیاوە کە هاتبوو تا پرسەی سولّتانەکەی بگەیەنێ و خۆی بە خەمبار بۆ مردنی سەلاّح دەردەخست، هەر ئەو پیاوە بوو پێش چەند سالّێك زەلیل و ریسوای کرد و خوازیار بوو بە مردوویی بیبینێ.

# وشەکان بکێشە

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە باسی خۆم بکەم، کە ئەوە کارێکە کردنی ئاسان نیە. مردنی سەڵاح دیارنەمانی شەمسی سڕیەوە. ئیتر جگە لە مەولانا کەس باسی ئەو مانگە سارد و کڕێوەیەی نەدەکرد کاتێ ئەو دەربڕینە سادەیەی وت: "یفعل الله مایشاء و یحکم مایرید" و ڕۆمی شەمسی دایە دەست چەقۆی دوژمنانی. من ئەمڕۆ لەکاتێکدا ئەم دێڕانە دەنووسم یەقینم هەیە شەمسی تەورێزی ئەو ئێوارەیە نەکوژرا. ئاخۆ زامدار کرا، یان لێی درا یان تەنیا هۆشداری درایە؟ قەت ئەوە نازانین. دە ساڵ تێپەڕیوە و هێشتا نازانین لەکوێیە، لەگەڵ کێیە، یان ئەو بیرە شێتانە چین کە بەردەوامن لە ئەشکەنجەدانی؟.

لەکاتی بەخاکسپاردنی سەڵاحدا و لەکاتێکدا تەپڵەکان لێدەدران، شەمسم یاد کەوتەوە، ریشە تەنکە موو پەرش و بڵاوەکانی. جەستە لەڕ و لاواز، ڕەوتە زیندووەکەی، هەناسە گەرمەکەی، وشە تیژەکانی، متمانە بەخۆبوونەکەی، تەنانەت کەللەڕەقیەکەی. لەسەر ریتمی تەپڵەکان دەرکەوت و ون بوو. شەمسم دیوە کاتێ بێدەنگ، پەناگرتوو، مەرد بوو. بەڵام بینیویشمە کاتێ نیگەران، تووڕە و زبر بوو. ئەو پیاوەی دەیتوانی چەندین سەعات دابنیشێ بەبێ ئەوەی دەمی بەوشەیەك بترەکێ. بەڵام لەپڕ دەست بەقسە دەکات و ڕێگە بەکەس نادات یەك وشە بڵێ. ئەو پیاوەی بەلوغز قسەی دەکرد و هەستێکی بەهێزی لەلا بەجێدەهێشتین کە هەمیشە دەمانپرسی ئاخۆ بەڕاست لەکوێوە هاتووە. چ بەشێکی ئیلاهی لە ناخیدا لێدەدات. دەنگی دەفەکە شەمسی پیشان دام، کە ڕێزی زانست دەگرێ و دەینرخێنێ، بەڵام گەڕان بەشوێن ڕاستیدا بەبێسوود دەبینێ. شەمس کە ڕازی نەبوو دان بە تەریقەتی سۆفیەکان و ڕێوڕەسمەکانیاندا بنێ وەك سەرتاشین و وتنەوەی ناوی خوا و خەڵوەتکێشان، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو پیاوە بوو بەردەوام بۆ منی دووبارە دەکردەوە کە چوونە ناو سۆفیگەری پێویستی بە مامۆستایەك، مورشیدێك، وەلییەك هەیە. تەپڵێدان نەوەستا و بەراگوزەر ئەو پیاوەم دی کە جگە لە گوێڕایەڵی و ملکەچی لە هاوڕێکانی –کە دڵڕەقانە مامەڵەیان لەگەڵدا کرد– قبوڵ ناکات.

ئەو قسانەم بیرە کە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی ڕۆمی قۆنیە بەجێبێڵێ کردنی: "هیچ لە دۆستانمانەوە نایەت. ئەوان هیچ هەوڵێکیان نەداوە. وا باشترە تا زووە بچین بۆ جیهانەکەیدی، تا لە سزاکانیان سووك بکەین".

خۆڵ بەسەر تەرمەکەی سەڵاحدا کرا کە بەکفنێکی سپیەوە پێچرابوو. تەپڵە زۆرەکان یەکیانگرت و گەیاندینیانە ڕادەی نەشوە. مەولانا چەند ئایەتێکی خوێندەوە باسی مردنیان دەکرد و یاوەری جوڵەکانی سەما بازنەییەکەی بیستنی کرد. من، حوسام لەپڕ لە خۆمم پرسی بۆچی ڕۆمی هەرگیز ناوی ڕاستەقینەی شەمسی بەزماندا نەهات: محەمەد کوڕی عەلی کوڕی مولك داد خەڵکی تەورێز. بەڵێ، لەکاتێکدا کرێکارەکان

بەردیان لەدەوری گۆڕەکە دادەنا، دەنگی مەولانام بەر گوێ کەوت کە چەندین ساڵ لەمەوبەر سەبارەت بە ناسنامەی لە شەمسی دەپرسی:

"شەمسی تەورێزی! پێم بێژە تۆ کێی؟"

شەمس وەڵامی دایەوە "من خوا، من خوا، من خوا".

ئەو فرمێسکانەی لەو رۆژە خەمناکەدا لە چاوانی سوڵتان وەلەد رژان رێگر نەبوو لەوەی لەو بەهرە شاعیرانە تێبگەم کە لەپڕ دای بەسەر مەولانادا، کاتێ ویستی وشەی "خوا" بۆ وەسفی شەمس لە قەسیدەیەکدا بەکار بێنێ و بەزەحمەت دەیتوانی سەرواکەی رێك بخات. وەك ئەوەی گوێڕایەڵی بکات، ئیلهامی خوایی لە تەواوکردنی سەرواکەدا یارمەتی دا. لیستێکی بێسنوور نازناوم بیر کەوتەوە، ئەگەرچی هەرگیز بەناوی راستەقینەی خۆی بانگی نەکرد، کە بۆ شەمس بەکاری دەهێنان: "هەناسەی هەناسەی هەناسەکان، پاشای پاشاکان، نهێنیی حەقیقەت، دەلیلی خوا، ئەو خۆشەویستیەی لەبن نایەت، پەیامبەری ناشوێن، نووری پێغەمبەر، گەوهەری شادومانی، رۆحی بێگەرد، ئاگری عیشق، وێنەکێشی خەزەف، پوختەی بوون، لوتکەی نەبینراوان، تێگەیشتنی راستیەکان، پەناگەی جیهانی دۆزینەوە". من هەندێ لەو نازناوانەم باس کرد کە وەك پاڕانەوەی شەمس بوون. دەتوانم هیتریش باس بکەم.

بەلای رۆمیەوە خۆشەویستەکەی شەمس بوو، کە بەدرێژایی شەش سەدە لە دیارنەمانی پێغەمبەر و تا دەرکەوتنی شەمس، جیهانی ئەرواحی بە مەی نوقم کرد. شوێنەکەی لەناو ئەشکەوتی وەحیدا بوو لەکاتێکدا حەقیقەت لە دەرەوە مابوویەوە، پاسەوانی نهێنیەکانی. بۆ گەیشتن بەوە، دەبوو شەمس بەجەستە و گیان بڵند بێتەوە، پەردەی عیشق تێبپەڕێنێ، لە دوو سەد وێستگەکەدا دەریا تەی بکات. لە خەیاڵمدا بەو هەموو وێستگانەدا گوزەرم کرد کاتێ دووایین شیوەنگێڕ گۆڕی باوکی رۆمی بەجێهێشت. پاسەوانەکە دووایین مۆمی کوژاندەوە کە ژوورەکەی رووناك دەکردەوە. گۆڕەکە کە لەپشت کۆمەڵێ ئامێری مۆسیقیدا بوو، لە چاومان ون بوو.

دەکرێ چی راستیەك روون بکاتەوە کە ئەو پیاوەی جێگەی گرتەوە، ئەو پیاوەی بەپێی فەرمانەکانی ماوەیەکی کورت دوای مردنی سەلاح بوو بە مورشید و رێبەر و خۆشەویستی رۆمی بەرجەستە کرد، کەسێکیتر نەبوو جگە لە حوسامەدین کوڕی محەمەد کوڕی حەسەن، راویی لەخۆبوردەی ئەم کارە؟

بەڵێ، دوای ماوەیەکی کورت لە مردنی سەلاح، رۆمی بانگی کردم بۆ هەمان ئەو ژوورەی خەڵوەتە چل رۆژ و شەوەکەی لەگەڵ شەمس تێدا بەسەر برد، ژوورە قەدەغەکە، ئەو ژوورەی مایەی فزولی ئەوانە بوو، وەك من، کە لە دەرەوەی بوون، هەوڵمان دەدا کەمترین دەنگ کە لێیەوە دەردەچێ ببیستین، کەمترین ئاماژە لەبارەی بوونی هەردووکیان. لەناکاو داوای لێکردم لە دەرگای وەحی و تەمومژ بپەڕمەوە.

پەرپیمەوە و دەمزانی لەپشت دەرگا تەختە کۆنەکەوە، هەندێ جیهانیتر–جیهانی نهێنیەکان چاوەڕوان دەکەن. جیهانی نوور. جیهانی ئەرواح لە ئەرواح. جیهانی جەستە ماددیەکان. جیهانی نهێنیی نهێنییەکان. جیهانی دیاردەکان. جیهانی ئافراندن. جیهانی حەتمیەت. جیهانی خواوەند. جیهانی چوارچێوەی بینراو. جیهانی مەلەکوت.

هەستێکم لەلا دروست بوو کە پەردەکان لەپشت جیڕەی ئەو دەرگایەوە دەکەون و بینینم پێ دەبەخشرێ. بینینی راستەقینە. بینینی دڵ.

بەئەسپایی چوومە ژوورەکە. بینیم مەولانا وەك نەریتی خۆی دانیشتوە، شانی بەسەر کۆمەڵە سەرینێکدا داداوە، کە چەند مۆمێك روناکیان کردبووەوە و چەند ئامێرێکی مۆسیقی لەدەوری بوون. پشیلەکەیشی لە باوەشیدا خەوتبوو.

چوومە ئەو ژوورە کە زۆر باش دەیناسم وەك ئەوەی یەکەم جار بێ بیبینم. من دوازدە ساڵە مەولانا دەناسم. شەمسیشم بینی دەردەکەوت و ون دەبوو. دەمزانی شەمس لە خوا نزیکە. بەچاوی خۆم دیم شاعیر دێتە ژیانی رۆمی. گوێم لە سەلاح بوو لە ئاودەست گلەیی لە خوا دەکرد. دەمێك بوو هەموو ئەوانەم تۆمار کردبوو. من چاودێر و گوێگر بووم، هەرگیز یەکێك نەبووم لە هەڵبژێراوان.

هەر کە چوومە ژوورەکە لەپڕ ترس و گومانەکەم لەبیر کرد. لەبیرم کرد ماوەی دوازدە ساڵە گەورەترین حەزم ئەوە بوو رۆژێکیان لاشیپانی ئەو دەرگایە ببڕم و تەواو ببینم من لەکوێم. وا هاتە پێش چاو هەموو شت پێشوازی لێکراوە، مومکینە. دەمتوانی ئومێدم هەبێ مەولانا قووڵ خۆشی بوێم. تەنانەت هەستم کرد خوا، بەڵێ خوا سەردانم دەکات، وەك کە سەردانی شەمسی کرد.

ناتوانم پێتان بڵێم ئاخۆ ئەو رۆژە گەرم بوو یان سارد، بەڵام دەزانم مۆمەکان وەك هەزار خۆر داگیرسابوون، یەك گڕ دەیان هالەی[٥] دروست کردبوو. ژوورە زۆر بچوکە زۆر تاریکەکە بەرین و پڕ نوور هاتە بەرچاو. هیچ جیاوازیەکم لەنێوان مەولانا و خۆمدا نەبینی. خود وجودی نەمابوو. هەستم دەکرد ئەم هەستکردن بە ئارامی و دڵنیاییە زۆر درێژە ناکێشێ. بەڵام تەنانەت ئەوەیش بێزاری نەکردم.

دوای چەند ساتێك –تەنانەت کاتیش پوکابوویەوە– رۆمی ئەم قەسیدەیەی وت:

هەوری بارانی نەرم، وەرە!

مەستیی دۆستان، وەرە!

پاشای ساختەکان، وەرە!

ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.

---

[٥] هالە: ئەو روناکییەیە وەك بازنەیەك لە دەوری مانگ یان هەر تەنێکی روناك، وەك مۆم و چرا دروست دەبێ. وەرگێڕ.

**سەرسامکە، ئازار لابەرە،**

**تێکبشکێنە و گەنجینە پێشکەش بکە،**

**کێشی شیعری بۆ وشەکان بدۆزەوە،**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**شارت سەرسام کرد،**

**شار هەموو شت ئەزانێ و هیچیش نازانێ**

**بەهۆی تۆوە دڵ روونە،**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

دەمتوانی هەر بەیتێك تەنانەت پێش کۆتاییهاتنی نیوە بەیتە شیعریەکە تەواو بکەم. ئەو وشانەی مەبەستی پێیان من بوو لە دەمی پیرۆزیەوە دەرچوون، وا هاتە پێش چاو ئەوە منم قسە دەکەم، تەنانەت ئەوە بەلامەوە سەیر نەبوو.

پاشان مەولانا ئاوڕی دایەوە و قسەی لەگەڵ گوێگرێکی نادیار کرد و درێژەی پێ دا:

**بە شازادەی روومەت مانگ بڵێ،**

**بەم چاوە سیحرییە بڵێ،**

**بچۆ و بە پاشای بەبەزەیی بڵێ:**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**بەو شازادە یاخییە بڵێ،**

**بەو نیگەرانییە، بەو قەڵسییە بڵێ،**

**بەم درەختی ئارەوانی سەوزە بڵێ:**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**بەم هەناسە تاکانەیە بڵێ،**

**بەم داوی شێتە بڵێ،**

**بەم مروارییە شاراوەیە بڵێ:**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**بەکڵێپە بڵێ تۆبە بکا،**

**بەخەرقە*٦ درووەکەم بڵێ**

**بەنووری گەشتەکەم بڵێ:**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**بە مۆمی قورئان بڵێ،**

**بە جەژنی قوربان بڵێ،**

**بە فەخری بەهەشت بڵێ:**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

پاشان جارێکیدی تەماشای کردم و بەردەوام بوو و وتی:

**پاشا حوسام،**

**فەخری پێغەمبەران،**

**تۆی هەناسە دەرئەکەی!**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**لە خۆشەویستیدا زۆر درەوشاوە بووی،**

**لە هەموو ئەوانیتر بەمەکرتر بووی،**

**بەختەوەرتر لەوانەی دڵیان دزیم!**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

**بڕوانە ئەم جەزبەی رۆحە،**

**ئەم بەرزیی ئاوی لافاوە،**

**بڕوانە خۆری ئیلاهی!**

**ئەو سەرخۆشانە سڵاوت لێ ئەکەن.**

لەبەر پێیدا کەوتم. پشیلەکەی بێدار بوویەوە. یان وا خۆی پیشان دا بێدار بووەتەوە و لە باوەشی بازی دا. کووڕی خۆی دەرکرد و باوێشکی دا و پاشان پشتی چەماندەوە و بە جوڵەیەکی نەرمی پێکانی دەرگاکەی واز کرد و بە چڕنوکەکانی خۆی خوراند. ئەنجا چووە دەرەوە. بەتەنیا لەتەك گەورەی گەوران مامەوە تا

---

[٦] خەرقە، ئەو جلەیە دەروێشەکان لەبەری دەکەن.

پەشێویی رۆح ببینم. هەستم کرد دەستم لەگەڵ دەستیدا بوونەتە یەك، پرچم تێکەڵ بە جلەکانی بوو نەفسم لە دەمیدا ون بوو. پەنجەکانی پێم خۆیان لە گۆرەویکانیدا شاردەوە. ئەو شەوە لەگەڵی مامەوە. بەیانی ژوورەکەم بەجێهێشت. زریانووس، هاوڕێی کۆنم دی پاڵی داوە بە دالآنەکەوە. چاومان بەیەکدا هەڵدەتەقی. تەمەنمان نزیك بوو، دەوروبەری سی ساڵ، چێژمان لە وەرزشکردن دەبینی. لە ماوەی دوازدە ساڵی رابردوودا هەوای ئەم قوتابخانە بەشکۆیەمان هەڵمژی. کاتێ بینیمی ژوورەکە بەجێدێڵم، دەستبەجێ زانی بوومەتە کەسێکیدی. ئەگەرچی یەك وشەیشمان بەیەك نەگوت، بەڵام هەموو شت وترا.

زانیم من لەمەولا رووبەڕووی رق و بێزاری ئەوانە دەبمەوە کە تاقمێکیان دژی شەمس و سەلآح پێکهێنا، ئەوانەی گومانیان دەخستە سەر ئەسڵ و فەسڵی شەمس، ئەو "دەروێشەی نە ناوی هەیە نە ئاماژە". هەروەها سووکایەتیان بە سەلآح دەکرد بەوەی بیریان دەخستەوە ئەو لە خێزانی ماسیگرێکەوە هاتووە، لەبەرئەوە زانیم ئەوانەی شەو و رۆژ وتار دەربارەی "هەژاری" دەدەن، ئەو جۆرەی دوای کۆششێکی زۆر بەدەست دێ، ئەو دەروێشانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن پاشای راستەقینە ئەوەیە بەسەر حەزەکانیدا زاڵە، هیچیان نیە رەخنەی پێ بگرن لێم. باوکم، محەمەد ئاخی، سەرۆکی تەریقەتی لاوێتی (الفتوة)، جێگەی رێزی گەورە بوو لە ژیانیدا، هێشتایش موڵکەکانی کە پاش مردنی لەپێناو هاوسەرگیریەکەی شەمس و کیمیادا فرۆشتنم، یارمەتی دابینکردنی خەرجی قوتابخانەکەمان دەدەن. سەبارەت بە دەروێشەکانیش کە ستایش دەکەن بەڵام سووکایەتی بە خەڵکی ئاسایی دەکەن، لە جیهانی سامانەوە هاتووم، لەبەرئەوە لەم روانگەوە هێرشم ناکەنە سەر.

رێزێکی نوێم لە هەڵوێستی زریانووسدا دۆزیەوە. ئەو لە ژیانی رابردووی وەك دز و تاوانبارێك کۆمەڵێ وشەی دیاریکراوی پاراستبوو کە ناوبەناو بەرگوێم دەکەوتن. ئەو وشانەی بەکاری دەهێنان لەو دنیایەی پیاوانەوە وەرگیرابوون کە بەئافرەت دەڵێ "خاوەن ماڵ" و گرێبەست تێیدا بەدانانی تاڵە موویەکی سمێڵی پیاو وەك راسپاردەیەك دەبەسترێ، جیهانێك پیاوان زۆر گوێ بەوە نادەن ئەگەر یەکێکیان نێزە لەویتر بدات، بەڵام ئەگەر باڵندەیەك ببینن دەمرێ، دەدەنە پرمەی گریان.

لە ماوەی ئەو دوازدە ساڵەی هاوڕێیەتیماندا زریانوس وای لێکردم پەیڕەوی شێوەژیانی ئەوان بکەم، بردمی بۆ یانەکەیان، جوڵە و زمانەکەیانی فێر کردم. کاتێ بەتەنیا بووینایە زۆربەی جار بەو شێوازە گوزارشتمان لە خۆمان دەکرد.

لەو رۆژەدا، کاتێ زریانووسی فرە ژیرم دی، سەرەتا وام بەخەیاڵدا هات بۆ ئەوەی ماوەی نێوانمان هەڵبوەشێنمەوە، کەوتمە گەڕان بۆ وشەیەك کە لەو گەڕەکە هەژارانەدا بەکار دێ. خۆمم گرت. نرخاندنەکەی دڵسۆزانە بوو و ئەرکی من بوو رێزی بگرم. لەو رۆژانەدا خەڵکیتریش هاتن، بە سوڵتان وەلەدەوە بەبێ

ئەوەی مەولانا راستەوخۆ داوای ئەوەی لیٚ بکات. کەوتنە سەر پێکانم. بەڵێ کوڕی مەولانا، نەوەی سوڵتانی زانایانم دی، لەبەردەممدا کڕوش دەبات و پێم ماچ دەکات.
ئایا گۆڕام؟ ئایا نیعمەتی خوا کاری تێکردم؟ نازانم. بەڵام هەستم کرد بەوەی سەرلەنویٚ لەدایك بوومەوە، بەوەی منیش هەموو وردەکاریەکانی دنیام خۆشویست، بەوەی ئێستا بوومەتە بارستەیەك هەستی بێگەرد. زەردەخەنە لە لێوەکانم نەبڕا. سەرەڕای ئەوەیش، دەمتوانی دەرك بە ناسۆریەکانی زەوی بکەم هەرکات گەڵای درەختێك بەردەبووەوە.
بەبیٚ ئەوەی قوتابخانە بەجیٚ بێڵێ، مەولانا سەرجەم موریدە سەرەکیەکانی کۆکردەوە و پێی وتن من پێشخراوی حەزرەتیم و وتی:

کاتیٚ شەمس هەڵات
لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا،
گۆڕانێك رووی دا
کاتیٚ چراکە گەیشت.

لەپشت هەورەوە،
مانگ خۆی حەشار ئەدا،
کیٚ جگە لە ئەستێرە
روناکی ئەبەخشیٚ؟

یەکێك لە هاوەڵانمان پرسی: لەناو سیٚ پێشخراوەکەدا کیٚ لە هەموویان باڵاترە؟ رۆمی وەڵامی دایەوە:

ئەی هاوەڵی گەڕیدە،
شەمس خۆر و سەڵاح مانگ بوو.

پاشا حوسام، شمشێری حەقیقەت، ئەستێرەیە.
لەگەڵ پاشا یەکیگرت.

وەك یەك کائین تەماشایان بکە،
چونکە هەریەکەیان بۆ گەیشتن بە خوا یارمەتیت ئەدەن.

ئەوەی بەباش ئەزانی هەرچی بیٚ،

**ئەوا تۆ سەرئەکەوی و نامری،**

**ملکەچیبە،**

**رازیبە پەڕت دەربێنیٚ.**

پاشان دەستی خستە سەر سەرم و وتی:

**لەئێستاوە تۆ جێنشینی پێشخراوی،**

**چونکە لەم بازنەیەدا دوالیزمە نیە.**

سولْتان وەلەد هەستایە سەر پیٚ و ئەویش رەزامەندی دەربڕی بەوەی وتی:

**باوکم وای کرد ئەم پیاوە لەجێی ئەویتر دابنیشیٚ و**

**نوور لەسەر نووری بەسەریدا رژاند.**

شەوێك، رۆژێك هەڵبژێردرا بۆ دۆزینەوەی رێگەی عیشق، لەپڕ بوومە شێخ، مورشید، جێنشین، ئاراستەکەر، گەورە و بەیداخهەڵگری عیشق، ئەو تاکە، ئەو بەستەیە، ئەو گەردیلەیە کە عیشق بەسەر جیهانی گەورە و بێسنوور، رەها، ناجیاوازدا بڵاو دەکاتەوە، عیشقێك هیچ ناناسێنیٚ خۆی نەبیٚ.
هاوڕێکانم لەڕێی هەردوو چاوی رۆمیەوە تەماشایان کردم، تەماشاکردنێك دەمتوانی ماناکانی ئەو خۆشەویستیەی تێدا بخوێنمەوە کە بۆ منی هەیە، تەماشاکردنێك لەڕێی منەوە گوزارشتی لە خۆشەویستی بۆ تەواوی گەردوون دەکرد.
پاشان گەورەم سەرنجمی بۆ شار و کۆشك راکێشا. لەوەیشدا، بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز، ئەوەی دووبارە کردەوە کە پێش چەندین سالٚ کردی لەو رۆژەی قۆوتابخانەی قاتای بۆ فێربوونی قورئان کرایەوە کاتیٚ لەبارەی رێورەسمەکان و شوێنەکانی شەرەف دەمەتەقێمان دەکرد، رۆیشت و لە سوچێکی ناشایستە بەو دانیشت، لەو شوێنەی میوانان پێڵاوەکانیانی تێدا بەجێدێڵن، ئەو جێیەی شەمسی تەورێزی تێیدا دادەنیشت.
موعین سلێمان بەڕێوەبەری پێشووی قوتابخانەی فێربوونی قورئان و مێردی ئەمیرە غوردجی، بووبوو بە ئەمیری بارفانیە و لەباتی والیەکان حوکمی تەواوی سەڵتەنەتەکەی دەکرد. سەرەڕای ئەو هێزەی، هێشتا موریدێکی بەجۆش و خرۆشی مەولانا بوو. لەو رۆژەدا کۆبوونەوەیەکی لە کۆشکەکەیدا بەست کە گەورە پیاوانی خەڵکی قۆنیەیشی تێدا بوو، دیارە رۆمی یەکێك بوو لەوانە. ئەو رۆژە بانگهێشت نەکرام و ئەو ساتە دەگمەنەی پشووم قۆستەوە بۆ مانەوە لە باخەکەم و فێرکردنی بنەماکانی کشتوکالٚ بە مناڵەکانم.
لەوسەری کۆڵانەکە چەند نێردراوێك دەرکەوتن ئەمیر ناردبوونی، هاتنە لام و داوایان لێکردم لەگەڵیان بچم

بۆ کۆشك. لە ڕێگە هەواڵیان دامێ مەولانا لەوەتی گەیشتوە لاواز دیارە، لەبەرئەوە ئەمیر بانگی کردوم تا مورشیدەکەی بحەوێنمەوە کە لە غیابی مندا وتبووی:

**قسە لە شیر ئەچێ**

**لە سینگی هەناسەدا،**

**ئەگەر کەسێك نەبێ رایبکێشێ بۆ ناوەوە،**

**بەنەرمی هەڵناقولێ.**

کاتێ گەیشتمە کۆشك، ئەمیر دەستی ماچ کردم، بردمی بۆ لای ڕۆمی کە مۆمێکی بەدەستی چەپی هەڵگرتبوو، پەنجەی شایەتمانی دەستی راستی لە هاتوچۆ لەنێوان دەم و لوتیدا نەدەوەستا. ڕۆمی هەر کە منی بینی هەستایە سەر پێ و پێی وتم: "تۆ گیانم، ئیمانم، نوورم، گەورەمی، خۆشەویستی حەقیقەت، خۆشەویستی پێغەمبەرانی".

کاتێ بەبیستنی ئەوە حەپەسام، خەڵکەکەم بەجێهێشت و کشامەوە تا بەتەنها بم. کاتێ بینیمی لە حەوشەکەدا دانیشتوم، کە شوێنێکە دەکەوێتە ژێر هۆڵی پێشوازیەکە، مەولانا بە پلیکانەکاندا دابەزی و لەتەنیشتم دانیشت. بەو کارە، ئەو سوچەی شوێنکەوتەی تێدا دانیشتبوو گۆڕی بۆ شوێنی شەرەف. هەندێ چپەچپ گەیشتنە گوێم کە حەسوودییان دەگەیاند "بۆچی ئەو پیاوە لە شوێنێکی ئاست نزمتردا دادەنیشێ، لەکاتێکدا هەرکەس بەپێی مەقامی خۆی شوێنی بۆ تەرخان کراوە؟".

وام بەخەیاڵدا هات من تاکە کەس بووم ئەو قسە زبرانەم بیست کاتێ ڕۆمی ئاماژەی بۆ کردن و وەڵامی دانەوە: "حوسام چرایە. ئەگەر حەزی لە بەرزایی بێ ئەوە لەبەر خۆی نیە بەڵکو بۆ ئەوەیە کەسانیتر سوود لە روناکیەکەی وەربگرن. مەشخەڵ لە هەرکوێ بێ، چ لە خوارەوە یان چ لە سەرەوە، هەر مەشخەڵە".

ئەو ئێوارەیە پیاوماقوڵانی قۆنیە سەیری من، حوسامیان کرد بەهەمان شێوە کە پێشتر سەیری شەمسیان دەکرد —سەیرکردنێك پڕ لە حەسوودی و ڕق و فزوڵی و سەرسامی و ڕێز— لەکاتێکدا مەولانا بەبەرچاوی خەڵکەکەوە شوێنی شەرەفی بەجێهێشت تا لەپاڵ هاوڕێکەیدا دابنیشێ.

# گوێ لە ناڵەی نای بگرە

ژیان گەڕایەوە دۆخی پێشووی لە قوتابخانە، لەگەڵ یەك جیاوازی، ئەویش ئەوە بوو من جێگەی سەلاحم گرتەوە، جێگەی شەمسی تەورێزیم گرتەوە. کات بەرۆتینی تێدەپەڕی. لەگەڵ ئەوەیشدا بەردەوام بەو دۆخەی تێی کەوتم هەستکردن بە حەپەسان دایدەگرتم. هەزاران پرسیار بەمێشکمدا دەهاتن بەبێ ئەوەی وەڵامێك بۆ تاکە پرسیاری راستەقینە بدۆزمەوە: "بۆچی من؟".

بەتێپەڕینی کات، هەمیشە کات، بەهێواشی لەوە وەستام خۆم بە لێشاوی پرسیار کەڕ بکەم و خۆمم دا بەدەم چێژوەرگرتن لە بوونی قودسیی مەولانا. وەك نەریتی پێشووم، لە تۆمارکردنی قەسیدەکانی و چاودێریکردنی کار و هەڵسوکەوتە رۆژانەکانی بەردەوام بووم. هەوڵم دا هەندێ وشەی سادە بەکار بێنم بۆ گوزارشتکردن لەو حاڵەتی گۆڕانە نائاساییەی بەسەر کائینێکی گەورەدا هات بەبێ ئەوەی بوونی مرۆڤانەی خۆی بشارێتەوە، هەروەها تاسوقی زۆری بۆ ئەو سیرەی دەیکاتە شیری خەستکراوەی تاڵ و خواردنی لەگەڵ نانێکی کۆنی کەڕوو لێنیشتووی بۆگەن پێش ئەوەی دەست بە سەمای بیستن بکات، هەروەها توانای بۆ چەندین رۆژ مانەوە لە گەرماودا لەژێر فوارەی ئاوی سارددا، یان خۆ نوقمکردن لە حەوزێك ئاوی گەرمدا و حەزکردنی لە بێدەنگی. ئەوەتا لە زۆر قەسیدەیدا کاتێ ئاماژە بۆ خۆی دەکات وشەی "خامۆش"ی بەکار هێناوە، کە جۆرێکە لە ناوی خوازراو.

هەموو شتم تۆمار کرد، تێبینی هەموو شتم کرد، لەناویاندا تێبینیکردنی ئەوەی رۆمی هەمیشە ستایشی برسێتی دەکرد و گەدەی بەتاڵی بە نای بەراورد دەکرد، کە نرکە و هاواری حەزلێکردن دەردەکات.

پێویستە پشیلەکەی و نایەکانی و تەپڵە بێشومارەکانیشی باس بکەم، هەروەها ئەو ژمارە زۆرەی مەولانایان خۆش دەویست کە بەبەڵێنی ساختە بڵاوەمان پێکردن، هەروەها سوڵتان روکنەدین کە وەك منداڵێکی شیرەخۆر ملکەچی فەرمانەکانی بوو و بە "گەورەم و باوکم" بانگی دەکرد، موعین سلێمان دڵسۆزی نێو دڵسۆزان، کە لەپڕ دیم لەبەردەم رۆمیدا چۆکی دادابوو، لەکاتێکدا بووبوو بەبەهێزترین پیاو لە سەڵتەنەتەکەدا. لەکۆتاییشدا شاری قۆنیە کە لە پەلاماری مەغۆل رزگار کرا، لەبەرئەوەی دیاری خوا بوو بۆ سەلاحی زێڕنگەری کۆچکردوو.

شەوێکیان کاتێ لەبەر روناکیی چەند مۆمێکدا کتێبی "لۆژیکی باڵندە: مەقاماتی باڵندەکان"م دەخوێندەوە، مەولانا هات. روومەتی وەك هەمیشە زەرد هەڵگەڕابوو، بەڵام لە مردنی سەلاحەوە شوێنەواری ناسۆری و ئازار بۆ هاوڕێی کۆچکردوەکەی بەڕوخساریەوە دەبینرێ. زریانوس وتی وای لێهاتووە لە سەلاح دەچێ. لە یەکێك لە شەوەکانی خەولێزڕانیدا فاتیمەی کچی سەلاح، کاتێ رۆمی بینی وایزانی باوکیەتی و لە حەیبەتا لەهۆش خۆی چوو.

ڕۆمی لاوازیی ڕوو و ڕوخساری کە لە ڕوومەتی سەلاح دەچێ، لە تەنیشتم دانیشت، ئەگەرچی هیچ مەشخەڵێك توانای گەشاندنەوەی ڕوومەتی نەبوو. لەو ساتەی ئەژنۆی بەر ئەژنۆم کەوت، تۆقێنەرترین بیرۆکە بەمێشکمدا هاتن: دەبێ چ زیانێکی گەورە بەئەدەبی فارسی بگات ئەگەر ڕۆمی بمرێ، بەبێ ئەوەی یەك کار لە دوای خۆی بەجێ بێڵێ؟

مەولانا هەموو شتی بینی و لە هەموو شت تێگەیشت. پرسی کە چی ناڕەحەتی کردوم. نەمویست بێزاری بکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا زانیم ڕێگە نادات قسەکە بەئاقارێکیتردا بچێ چونکە "دەرفەت وەك هەور زۆر بەخێرایی تێدەپەڕێ".

بەرەو لای چەمیمەوە و وتم: "دیوانە شیعرەکان چەندقات بوون و ڕوناکییان بە وشکانی و دەریایی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا بڵاو بووەتەوە. بەڵام وشەکانی سەرجەم شاعیران دەنگێکیدی هەڵیاندەوەشێنێتەوە، ئەو وشانەی لە کتێبێکی وەك کتێبی "ئیلاهینامە"ی سەنائی و کێشە شیعریەکان لە کتێبی "لۆژیکی باڵندە: مەقاماتی باڵندەکان"ی عەتاردا گوزراشتیان لێ دەکرێ. ئەگەر ئەم جۆرە کتێبە هەبێ، ئەوا مرۆڤایەتی تا ئەبەد لێی بەهرەوەر دەبێ، دەبێتە هەناسەی ئەوینداران. دەگاتە لوتکەی بەزەیی و نیعمەت".

قووڵترین حەزەکانی خۆمم درکاند، وەك حەزی ئافرەتێکی بێ منداڵ کە داوای لە پیاوێك دەکات موتوربەی بکات. ئاماژەم بۆ کێشی شیعری لە دیوانی "مەقاماتی باڵندە" و ناوەڕۆکی کتێبی سەنائی کرد، لەکاتێکدا خۆم بەهەموو وجودم هەستم بە ئازاری ئافرەتێك دەکرد، ئافرەتێکی پەرۆش بۆ بوونی منداڵ. قسەم لەگەڵ کرد، گوێم لە دەنگم بوو وشەی مانادار گۆ دەکات. لە هەمان کاتدا نیگەرانی هەناوی دەخواردم، هەستم بەوە دەکرد ڕەتیدەکاتەوە. هەمان ترسە کە ئافرەتێکی بێ منداڵ دادەگرێ کاتێ چاوەڕوانی وەڵامی پیاوەکە دەکات.

تەواو لە قسەکانم نەبووبوومەوە مەولانا باڵی بەرز کردەوە. لە سوچی مێزەرە پیرۆزەکەیەوە بەستەیەك کاغەزی پێچراوەی دەرهێنا و بۆی ڕادام. لێم وەرگرت و کەوتمە خوێندنەوەیان. وەك پێشتر ئاماژەم پێدا — بەڵام لێرەدا دەمەوێ دووبارەی بکەمەوە— هەژدە بەیتە شیعرم دۆزیەوە کە بەدەسخەتی خۆی نووسیونی لەسەر کێشی شیعرەکانی "مەقاماتی باڵندە" کە ماناکانیان زۆر لوغزیان بۆ کورت کردمەوە. کاتێ زانیم من لەپڕ سەرتوێژی ئەدەبی سۆفیم بەدەستەوە گرتوە، دەستبەجێ زانیم ئەو شیعرانە دەبنە ئایەتە قورئانیەکانمان. خوێندمەوە و جارێکیدی دێڕی یەکەمم خوێندەوە:

**گوێ لە ناڵەی نای بگرە دەستی بەسکاڵا کردوە**

**لەو کاتەوە لە دارستان هەڵکەنراوە**

ڕۆمی هەر ئێستا موتوربەی کردم.  شادیی ژنێکی دووگیان گرتمی. کاغەزەکانم لە لێوەکانم نزیك کردنەوە، پاشان لە چاوەکانم و لەبەردەمیاندا چۆکم دادا. یارمەتی دام بۆ هەستانەوە سەر پێکانم. هەستی بەو موچرکەیە کرد کە بە گازەرەی پشتمدا تێپەڕی. جەستەم قەت هەستی بەو موچرکەیە نەکردوە کاتێ وەرزشی رمبازی و شیربازی زۆرانبازیم دەکرد. بۆ ئەوەی ئارامم بکاتەوە دەستەکانی خستە سەر سکم، دەستبەجێ هەستم بە گەورەم کرد هەڵدەقوڵێتە ناو دەمارەکانم و موچرکەکەم هێور دەکاتەوە.

بوو بەو خوێنەی بە دەمارەکانمدا دەگەڕێ، پاشان وتی: "تەنانەت پێش ئەوی بیر لەو داوایە بکەیتەوە، تەنانەت پێش ئەوەی سروشت داوای بکات، جیهانی بینراو و نەبینراو بیرۆکەی ڕێکخستنی ئەم دیوانەیان خستە دڵم. ئێستا، وەرە بەسەر لوتکەکانی ئیلهامتدا بفڕە، بەرەو بەرزبوونەوەی راستیەکان بفڕە و لاسایی پێغەمبەر بکەوە و نیەتی راستەقینەی ئاشکرا بکە، چونکە نیەتەکانی دڵمان وادەکەن عەقڵمان بهەژێ و عەقڵمان ئاراستە دەکەن تا ئەو وشانە دەدۆزێتەوە کە پێویستمان پێیانە".

ساتێك وەستا، پاشان دەستی بەقسە کردەوە:

"ئەگەر نووسیت، شیعر ئەهۆنمەوە".

لەوە زیاترم نەدەویست. ئەوە نیەتی راستەقینەم بوو. ئێستا ژیانی خۆمم لەگەڵ ژیانی هەڵبژێراوان نووسی. ئایا شایانی ئەم ئیمتیازەم؟ نازانم. لە پرسیار لەخۆکردن وەستام. ئیتر بووم بە خامەی مەولانا و جەوهەری عیشق بۆ مرۆڤایەتی دەگوێزمەوە.

جارێکیتر موچرکە بەلەشمدا هات. دەستەکانی ڕۆمی کە هێشتا بەر سکم کەوتبوون نەیانتوانی لەرزەکەم بوەستێنن. هەستێکم کرد وەك هەستی ئافرەتێکی موتوربەکراو، بەڵام ئەم جارەیان هەر ئافرەتێك نەبووم، بەڵکو مریەم بووم کە هەناسەی ئیلاهی بۆ گوێزرایەوە.

جارێکیتر چوومە سەر چۆك و دەست و باڵەکانی ڕۆمیم زیارەت کرد. فرمێسکەکانم تکان بەسەر ئاینشکیدا کە زۆر خۆشم دەویست، کە لەکاتی سەمای بیستندا زۆر دەستم پێوە دەگرت.

لەو دۆخەمدا، سەرم لەنێو دوو ئەژنۆکانمدا شارابوویەوە، گوێم لێ بوو قەسیدەیەك دەخوێنێتەوە کە لەبەرم کردبوو، ئاراستەی من دەکرا:

**ئەی نووری حەقیقەت، ئەی شمشێری ئیمان،**

**بەهۆی تۆوە مەسنەوی مانگ تێئەپەڕێنێ.**

**ئەی ڕۆحی ئومێد، کە خەونە سەنگینەکەی وای کرد،**

**ئەم مەسنەوییە دەربکەوێ و جگە لە خوا کەس نەزانێ لەکوێوە.**

**مەسنەوی، لە ناختدا هەڵتگرتوە،**

بەبەردەوامی، دەریئەهێنی ئەگەر ویستت،

مەسنەویی هەڵقوڵاو، کێشندە، شاراوە،

بەڵام شارایە بۆ گەمژە کە چاوی نیە.

لەبەرئەوەی تۆ سەرچاوەی مەسنەوی بووی،

ئەگەر گەورە بوو، ئەوە تۆی وات لێکردوە.

ناوی "مەسنەوی"مان لە کارەکە دەنا، کە بەمانای قەسیدەیەك دێ لە دوو بەش بەیەك سەروا، پێکدێ. لەو ڕۆژەوە تا مردنی ڕۆمی لە هەڵبەستنی نەوەستا. جا چ سەمای بکردایە، یان خۆی بشۆردایە، یان بجوڵایە یان وەستابایە و نەجوڵایە، شیعری هەڵدەبەست و منیش بەپەلە تۆمارم دەکرد. هەندێ جار لە سەرەتای ئێوارەوە تا بەیانی بەبێ وەستان شیعری ڕێکدەخست، بەبێ ئەوەی بزانێ قامیشەکان لەژێر فشاری پەنجەکانمدا دەشکان، چونکە بەپەلەپەل دەمنووسی تا فریای نووسینیان بکەوم.

بەزۆری داوای لێدەکردم قەسیدەکانی بۆ بخوێنمەوە. کاتێ بەرگی یەکەم تەواو بوو، پاش ئەوەی وشەکانی ڕاست کردەوە و کێشی عەروزەکانی ڕێك کرد، دیوانەکە هەموویم خوێندەوە. ئەم جارەیان بووم بە دایکێك کە بەشانازیەوە منداڵەکەی دەبینێ.

ساڵی ١٢٦٠ مەولانا وەك دابی ساڵانی خۆی، دەچوو بۆ کانیاوە گەرمەکان، لەبەرئەوەی ئەوکاتە بەهۆی مردنی هاوسەرەکەمەوە خەمبار بووم بڕیارم دا ئەم جارەیان لەگەڵی نەچم و لە قۆنیە بمێنمەوە ئاگام لە منداڵەکانم بێ، بەڵام دەمزانی گەشتەکەی چۆن دەبێ چونکە ساڵانی ڕابردوو یاوەریم کردبوو. ماوەی زیاتر لە شەش هەفتەی دوور لە قۆنیە بەسەر دەبرد، کاتێ دەڕۆیشت ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکرا. بەو بۆنەیەوە هەمان ڕێگا دەبووە هۆڵی سەمای بیستن، چیا و درەخت و ڕووەکە سەوزەکان جێگەی دیوارەکانی ژوورەکەیان دەگرتەوە. بەدرێژایی ڕێگەکە دڵسۆزان سەمایان دەکرد و ژەنیارانیش، چ بەپێ بڕۆیشتنایە یان بەسوار، تەپڵیان لێدەدا، سروودبێژانیش سرود و چامەیان دەوتەوە. لە ناوەندی ئەو کاروانە نائاساییەدا مەولانا غەزەلیاتی دەهۆنیەوە یان کتێبی "فیە مافیە" تەواو دەکرد.

بەڵام ئەو ساڵە مانەوەکەی درێژەی کێشا و لە پەنجا ڕۆژە ئاساییەکەی تێپەڕاند. نیگەرانیم زیادی کرد. ئێوارەی ڕۆژێکیان هەستێکی نامۆ دایگرتم کە سبەی دێتەوە. هیچ گومانم لە وردیی دڵخەبەردانەکەم نەبوو. لەوە خاترجەم بووم. قوتابخانەکەم خاوێن کردەوە و ژوورەکانم بۆنخۆش کرد و بڕێك سیرم کڕی و ئافرەتانم نارد بۆ گەرماو، داوام لە دۆستە نزیکەکانی کرد لەگەڵم بێن بۆ خان روزبیە بۆ پێشوازیکردنی مەولانا.

ڕۆژی پاشتر کەژاوەیەکی گەورە ساز کرا. خەڵکێکی زۆر، گەورە و بچوک، کچۆڵە و دەرویشانی بەساڵاچوو، سەربازان و شاعیران ریز بوون و هەریەکەیان دیاریەکی بەدەستەوە بوو. قۆنیەمان بەجێهێشت و دوای چەند سەعاتێك گەیشتینە خانەکە و خێوەتێکمان بۆ ڕۆمی لە کێڵگەکەدا هەڵدا.

چاوەڕوانمان کرد، چەند سەعاتێك تێپەڕی هەر نەهات، هێمنی باڵی بەسەر هەموو شتدا کێشابوو. بزنگەل لە کێڵگەکاندا دەلەوەڕان، جووتیاران لۆکەیان دەچنی. تاکە رووداو لەو ماوەی چاوەڕوانیکردنە درێژەدا دەرکەوتنی پۆلێك قاز بوو کە یەکێك لە موریدەکانیان راو دەنا. لەکۆتاییدا کەوتمە پرسیار ئاخۆ ژیرانەیە من تەنیا لەبەر دڵخەبەردانێکی خۆم سەدان هاوەڵ بۆ ئەم شوێنە دوور لە شارە بدەمە پێش.

گومان سەری تێکردم. بازمدایە سەر پشتی ئەسپەکە و بەدرێژایی ئەو رێگەیەی وام بە خەیاڵدا هات ڕۆمی پێدا دەڕوات ڕۆیشتم. هەندێ جار دەنگێك لە ناوەوە دڵنیای دەکردمەوە، هەرگیز نەزوەکانم پاڵیان پێوە نەناوم بۆ رەفتارکردن. لە قوتابخانە ماندوونەناسانە وەك ژمێریار و نووسەر و یاریدەدەر کارم دەکرد، زۆر دوور بووم لە ساتساتیی شەمس و ئەتوار نامۆیی سەلاح، خوا لە شێوەی هاوسەرەکەمدا بۆم دەرنەکەوت و لە ئاودەستدا تووڕەی نەکردم. ئەو مژدەدەرەی شەوی رابردوو هاتە لام و هەواڵی گەیشتنی مەولانای پێدام، ناکرێ راستەقینە نەبێ. دوای سەعاتێك یان دوو سەعات لەسەر ئاوزنگی ئەسپەکەم، پاشەوپاش گەڕامەوە بۆ خان روزبیە.

لەوێ خێوەتەکەی ڕۆمیم دی پڕە لە مەقامی پیرۆزی. لەوێ بوو. دەبێ هاوارەکەم هاواری خۆشی بێ، بەڵام هاواری ئاسوودەییش بوو، هاوارێك پڕ لە ڕەزامەندی. لەپڕ هەستم کرد منی کۆپیکار و نووسەر و خەزنەداریش، دەتوانم پەیام لە غەیبەوە وەربگرم.

لە خێوەتەکە هاتە دەرەوە، یەکەم شت بینیم چاوەکانی بوون کە بەکلێکی ڕەشی تۆخ ڕەشتبوونی. بەخێرایی تێبینیم کرد تەندروستی باشە و ڕەنگزەردیەکەی زۆر سووکتر بووە. لە ئەسپەکەم دابەزیم و لەبەرپێکانیدا خۆم دا بەزەویدا. پێکانی پەتی بوون، باڵەکانی ئامادە بوون بۆ لەئامێزگرتنم.

نازانم دەست لەملکردنەکەمان چەندی خایاند. دوای کەمێك هەستم کرد پێ پەتیەکانی لەسەر گیا تەڕەکەدا دەلەرزن. چووینە خێوەتەکە کە پەرۆش بووم بۆ ئەوەی خۆم بیڕازێنمەوە. مۆمەکان سەرین و بەتانی و مافور و هەندێ ئامێری مۆسیقییان روناك کردبووە کە بەو ناوەدا پەرش و بڵاو کەوتبوون.

بەبێدەنگی لە بەردەمیدا دانیشتم. پاشان بەڕوونی گوێم لێبوو عەقڵ، باڵندەی ڕۆحم —ئەگەر بتوانم ئەو ناوەی لێ بنێم— لە قەفەسی سینگمدا، لە حزوری ڕۆحی مەولانادا گمەی خوێندنی دەهات، دەنگی ڕۆحی ڕۆمی ڕۆچووە ناو ڕۆحم و عەقڵمی لێ سەندم و ڕێگەی قسەکردنی لێ گرتم. بڕگەیەکی "مەسنەوی"م بیر کەوتەوە مەولانا بەیانیی ڕۆژێکیان نووسی، کاتێ بەئاوێتەیەکی دایکە مرواری و توێکڵی هێلکە و هاڕاوی خەڵوز ددانی پاك دەکردەوە:

**نەغمەی ئەو گۆرانیەی لە جەستەی بێگەردەوە دەرئەچێ،**

**لە هەموو ساتێکدا، ئەگاتە گوێ سووکەکان.**

**شوێن ڕێگەیەکی نەزانراو ئەکەوێ بەلای مرۆڤەوە،**

**ئەو لەو جیهانە نیە کە ماڵی هەیە.**

**هاوەڵان نایبیستن. ئەو، ئەو ئەبیستێ،**

**بەختەوەرە ئەو ڕۆحەی خۆی ئەبەخشێتە غەیب.**

منیش دەستم کردبوو بە خۆبەخشین بە غەیب. ئەوە بوو هەستێك لە ناخەوە دایگرتبووم کە مەولانا دێ لەکاتێکدا هیچ هەواڵێکمان لەبارەیەوە پێ نەگەیشتبوو. گوێم لە دەنگی بوو بەبێ ئەوەی یەك وشە ئاڵوگۆڕ بکەین. من لە لەدایکبوونی "گوێی سووکەکان"دا ئامادە بووم.

نووسینی مەسنەوی بەردەوام بوو، ئەگەرچی بەهۆی مردنی ژنەکەمەوە ماوەی دوو ساڵ پچڕا. کاتێ لە ژیاندا بوو هەرگیز هەستم بەبوونی نەدەکرد، بەڵام کاتێ مرد بەرگەی نەبوونیم نەدەگرت. هێنام و پشتگوێم خست. لە ماوەی هاوسەرییەکەماندا زۆربەی کاتم لەگەڵ مەولانا بەسەر دەبرد. ئەو ئەزموونەم دەزانی کە ئەو بۆی ڕەخساندبووم، هەروەها ئیمتیازی گەورەی هاوەڵیکردنی ئەو پیاوەی فریشتەکان خۆیان غیرەی لێ دەکەن، جۆرە مەزنیەکی پێ بەخشیبووم جیاواز لە ژیانی هاوسەریم. هەموو شت کە بەیاوەریی ڕۆمی حەپەساندمی و گۆڕیمی و مەستی کردم، لە قوتابخانە یان شوێنانیتر ڕوویان دا. شتێکی وا ڕووی نەدا کە لە بێستانەکەی فالیراس ڕووی دا کە تێیدا دەژیام و خاوخێزانەکەم لەدەورم بوون. لە بێستانەکەدا، جگە لە سەردانەکانی ڕۆمی، ژیان بەشێوەیەکی ئارام و سروشتی دەڕۆیشت، بەڵام مردنی ژنەکەم سەفای ئەو ژیانە ئاساییەی لێڵ کرد، پاشان –ئەگەر زۆر بەدرەنگوەختیش بێ– زانیم من خۆشم دەویست.

دوای مردنی، کەوتمە پرسیارکردن لە فاتیمەی ژنی سوڵتان وەلەد، هەروەها کیرای ژنی مەولانا. ویستم بزانم چۆن چۆنی توانیویانە بەرگەی مێردەکانیان و لەماڵنەبوونیان بۆ ماوەیەکی زۆر بگرن. دوای ئەو هەموو ساڵە، کەسیان لەسەر ئەوە ڕانەهاتبوون. فاتیمە بە خوێندنەوەوە خەریك بوو، بۆ ئەوەی سەرنجی سوڵتان وەلەدیش ڕابکێشێ بەبەردەوامی بەئەنقەست کێشە و دەمەقاڵەی دروست دەکرد. هەرچی کیرایە کە من ڕێزێکی زۆرم دەگرت، هەروەها هەستم بەگوناه دەکرد بەرانبەری لەبەرئەوەی لە مێردەکەی مەحرومم کردبوو، متمانەی زیاتر بوو. سەرەتا کاتێ شەمس هات لۆمەی مێردەکەی دەکرد و پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی بایەخێکی زیاتری پێ بدات. لەڕاستیدا بیرم کەوتەوە چۆن ئەو پاش ماوەیەك لە بەجێهیشتنی، توند دەستی بەرۆمیەوە گرتبوو وەك کە ئاژەڵێکی برسی دەست بە نێچیرەکەیەوە دەگرێ و وای لێکردبوو لە

شەوێکدا زیاتر لە حەفتا جار ڕێزی لێ بنێ، پێشتر ئەوەم باس کرد، بەڵام لێرەیشدا دووبارەی دەکەمەوە لەبەرئەوەی پێدەچێ زیادەڕەویی زۆر لە ژمارەکەدا کرابێ.

بەتێپەڕینی کات زانی جەلالەدین محەمەد ڕۆمی خۆی لەسەروو هاوسەرگیری و نادڵسۆزیەوە دادەنێ، هەروەها ئەو پیاوەی ئەو لۆمەی کردوە لەسەر بایەخپێنەدانی، قسە لەگەڵ خوا خۆیدا دەکات.

بەدرێژایی دوو ساڵ بۆ ژنەکەم خەمبار بووم، کە لەو ماوەیەدا هەوڵم دا لە مەولانا دابڕێم تا ئەو کاتە ببەخشمە هاوسەری خوالێخۆشبووم کە کاتێ زیندوو بوو بێبەشم کردبوو لێی: ڕۆمی لەم پێویستییە تێگەیشت و بەشێوەیەکی کاتی لە نووسینی مەسنەوی وەستا.

کاتێ ڕۆژێکیان لەخەو هەستام هەستم بە جیابوونەوە لەو بیرۆکەیە کرد کە بەهاوسەرەکەمی بەستبوومەوە. لەبیرم نەکردبوو، بەڵام ئەو هەستکردن بە قورسایی و سڕییەی جاران نەما. لە چەند شەوێکی کەمی پاشتردا هەستم کرد عەقڵم لەسەر ئەو ئازارم نادات، کەوتمە ئەوەی لەخەو هەستم و کوپێك ئاو بخۆمەوە یان میز بکەم بەبێ ئەوەی بیر لە قسەکانی (هاوسەرەکەم)، یان لاسایی جوڵەکانی، بکەمەوە. سەرەنجام ڕزگارم بوو لێی.

کاتێ گەڕاینەوە سەر نووسینەوەی مەسنەوی و ئەنجامدانی عادەتەکانی ڕابردوومان —سیر جوین و بەسەربردنی چەند سەعاتێك لەناو حەمام و قسەکردن لەگەڵ دار و درەختەکان و سەماکردن تا ئاستی ویجد— ڕۆمی ئەم بەیتانەی خوارەوەی وەك پێشەکی بۆ بەرگی دووەمی مەسنەوی نووسی:

**ئەم مەسنەوییە ماوەیەك دوا کەوت،**
**ماوە پێویستە تا خوێن بگۆڕێ بۆ شیر.**

**ئەگەر هاتنەکەت لەدایکبوویەکی نوێی لێ نەبێ،**
**ئەوا خوێن ناگۆڕێ بۆ شیرێکی شیرین،**
**کەواتە باش گوێ بگرە.**

**کاتێ حوسامەدین هەورەکانی لە بەرزیی ئاسماندا پێچایەوە،**
**هەروەها لەبەرئەوەی چووبوو بۆ میعراجی ڕاستیەکان،**
**خونچەکان لە غەیبەتی بەهاریدا نەپشکوتن.**

**کاتێ لە دەریاوە گەڕایەوە بۆ کەنار،**
**زرنگەی شیعری مەسنەوی ڕێك و هائاهەنگ کرد.**

ئەگەرچی هەستێك بەگەمژەیی بەرانبەر هاوسەرەکەم دایگرتم، ڕۆمی خستمیە کەشکەشانی ئاسمان، "لەبەرئەوەی چووبوو بۆ میعراجی ڕاستیەکان". ئەم بەیتانەم نووسی و بینیم ئەویش مەسنەوی بەو کۆرپەیە دادەنا کە بەتاسەی بووم. بەراوردی کرد لەنێوان ئەو زەمەنەی لەکاتی تازیەکەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو زەمەنەی پێویستم بوو بۆ گۆڕینی خوێن بۆ شیر.

جارێکیدی، من دەمنووسی لەکاتێکدا ڕۆمی سەمای دەکرد، یان خۆی دەشۆرد، یان پیاسەی دەکرد یاخود وەنەوزی دەدا. هەندێ جار ئەو پرسیارانەی لەناو ئەو قەسیدانەدا دەپژاند کە من لێم دەکرد، جا چ باسی برسیبوونیم بکردایە، یان باسی گەشتەکانی، یان باسی ڕووداوی ڕۆژانە. لەبەرئەوە بەردەوام ئامادە بووم بۆ نووسین و داوام لە باشترین وەستای چەرم لە قۆنیە کرد جزدانێکی چەرمی گەورەم بۆ دروست بکات، کە بەکێشتر بێ لە سندوقە تەختەییینە کۆنەکەم کە کاغەز و قاپی مرەکەب و قامیشی نووسینەکانمی تێدەخەم.

شەوێکیان خەوم بە بیلال، بانگدەری پێغەمبەرەوە بینی، کە قورئانی لەسەر سەری دادەنا، پێغەمبەر خۆیم بینی کە مەسنەوی بەسینگەوە گرتبوو. هەر کە خەبەرم بووەوە لەبارەی خەوەکەوە پرسیارم لە مەولانا کرد، ئەویش وتی:

"قورئان مانای ژنێکی جوانی خاوەن تەوێڵی نازدار دەگەیەنێ، بەخشڵ ڕازاوەتەوە و ئەوەی عەیب بێ تێیدا نیە، بەڵام پۆشتە و پەچەدارە، ئەو ژنە حیجابەکەی لانابات تەنیا کاتێ نەبێ پایتەختی ئیمان ئاشکرا بکات، کە هیچ خەڵکی تێدا نیە. مەسنەویش دڵدزی ڕۆحانییە. لە باخچەیەکی سواقدراو دەچێ. لە ژەمێکی هەرس ئاسان دەچێ بۆ ئەو پیاوانە ئامادە کراوە کە خاوەن دڵی بێگەردن، بۆ ئەویندارانی جەرگسوتاو. بەختەوەرە ئەو هەناسەیەی بە بینینی ئەو جوانییە شاراوەیە ڕازاوەتەوە. دەبێ حوسام، کە دەیەوێ لە مەسنەوی تێبگات و بەسەرانسەری ڕواڵەتیدا دەسوڕێتەوە و نهێنیی نهێنیەکانی دەزانێ، ئیمانێکی گەورەی هەبێ. پێویستە عاشقێکی دامەزراو و بەڕاست ڕاستگۆ و لە دڵی خۆیدا بێوەی بێ، ئەوپەڕی زیرەك بێ، هەروەها پێویستە لە زانستەکان شارەزا بێ. بەڵام تەنانەت بەبێ ئەو شتانەیش، سەرباری هەموو ئەوانە، ئەگەر عاشقێکی ڕاستگۆ بێ، ئەوا خۆشەویستیەکەی توانای ئەوەی پێ دەبەخشێ ببێتە مورشید و چاوساغ".

لەو ڕۆژەدا تێگەیشتم عیشق ئەو کلیلەیە  مەسنەوی دەکاتەوە.

ڕۆژێکی زستان لە فالیراس هاتە لام و داوای لێکردم ژوورێکی بۆ ئامادە بکەم چەند ڕۆژێکی تێدا بەسەر ببات بەبێ ئەوەی کەس بێزاری بکات. ژوورێکی روناکم بۆ حازر کرد کە پەنجەرەی پانی هەبوو بەسەر باخچەکەدا دەیڕوانی. هەمان ژوور کە ئەمڕۆ دوای بیست ساڵ خۆمی تێدا دەبینمەوە، قەڵەمە قامیشیەکە بەدەستمەوەیە، نووسەرێکی بەساڵاچوو، لاواز، هەوڵ دەدات وا لە مردووان بکات قسە بکەن.

رۆمی هاتە ژوورەوە، فەرمانی پێکردین دەرگا و پەنجەرەکان دابخەین، پاشان بەدەنگێك دڵنیا بوو من بیستومە وتی "بەبێ خواردن".

چێشلێنەرەکەم بەڕێکرد، بەپارچە چیخێکی گەورە پەنجەرەکانی ژوورەکەم داخست.

ئەوە دە رۆژ و دە شەوی خایاند، رۆمی لە بەرەبەیانی رۆژی یازدەیەمدا رۆیشت، رەنگ پەڕیوتر و لاوازتر، دەستبەجێ داوای بڕێك کاغەزی لە بەغدا دروستکراوی کرد. لە باخەڵم چەند کاغەزێکم دەرهێنا. بۆ نەرمکردنی ماسولکەکانی پێکانی چەند هەنگاوێك رۆیشت و رووی بەرەو تیشکی خۆر وەرگێڕا.

کەمێك نانی خوارد کە تۆوی خشخاشی بەسەردا کرابوو و چەند قومێك چایشی خواردەوە. پاشان چەند قەسیدەیەکی بەعەرەبی و فارسی هۆنیەوە. بەبێ ئەوەی بەباشی تێبگەم چی دەڵێ کەوتمە تۆمارکردن، هەندێ جار پێدەچوو هزرەکانی لەگەڵ جیهانێکی جیاواز لە جیهانی ئێمە بدوێن. هەندێ شت باس دەکەن ناکرێ باس بکرێن. کاتێ وەستا، مۆڵەتم لێ وەرگرت رێگەم بدات بەدەنگی بەرز بیخوێنمەوە. لە بەرهەیوانەکەدا بووین بەرانبەر درەختە کۆنە بەبەفر داپۆشراوەکان. گوێم لە دەنگم بوو کۆمەڵێ وشەی ئەسڵی، ئەزەلی، گۆ دەکات، کۆمەڵێ وشە تەنانەت تەنکە بەفرەکانیش دەکرێ لە بەردەمیاندا بچەمێنەوە. کاتێ لە خوێندنەوەی قەسیدەکان بوومەوە، رۆمی بەرەو مۆبەق بردمی و داوای داگیرساندنی فڕنەکەی کرد. کاتێ دامگیرساند، ئەو کاغەزانەی برد کە بەو پیتانەی نووسیبوونم رەش کرابوونەوە و یەك بەدوای یەکدا فڕیی دانە ناو ئاگرەکە. پاشان تەماشای ئاگرە برسییەکەی کرد و وتی: "لەبەرئەوەی لە غەیبەوە هاتوون، ئەم وشانە دەگەڕێنەوە بۆ غەیب، بەبێ عەیب".

لەپێناو بەختی باشدا ویستم لاپەڕەیەك یان دوو لاپەڕە هەڵبگرم، بەڵام وەستاندمی و وتی پاکیزەیی ئەو نهێنییانە لەگەڵ گوێی باشترین خەڵکی سەرزەویدا ناگونجێ. ناکرێ کەس ئەم وشانە ببیستێ تەنیا رۆحی هەڵبژاردەکان نەبێ، کە خۆراکی رۆحییانە.

کاتێ مۆبەقی بەجێهێشت، قاژێك سێوی گەورەی کاڵی خوارد و وتی:

**سروشتت لە سروشتی خوایە،**
**کاتێ ئەچیتە دڵێك،**
**درەوشانەوەی چیای سینا ئاشکرا ئەکەی،**
**لەڕێی دڵتەوە.**

**سروشتت لە سروشتی چرایە،**
**کە شەو دێتە ماڵ،**
**ماڵیش هەموو روناکە،**

**به تیشکی ئەو روناکییە.**

**سروشتت لە سروشتی ئەو شەرابەیە،**

**لە هەر کۆمەڵێکدا بی،**

**دوو هەزار تەقینەوە و شۆڕش،**

**لە سیمای پێکەوتووتەوە دەرئەچن.**

**کاتێ ترس بەر بە خۆشی ئەگرێ،**

**کاتێ حەز ئەفڕێ،**

**ئەو گوڵ و رووەکانە چین نەشونما ئەکەن،**

**لەو ئاوەی ئەیپڕژێنی.**

**کاتێ جیهان خەمبار بێ،**

**کاتێ شادی مردوو بێ،**

**تۆ، لە غەیبەوە،**

**چ جیهانگەلێکیدی ئەکەیتەوە.**

**ئەم بانگەت لە نیگەرانانەوە،**

**پێ ئەگا،**

**ئەگینا چۆن لە جوانی بەهرەوەر ئەبێ**

**ئەو پارچە قوڕە رەشە؟**

**وشەکانم فریشتەکان خۆراك ئەدەن،**

**بەڵام من ئەگەر بەبێ قسە مامەوە،**

**ئەوا فریشتە برسییەکە پێم ئەڵێ:**

**"قسە بکە، بۆچی هەر بێدەنگی؟"**

**ئەم غەزەلەی تەواو کرد و داوای لێکردم یاوەری بکەم بۆ گەرماوی زیرفا. لە گەرماوەکەدا خۆمان لە گۆمێك ئاوی کوڵاو هەڵژەنی و ماوەیەکی زۆر تێیدا مایەوە. شایعە یان ئەفسانەکە دەڵێ تا دوای حەوت رۆژ**

نەگەڕایەوە قوتابخانە. لە ماوەی غیابەکەیدا، جارێکیدی دەستنوسی مەسنەویم خوێندەوە، کە فریشتە برسیەکان دەوریان دابوو.

لە هەمان ساڵدا (١٢٦٢) عەلای کوڕی مەولانا مرد، کە غیرەکردنی لە شەمس پاڵی پێوەنا بۆ چەوساندنەوە و پەلاماردانی. مردنەکەی بەهۆی نەخۆشیەوە بوو لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا. دوای ئەوەی مەولانا پاش دیارنەمانی شەمس لە ماڵ دەریکرد، ڕۆمی بەشداریی ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی نەکرد و لە نوێژی مردوو مەحرومی کرد. جگە لە سوڵتان وەلەد کەس لەگەڵ مردووەکە نەچوو بۆ ئەو گڵکۆیەی باپیری، واتە سوڵتانی زانایان، تێیدا راکشابوو. کۆتاییەکی شوومی پیاوێکی قەڵب.

کردبووم بەعادەت ڕۆژی جارێك سەردانی گۆڕی سوڵتانی زانایان و گۆڕی سەڵاحم دەکرد. لەبەر خۆشەویستی زۆرم بۆ شەمس، خۆم دەبوارد لە سەیرکردنی کێلی گۆڕەکەی عەلا تا سۆز ناچارم نەکات فاتیحە بۆ گیانی بخوێنم. دەمویست ئەو ڕۆحەی سزای شەمسی دا تا ئەبەد لە هیولی و مەینەتیدا وێڵ بێ. ڕۆژێکیان پاش خوێندنی فاتیحە لەسەر هەردوو گۆڕ، بەسەرپێیی تەماشایەکی گۆڕی کوڕە نەفیکراوەکەم کرد. بۆ ساتێك وام بەخەیاڵدا هات مەلائیکەی سزام دیوە کە هەردوو دەست و پێی عەلایان بەزنجیر بەستووە و بۆ شوێنێکی دوور داویانەتە بەر. بینیم بەکوڵ شیوەن دەکات و دەگری. دڵم گڕی گرت و گوێم لە خۆم بوو لە خوا دەپاڕایەوە لێی خۆش بێ. پاشان هەمان ئەو مەلائیکانەم دی کۆتەکانی دەست و پێی عەلا دەکەنەوە و بەرەڵای دەکەن، پاشان دیار نەما.

دوای هەفتەیەك، مەولانا سەردانی گڵکۆی بنەماڵەی کرد. لەگەڵی ڕۆیشتم و یارمەتیم دا لە داگیرساندنی بخوردا بۆ دوورخستنەوەی چاوی خراپەکار. گۆڕەکانی شۆرد و گوڵاوی پێدا کردن. دوعای مردووی خوێند، پاشان داوای مرەکەب و قەڵەمێکی دادراوی لێ کردم. تا ئەوکاتە لە شوێنێکدا مردوان دەوریان دابێ هیچی نەهۆنیبووەوە. سندوقی نووسینەکەم پێشکەش کرد. بردی و لە گۆڕی عەلا نزیك کەوتەوە کە تەنیا رق و کینەی بەرانبەری هەبوو، لەسەر ئەو بەردەی بە چینێك گەچ داپۆشرابوو نووسی:

ئەگەر تەنیا پیاوچاك تکات لێ بکەن،

ئەی تاوانبار داد و پەنا بۆ کێ ببات؟

نزیك کەوتمەوە و دوو دێڕەکەم خوێندەوە، تێگەیشتم بیرۆکەی لێخۆشبوون کەوتۆتە دڵی مەولانایش. لە عەلا دەبورێ. بەبێ ئەوەی لێی بپرسم ڕۆمی پێی وتم: "لە جیهانی غەیبدا دیم شەمسی تەورێزی بەخشیویەتی. بەڵێ شەمس لێی خۆش بوو و تکای بۆ کرد. ئێستا عەلا بووەتە یەکێك لەوانەی بۆی خەمبارین. بووەتە یەکێك لەوانەی سۆزی ئیلاهی دەیانپارێزێ".

سەرەڕای خراپکاریەکەی، عەلا ئاشتیی هەمیشەیی بەدەست هێنا، لەبەرئەوەی شەمس شەفاعەتی بۆ کرد. ئەو پیاوەی شەوەکانی راونا، ئەو وای لێکرد لە تووڕەییدا چین چین ئارەق بکات، ئەو پیاوەی ویستی ئەشکەنجەی بدات، بریندارى بکات و بیکوژێ. ئەو لە دنیاکەیتر تکای بۆ کرد و لێی خۆش بوو.

گۆڕستانەکەم بەجێهێشت و گوێم لە مەولانا بوو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

**ئەو شمەکەی کەس نایەوێ،**

**بەهۆی ئەو پیاوە چاکەوە کڕیم.**

رووم وەرگێڕا بەرەو گۆڕی سولتانی زانایان و گۆڕی سەلاحی زێڕنگەر کە بەئامێری مۆسیقی و مێزەری دەقکراو و گوڵ دەورە درابوون. بیرم لەو قەدرە گەورەیە کردەوە کە بەو دوو پیاوەی خودا بەخشرابوو. بەتەنیا لە ناوەڕاستی گڵکۆکەدا وەستام و لەپڕ هەستێك دایگرتم کە مەولانایش رۆژێك لەو شوێنەی تێیدا وەستاوم رادەکشێ. هەوڵم دا بیر بکەمەوە ئاخۆ پاش مردنی من چیم بەسەر دێ. بیرۆکە نەخۆشەکەی دیارنەمانی دایگرتم. من بەبێ ئەو چیم بەسەر دێ؟ ئایا مەسنەویی کۆرپەم دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن؟ چاوەکانم نوقاند، کە رێوڕەسمی بەخاکسپاردنیان لەبەردەممدا دەبینی و دیدارەکەمانم پێش بیست و دوو ساڵ یاد کەوتەوە. کاتێ دوای مردنی باوکم خەمبار بووم، رۆمیم دۆزیەوە کاتێ پەیوەست بوو بە شەمسەوە. لەو ساتەدا خۆم فڕێ دایە بەر پێکانی، دەستەکانی گرتم و فشاری لێکردن. پاشان دەستی بە ریشە تەنکەکەمدا هێنا و داوای لێکردم بیهێڵمەوە.

هیچ یاداشتێك ناتوانێ ئەو دیدارە تۆمار بکات، هیچ بایۆگرافیایەك ئەو گەمەیە نابینێ کە لە ساتێکدا تەواوی ژیانمی گۆڕی.

## من کۆتاییتم

تائێستا باسی گوێڕایەڵیی کۆشکی سوڵتانم بۆ مەولانا نەکردوە. ڕۆژێك تێنەدەپەڕی بەبێ ئەوەی تێیدا ئەمیرێك یان حاکمێك یان خاتوونێك لە خاتوونانی کۆشك نەیەنە قوتابخانە بۆ سەردانی مەولانا، خۆ هەموویشیانی نەدەبینی، بەڵکو تەنیا بوونیان لەنزیکی ئەو بەشێوەیەك لە شێوەکانی خاوێنکردنەوەیان دادەنا.

ئەمیرە غوردجی کچ و خوشکی سوڵتانەکان و ژنی موعین سلێمان حاکم و ئەمیری قۆنیە، هیچ دیدارێکی لەگەڵ ڕۆمی نەدەفەوتاند، چەند جارێك لە قوتابخانەکە دیومە لە شێوەی ئافرەتێکی ئاساییدا خۆی گۆڕیوە و تەنیا کارەکەرێکی لەتەك بووە. مەولانا ڕێگەی پێدەدا بەشداریی خەڵوەتەکانی بکات، چەند سەعاتێك لەلای دەمایەوە، پاشان پاسەوانێکی سوڵتان و دوو نێردراویتر دەهاتن تا یاوەری بکەن بۆ کۆشك.

بۆ ئەوەی لە مەولانا دوور نەکەوێتەوە بڕیاری دا قۆنیە بەجێنەهێڵێ. جارێکیان ناچار بوو سەفەر بکات بۆ قەیسەریە، فەرمانی بە گەورەترین وێنەکێشی سەڵتەنەت کرد وێنەیەکی ڕۆمی بۆ بکێشێ تا لەگەڵ خۆی ببیات، ببێتە هاوڕێی ڕۆحی و لە پشوودان و ڕۆیشتنیدا هاوەڵی بێ. ئەم چیرۆکەم پێشتر باس کرد، بەڵام نازانم چی بەسەر تابلۆکەدا هات.

ئەمیرە لەڕووی داراییەوە پاڵپشتی دەکردین. کاتێ ویستمان هاوسەرگیریی کچەکەی سەلاح و نیزامی خۆشنووس ساز بکەین، ڕوومان لەو نا، ئەوەیشم گێڕایەوە.

بۆ ئەوەی بەخشندەیی ئەو ژنە بەڕێزە ڕوون بکەمەوە، ناتوانین چیرۆکی یاقوتەکە و خەونی تەلارسازەکە فەرامۆش بکەین. ئەوە بوو تەلارسازێك ناوی بەدر بوو، کە لەوکاتەوە قوتابخانەی فێرکردنی قورئان و قوتابخانەی قاراتای دروست کرد ناوبانگی فڕی، هاتە لامان بۆ ئەنجامدانی کۆڕی بیستن لەماڵەکەمدا لە فالیراس. تەلارسازەکە چەند ژوورێکی نۆژەن کردبوونەوە و گۆڕینی بۆ بیستنخانە.

تەریقەتەکەی ئێمەیش، وەك هەر تەریقەتێکیدی، هەندێ سروت و ڕێسای پەیڕەو دەکرد. ئەو خولانەوەیەی سەری دەکێشا بۆ حاڵەتێکی ویجد و ئازادبوون لەو سروتانە بوو جێگرمان کردبوو. لەبەرئەوە کاتێ ویستم بیستنخانەکە دروست بکەم زریانوس کە تازە لای سەرتاش گەڕابوویەوە و پرچی بۆ تاشیبوو و ریشی بۆ چاك کردبوو، ناچاری کردم هەر ڕێسایەك بەوردی جێبەجێ بکەم. دەبوو بەربەستێکی هەشت لا لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دروست بکەین، لەگەڵ میحرابێك بەئاراستەی مەککە لەسەر دیوارەکەی پشتەوە، مینبەرێکیش لەلای ڕاستی دیوارەکە، بەرانبەر دەرگای دەروازەکە.

ئەو ڕۆژەی تەلارسازی ناسراو گەیشت ئێمە هەژدە کەس بووین سەمای بیستنمان ئەنجام دەدا. لەوکاتەوە بە دەستەواژەی (موتوربەکردنم) لە هەژدە بەیتی شیعرەکانی مەسنەوی، ئاماژەم دایە، ئیتر ئەو ژمارەیە

بوو بەهێمای تەریقەتەکەمان. جا بۆ ئەوەی سەمای بیستنەکە بەپێی ئەو ڕێسایانەی داماننابوون ئەنجام بدەین، هەریەکەمان شوێنێکی لە ژوورەکەدا گرت. یەکێك لە دەروێشەکان چراکانی ڕۆشن کرد، لەبەردەم میحرابەکەیشدا پارچەیەکی سووری لە خوریی مەڕ ڕاخست کە هێما بوو بۆ شەمسی تەورێزی. مەولانا لەسەری دانیشت. پاشان ژەنیاران بە ئامێرە مۆسیقیەکانیانەوە گەیشتن: دەف و نای و ڕەبابە، بەدرێژایی دیوارەکەی سەروو بەرانبەر میحرابەکە دانیشتن.

هەموومان کڵاوی "سیکە"مان لەسەر کرد، تەنورەیەکی سپیشمان لەبەر کرد و ئیتر بە ئێمە دەوترا دەروێشە"خولاوەکان". کڵاو یان سیکەکە هێما بوو بۆ کێلی گۆڕ، سپێتیی تەنورەکەیش هێما بوو بۆ کفن. لەسەر تەنورەکەوە عەبایەکی ڕەشمان لەبەر کرد، خەرقەیەکی قورسی ئەستوور بوو.

سەمای بیستن بەخوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز دەستی پێکرد، پاشان هەندێ پاڕانەوە و سروود لە ستایشی پێغەمبەر و ئالی بەیتدا خوێنرانەوە، پاشان دەست بەدەفلێدان و نای ژەندن کرا. نای کە لە قەسیدەکانی ڕۆمیدا هێمایە بۆ فیراق.

پاشان لەسەر پێ وەستاین  و سێ جار، لە ڕاستەوە بۆ چەپ، بەدەوری ژوورەکەدا سووڕاینەوە. هەر سووڕانەوەیەك هێمایە بۆ چوار ڕێگەکەی ئاینە پیرۆزەکەمان: ڕێگەی ڕواڵەتبینی شەریعەت + ڕێگەی ناوەوەبینی تەریقەت + ڕێگەی عیرفانیی مەعریفە و حەقیقەت + ڕێگەی یەکگرتن.

ئەنجا عەبا ڕەشەکانمان داکەند تا جلە سپییە درێژەکانمان دەربکەون، کە ئەوە ئاماژەیەکە بۆ ئازادبوون لە شتە ماددیەکان و زیندووبوونەوەی ڕۆح. پاشان سەرۆکی بیستن لەپێشمانەوە ڕۆیشت، باڵەکانمان تێکئاڵابوون. پاشان لە مەولانا نزیك کەوتینەوە و بەرەو لای چەمینەوە و لێومان بەر دەستی ڕاستی کەوت، وەك هێما بۆ ڕەزامەندی ماچێکی سیکەکەی سەرمانی کرد.

پاشان کەوتینەوە خولانەوە، لەپی دەستی ڕاستمان بەکراوەیی ڕوو لە ئاسمان، وەك ئاماژە بۆ سوپاسگوزاریی نیعمەتە خواییەکان، لەپی دەستی چەپیشمان بەکراوەیی بۆ خوارەوە و ڕوو لە زەوی، وەك ئاماژە بۆ پێشکەشکردنی ئەو نیعمەتانە بە مەخلوقاتی زەوی. کاتێ ڕۆمی هاتە ناو بازنەی سەماکە، لە ناوەڕاستی بازنەکەدا، ئیتر تەنیا یەك جوڵە بووین، ئێمە هەر ئەو بووین، گوێم لێ بوو دەیهۆنیەوە:

**ڕەوڕەوەی ئاسمان پێم ئەڵێ من لەبەردەم سەماکەتدا لاوازم،**

**پێی ئەڵێم: لەڕێی ئەو خاڵەوە ئەبمە قیبلەنوما.**

دوای تێپەڕبوونی سەعاتێك، ڕۆمی خولانەوەی وەستاند. مۆسیقا وەستا. لەسەر زەوی دانیشت. گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان و هەوڵمان دەدا پشتی تێنەکەین و عەباکانمان لەبەر کردەوە. بەر لەوەی بیستنخانەکە بەجێ بێڵین، مەولانا کەوتە وتنەوەی ڕاناوی ناوی خوا "هو" تا هەناسەی لێ بڕا، ئێمەیش هەموو بەژەنیار

و سرودبێژ و دەروێشانەوە بەدووایدا کەوتنیەوە وتنەوەی "هو"، تا وامان لێهات وامان هەست دەکرد سیەکانمان دەتەقن.

لە دەرەوە دەروێشەکان بڵاوەیان لێکرد و هەرکەس چوو بەدەم کاری خۆیەوە. تەلارسازەکە بەهۆی شەکەتیی سەمای بیستنەوە لەگەڵ هاوەڵانیترمان کەوتنە سەر زەوی و خەویان لێکەوت، پاشان لەپڕ هەستایەوە و یاقوتێك لە دەستی چەپیدا بوو.

بەحەپەساوی هاوارێکی کرد، رایکرد بۆ لای مەولانا و داوای لێکرد بیبەخشێ. یاقوتەکە وەڵامی رۆمی بوو بۆ ئەو گومانەی لەدڵی خەونبینەکەدا بوو: چونکە کابرای تەلارساز لە خەونەکەیدا گومانی لە توانای سەرسوڕهێنی مەولانا کردبوو، ئەوەیش بووە هۆی شپرزبوونی کاتێ بەخەبەر هاتەوە و لێی پاڕایەوە تا بیبەخشێ.

هەرگیز نەمزانی یاقوتەکە لەکوێوە هات، بەڵام پاشتر پێشکەش کرا بە ئەمیرە. لەسەر ئامۆژگاریی رۆمی تەلارسازەکە چوو بۆ کۆشك و بەردە پیرۆزەکەی پێشکەش بە خاتوونی مەزن کرد، ئەمیرەیش سەخاوەتمەندانە دیاری بەسەر خۆی و هاوەڵانیدا رژاند.

هێشتا شپرز بووم و لەبارەی سەرچاوەی ئەو بەردە پیرۆزە دەمپرسی. مەولانا چیرۆکێکی ناو مەسنەوی بیر خستمەوە تێیدا دەروێشێك لقەکانی درەختێك دەگۆڕێ بۆ ئاڵتون. من باش هەلومەرجی دانانیم بیر دێ. لە پایزدا بووین، لە چاندنی شەتڵی زعفەران بەگۆل شەکەت بووبووین کاتێ رۆمی وتی:

"سەرجەم چیرۆکەکانم، هاوشێوەی وەسفکردنەکانم بۆ کەسانیتر، باسی دۆخی هاوڕێکانم ئەکەن. ئەگەرچی پێشینانمان کیمیایان بەکار هێناوە بۆ گۆڕینی مادده، بەڵام من وای دەبینم کیمیای راستەقینە ئەو کیمیایەیە بەڕاستی مایەی سەرسوڕمان بێ، ئەوەیە تێگەیشتن و فیکر ئەگۆڕێ".

بەدیدی ئەو، ئەو یاقوتەی تەلارسازەکە لە دەستی چەپیدا هەڵیگرتبوو هیچ نەبوو، تا نەگۆڕێ بۆ فیکری و لە مەغزاکەی تێنەگات.

برای ئەمیرە، سوڵتان روکنەدین ساڵێك پێش وەفاتی سەلاح دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەویش لەڕێی دەستوەردانی فەرماندەی مەغۆلی بیدجوەوە، کە پاش ئەوەی یاخیبوونێکی لەنزیك قۆنیە سەرکەوت کرد، لە بەندیخانە ئازادی کرد و کردی بەسەرۆکی ماڵی حوکمڕان. لە هەمان کاتدا موعین سلێمان مێردی ئەمیرەیش کرا بە سەرۆك وەزیران.

وەك نەریتی خۆی، هەڵوێستی مەولانا لەم رووداوانە چاوەڕوانکراو نەبوو. شتێکی سروشتی بوو خۆشحاڵ بێ موعین لە پۆستێکی باڵادا دامەزراوە لەو رووەوە یەکێك بوو لە موریدە دڵگەرمەکانی. هەروەها سروشتیش بوو خۆشحاڵ بێ بەو ملکەچییە رۆحیەی سوڵتان و ئەمیرە لەدوای یەکەکان بۆی دەردەبڕن. لە ماوەی یەکگرتن لەگەڵ سەلاحدا، سوڵتان عیزەدین لە چەندین بۆنەدا رێزی خۆی بۆ پیشان داوە، بەڵام راستیەکەی

سەردانی سوڵتانێك بۆ لای یان ملکەچیی ئەمیرێك بۆی زۆر مایەی سەرسامی نەبوو بەلایەوە، بەڵکو سەرسامیی خۆی لە جۆگەلەیترەوە وەردەگرت. سوڵتان روکنەدین لە یەکەم رۆژی دەسەڵاتداریەکەیەوە لەخۆبوردەییەکی زۆری لەبەردەم مەولانادا پیشان دەدا، بەئاشکرا بە "باوکە" بانگی دەکرد و پەرۆش بوو تەواوی داواکانی جێبەجێ بکات. بەڵام دوای چەند ساڵێك کەوتە ژێر کاریگەریی چەند ئەندامێکی دەستوپێوەندەکەی، کە لای زاهیدێکی پیر بەناوی (شێخ بابا) خوێندبوویان. لەبەرئەوە وردە وردە لە رۆمی دووردەکەوتەوە، تا سەرەنجام بەتەواوەتی ملکەچی مورشیدە تازەکەی بوو.

لەو رۆژەدا سوڵتان بانگهێشتی کردبووین بۆ ئەنجامدانی کۆرێکی بیستن لە بینای بازاڕی مسگەراندا، کە قازانی مسین دروست دەکەن. وەك جاران لەگەڵ مەولانا چووم. وا بڵاو بووبووەوە مەولانا بەبێ من ناچێ بۆ هیچ شوێنێك، ئەگەر بیشچێ نە قسە دەکات، نە پێدەکەنێ و نە سەما دەکات. دەبوو لە رۆژەدا دەربچێ و پێبکەنێ و قسە و سەما بکات، لەبەرئەوە لەگەڵی چووم.

مەولانا عادەتی وابوو وەك رێزگرتن لە کەسانی کەمبایەخ کە لەوانەیە درەنگ بێن، دووایین کەس بوو دەگەیشت. لەبەرئەوەی من پێش ئەو گەیشتم، پیاوێکی بەساڵاچووم دی، لەڕ و لاواز و بێرەنگ، کەوایەکی شینی تاریکی لە قوماشی زبر لەبەر بوو دەگەیشتە خوار ئەژنۆکانی. پشتوێنێکی لە کەتانی زبر لە کەمەری پێچابوو. رەنگی ئەو کەوایەی لەبەری کردبوو تۆخ بوو، ئەوەی سەرنجی راکێشاین دژیەکیی گەورەی نێوان دیمەنی ئەو پیاوە و دیمەنی سوڵتان بوو، کە جلێکی لەبەر کردبوو بەدەزووی زێڕ و زیو نەخشێنرابوو و بە بەردی پیرۆز رازێنرابووەوە. ناوبانگی پیاوە پیرەکە، کە بە شێخ بابا ناسرابوو، دنیای پڕ کردبوو، چیرۆکی خواپەرستیی ئەو لای دوور و نزیك لە قۆنیە زانراو بوو.

سەرجەم ئامادەبووان رێزێکی گەورەیان نواند. شوێنکەوتەکانی سوڵتان لەبەردەمیدا کڕنوشیان برد و داوایان لێکرد لە شوێنی شەرەفدا دابنیشێ. سوڵتان تەختەکەی بەجێهێشت و هات لەسەر کورسیەکی سادە لەتەنیشی دانیشت. بەچاوی خۆم هەموو ئاماژەکانی ملکەچبوونی سوڵتان بۆ شێخەکەیم دی، هەروەها زانیم وەلای روکنەدین وەك باڵندەیەك دوور بفڕێ، لقەکانی رۆمی بەجێهێشتوە و لەسەر لقی بابا نیشتۆتەوە.

ئەوە بەلای مەولانایشەوە رۆشن بوو، چونکە کاتێ هاتە ژوورەوە سلاوی لە سوڵتان کرد و پاشەکشەی کرد بۆ سوچێکی هۆڵەکە، پاشان قورئانخوێنان چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزیان خوێند، پاشان روکنەدین روو بە رۆمی وتی: "با گەورە و دانایانی مەزن بزانن من لەمڕۆوە خزمەتکاری شێخ بابا دەبم، وەك باوك هەڵمبژاردوە و ئەویش وەك کوڕی خۆی ماچی کردووم".

سەرجەم ئامادەبووان پیرۆزباییان لە شێخی خواپەرست کرد. لە گەرمەی ئەو ستایشەدا گوێم لە مەولانا بوو دەیگوت: "ئەگەر سوڵتان شێخ بابای کردۆتە باوکی، کەواتە من کوڕێکیتر هەڵئەبژێرم". ئەنجا هەستا بەپێی پەتی بینای بازاڕی مسگەرانی بەجێهێشت. لێرەدا چەپڵەلێدان وەستا.

لەوکاتەی مەولانا بیناکەی بەجێدەهێشت ئاوڕم دایەوە سەیری سولّتان بکەم. لەوکاتەدا دیمەنێکی تۆقێنەری سولّتان هاتە بەرچاوم کە بەبێ سەر بوو. سەری پەڕێنرابوو. ئەو وێنەیە بەردەوام خەیاڵی بەرنەدەدام تەنانەت کاتێکیش هاوڕێکانم لەدەورم کۆبوونەوە و داوایان لێکردم بچم بەدوای مەولانادا بگەڕێم و بیدۆزمەوە. ئەوە بێسوود بوو، چونکە دەزانم ناگەڕێتەوە. ئامادەبووان بڵاوەیان لێکرد، هەندێکیان چوون بەدوای رۆمیدا بگەڕێن، هەندێکیتریان یاوەریی خواپەرستە پیرەکە، باوکە تازەکەی سولّتانیان کرد بۆ ماڵە زۆر سادەکەی.

چەند رۆژێك تێپەڕین هێشتا نەماندەزانی کاردانەوەی سولّتان چی دەبێ بۆ ئەو هەڵسوکەوتەمان، قوتابیەکان قوتابخانەیان بەجێنەهێشت و پالێوراوی نوێمان بۆ ئەنجامدانی سەمای بیستن وەرنەگرت. رۆژێکیان سولّتان هات، روخساری دەرخست کە عادەتەن تاشراو و نەرم بوو و شوێنەواری هەندێ مووی وێڵ و نیشانەی شەوێکی پڕئیش و ماندوکەری پێوە دیار بوو. رێزێکی زۆری بۆ رۆمی پیشان دا بەوەی لەبەردەم هەمووان‌دا سوژدەی بۆ برد، پاشان هەردووکیان کشانەوە بۆ ژوورێکی لاتەریك. سولّتان ماوەیەکی کورت لەگەڵ مەولانا مایەوە، پاشان رۆیشت و نیشانەی بێتاقەتی پێوە دیار بوو.

راستەوخۆ چوومە لای رۆمی و لەبارەی هۆی سەردانەکەی سولّتان پرسیارم لێکرد. پێی وتم ئەمیرەکان بانگهێشتیان کردوە بۆ ئەکسارای بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتیەك لەگەڵ مەغۆل، روکنەدین لێی پرسیوە ئاخۆ بچێ یان نەچێ. رۆمیش بەسادەیی پێی وتوە: "باشتر وایە نەچی".

بەڵام روکنەدین چوو. کاتێ گەیشتە ئەکسارای، پیلانگێڕان بەرەو شوێنێکی دابڕاویان برد، کە جگە لە شێتەکان کەسی تێناچێ. لەوێ خنکاندیان و ئەویش هاواری دەکرد: "هۆ رۆمی! هۆ رۆمی!".

لەو ساتەدا ئێمە لە بیستنخانە بووین و لە گەرمەی سەمایەکی بیستنی رۆحیدا بووین. لەپڕ مەولانا لە خولانەوە وەستا و هەردوو پەنجەی شایەتمانی خستە گوێکانی و فەرمانی کرد نای و هەندێ ئامێریتر بێنن، کە عادەتەن بۆ ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی هەواڵێکی خۆش بەکار دەهێنرێن. داواکەی جێبەجێ کرا. پاشان سەری دوو نای خستە گوێچکەکانی و کەوتە هاوارکردن، پاشان بەدەم خولانەوەوە ئەم قەسیدەیەی هەڵبەست:

**مەگەر پێم نەوتی: "مەڕۆ بۆ ئەوێ من ئەتناسم؟"**
**لەم سەرابی فەنایەدا، من پێغەمبەری ژیانم.**

**لەوانەیە بتبوورم و وازت لێ بێنم سەد هەزار ساڵ وێڵ بی،**
**لەکۆتاییدا، ئەگەڕێیتەوە لام، چونکە من کۆتاییتم.**

**مەگەر پێم نەوتی: "بەئامانجەکانی ئەم جیهانە رازی مەبە؟"**
**ئەوە منم خێوەتی رەزامەندیت رێك دەخەم.**

**مەگەر پێم نەوتی: "من ئۆقیانووسم و تۆ تەنیا ماسیەکی؟"**
**مەچۆ دەرەوە بۆ وشکانی چونکە من دەریای سافتم.**

**مەگەر پێم نەوتی: "وەك باڵندە مەکەوە داو؟" و**
**وەرە من هێزی فڕین و پەڕ و باڵی تۆم.**

**مەگەر پێم نەوتی: "دزرایت، ئەوان لە ورەت دائەزێنن؟"**
**من ئاگری حەزی تۆ و نرکە و گەرمایی ئەو حەزەم.**

**مەگەر پێم نەوتی: "ئەوان ئەڵێن هەندێ سیفەتی بێنرخت هەن؟" و**
**لەبیر ئەکەیت من کانیی سیفەتەکانتم.**

**جا ئەگەر دڵێکت هەیە وەك چرا، ئەوا بزانە رێگەی ماڵ لەکوێیە.**
**ئەگەر سیفەت خواییانەیشیت، ئەوا بزانە من گەورەتم.**

کاتێ سامەکە وەستا، رۆمی چاکەتەکەی فڕێدایە میحرابی نوێژەکە و وتی: "با ئێستا نوێژی مردوو بکەین". گوێڕایەڵی بووین بەبێ ئەوەی لە هۆی ئەم هەڵسوکەوتە ناڕۆشنە تێبگەین. بەرپرسیارێتیی شەرحکردنی بابەتەکەی بەخشرایە سوڵتان وەلەد. بەڵام تەنانەت پێش ئەوەی لە باوکی بپرسێ، رۆمی وتی: "لەوکاتەی روکنەدینی هەژاریان دەخنکاند، لەو ساتەدا هاواری ناوی منی کرد. نەمتوانی لەبەردەم قەدەری ئیلاهیدا بوەستم، بەڵام نەمویست دەنگی بگاتە گوێم و بێزارم بکات، لەبەرئەوە سەری نایەکەم نایە گوێم، تا گوێم لە زریکە و ناڵەی نەبێ".

بەو شێوەیە چیرۆکی مردنی سوڵتانمان زانی. کۆشکیش لەڕێی ئەو سەربازانەوە بەمردنیان زانی کە لە خوێن گەوزابوون و چوونە کۆشکی وەزیری گەورە تا هەواڵ بدەنە ئەمیرە غۆردجی، کە پێویستە جلی تازیەباری بۆ مەرگی براکەی بپۆشێ. خاتوونی کۆشك بێخەبەر بوو لەوەی ئەو کەسەی فەرمانی بەکوشتنی کردوە موعین سلێمانی مێردی بووە، شوێنکەوتەی دڵسۆزی مەولانا.

بەپێچەوانەی شەمس و سەلاح، رقی حەسوودان لە شێوەی پیلانگێڕان یان هەوڵدان بۆ کوشتنم نەبوو، بەڵکو لە شێوەی دەستپێشخەریی دوژمنکارانەدا بوو لەلایەن پیاوێکەوە بەناوی "ئەحمەدی برام" کە ویستی لە ئاهەنگی دامەزراندنی من وەك سەرۆکی خانەقای زیادا ئاشوبێك بنێتەوە.

ئەوە بوو بەرپرسی خانوبەرە (عەقارات)ی شاهانە کە پیاوێك بوو بەناوی تاج، لەبەرنەبوونی کەسێك بەڕێوەی ببات پاش مردنی سەرۆکی پێشووی، بڕیاریدا من بکاتە بەرپرسی بەڕێوەبردنی خانەقاکە. بەدوای وەرگرتنی بەرپرسیارێتیەکی لەو جۆرەدا نەدەگەڕام، لەبەرئەوە وەڵامم دایەوە کە دەمەوێ پرس بە مەولانا بکەم و خەمەکانمی بۆ باس بکەم: دابڕانی حەتمی، غیابم، وەستان لە نووسینی مەسنەوی.  سەرەڕای ئەو بەڵگانەی هێنامنەوە و بەقایلکەرم دەبینین، مەولانا هانیدام ئەو پۆستە وەربگرم و بەلەش و گیان خۆمی بۆ تەرخان بکەم.

دوای چەند رۆژێك، تاج بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورەی رێکخست و پیاوماقوڵانی شاری بۆ بانگهێشت کرد. داوام لە رۆمی کرد نەچێ چونکە دەمزانی هەست بەوەڕسی دەکات و وەڕسیەکەیشی بۆ من دەگوێزێتەوە. جارێکیدی تووشی شۆکی کردم و پێداگری کرد لەسەر چوون. ئاخر ئێمە عادەتمان نەبوو ئەو جۆرە ئاهەنگانە ساز بکەین، یان ئامادەیان بین.

لە رۆژی ئاهەنگی دامەزراندنەکەمدا، لە کاتێکی زوودا چووم  بۆ خانەقای زیا. قەیرێك لەبەردەم ئەو دارە گەورەیەدا وەستام کە سێبەری بۆ حەوشەکە کردوە و سڵاوم لێکرد وەك کە رۆمی زۆرجار سڵاو لە دار و درەختەکان دەکات. هێشتا خۆر لە ئاسماندا دەرنەکەوتبوو، بەڵکو روناکیەکی کزی دابووە ئەو مەزارگەیەی تەرمی ژمارەیەك لە پیاوە گەورەکانی تەریقەتەکەی تێدا نێژرابوو. دەرگا تەختەیینەکەم کردەوە کەمێ جیڕەی هات. تیشك لەگەڵمدا چووە ناو ژوورە ساردەکە و وشە هەڵکۆڵراوەکانی سەر گۆڕێکی کۆنی روناك کردەوە. تۆزەکەم سڕی کە نیوەی ناوی کۆچکردوەکەی شاردبووەوە و بۆم دەرکەوت ئافرەتە، ئەمەیش دەگمەن بگرە تاکانە بوو. ئەو چیرۆکانەم یاد کەوتەوە کە باسی ژیانی ژنی سۆفی مەزن رابیعە دەکەن، ئەو سۆفیەی کەعبە بۆ دیداری هات بۆ ناوەڕاستی بیابان، ئەویش هاواری کرد، "چی لە کەعبە بکەم؟ ئەوەی من ئەمەوێ گەورەی کەعبەیە"، رێگەیەکی جیاوازی گرتەبەر و ئەرکی ئەوەی نەدایە بەر خۆی تەماشایەکی ئەو شوێنە پیرۆزە بکات کە هاتبوو بۆ لای.

لەکاتی خوێندنی فاتیحە بۆ گیانی ئەو ئافرەتەی لەبەر پێکانمدا راکشابوو، پرسیم ئاخۆ هیچ پەیوەندیەك هەبێ لەنێوان ئەم ئافرەتە و ئەو ئافرەتەی پێش ئەو رۆیشت و چەندین سەدەیە ناوبانگی ئاسۆی پڕ کردوە.

لەولاوە نافورەیەك لە بەردی سپی قیت بووبوویەوە، کە دیوارێکی بەدەوردا بوو تایبەت بەدەستنوێژ. دەستنوێژم گرت و چوومە ناو ژووری سەرەکی خانەقاکە کە بەژمارەیەك فانوسی هەڵواسراو بەژمارەیەکی

زۆر ستووندا روناك بووبوویەوە. لەسەر تەختەكە ناوی خۆمم بینی. حوسام حەسەن چەلەبی كوڕی محەمەد كوڕی حەسەن، كە بەدەزوویەكی ئاڵتوونی لەسەر قوماشێكی رەش چنرابوو. دەنگی پێ بەر گوێم كەوت. دەنگی پێی مجێوری خانەقاكە بوو كە هاتبوو جلی تایبەت بەئاهەنگەكەم بداتێ: كراسێكی سپی لە ملەوە شۆڕ دەبێتەوە، لە كەمەر بۆ خوارەوە بەرینترە، لەگەڵ سوخمەیەكی سپی و پشتوێنێكی رەش كە لەلای چەپ بەسترابوو، لەگەڵ كڵاوێكی قوچەكی لبادی رەنگ هەنگوینی. لەبەرم كردن و چاوەڕوانی گەیشتنی ئەوانیترم كرد.

ئەوانەی یەكەم كەس گەیشتن هەندێ لە هاوڕێیانی باوكم بوون كە من ناویانم بەتەواوی لەبیر كردبوو. كاتێ باوكم مرد و ئەو تەریقەتەم هەڵوەشاندەوە سەرۆكایەتی دەكرد و هەموو كەلولەپەكانی ماڵەكەم فرۆشت بۆ دابینكردنی خەرجی هاوسەرگیریی شەمس و كیمیا، هاوڕێكانم سەرزەنشتیان كردم. ئەوەتا بەڕێوەبردنی خانەقا دەگەڕێتەوە بۆم، كە هەر خانەقایەك نەبوو، بەڵكو خانەقای زیا-ی وەزیر بوو. ئەوەتا ئەوان ئێستا گەڕانەوە، جا چ پێیان خۆش بێ یان ناخۆش، هەوڵیان دەدا رووەكانی لێكچوون لەنێوان من و باوكی بەناوبانگمدا بدۆزنەوە، یان بیریان بێتەوە. هەموویان رادەی دۆستایەتیمیان لەگەڵ رۆمی دەزانی، بەڵام هەندێكیان بەپاڵنەری غیرە وا خۆیان دەردەخست كە ئەوە نازانن. هەروەها بە هەندێكیتریان لە فزولییانەوە ویستیان وردەكاریی نائاسایی سەبارەت بەژیانی رۆژانە لە قوتابخانەكە بزانن. هەندێكیتر هەوڵیان دا بەپیشاندانی بێموبالاتیەكی ئاشكرا، دڵگەرمییان پیشان نەدەن.

هەروەها سەرجەم خاوەن دید و سۆفی و قەلەندەر و زاهید و خەڵوەتكێش و راهیبەكان گەیشتن، هەروەها پیاوانی كۆشكیش هاتبوون، لەوانە تاج.

لەكۆتاییدا مەولانا گەیشت. رامكرد بۆ لای و لای پێكانیدا كڕنوشم برد. بەڵام ئەو بەدەستەكانی هەڵیساندم و بەرماڵی نوێژكردنەكەمی لەسەر شانی خۆی هەڵگرت و لەسەر ئەو تەختەی لەسەری دادەنیشتم رایخست. ئەو ئاماژانە پایەی رۆحیی منیان لەبەرچاوی ئامادەبوواندا زیاد كرد. ئەوكاتە تەمەنم لە سی و پێنج ساڵ تێنەپەڕیبوو. دەمویست هانی مەولانا بدەم مەسنەوی تەواو بكات، هەروەها یارمەتی سوڵتان وەلەد بدەم لە نووسینی كتێبی "فیە مافیە" و تەواوكردنی كۆكردنەوەی "وتارەكانی شەمس" و هەموو توانای خۆم بخەمە گەڕ تا ئەو خۆشەویستیەی مەولانا هەیەتی بۆم، بیهێڵمەوە. لەوكاتەدا قەت بیرم لە زەمەنی دوای رۆمی نەدەكردەوە، بەڵام رۆمی بیری لەوە دەكردەوە. لەبەرئەوە هانیدام بۆ سەرۆكایەتیكردنی خانەقاكە و رازی نەبوو كڕنوش لەبەردەمیدا ببەم و بەرماڵی نوێژەكەمی لەسەر شانی دانا. بەو ئاماژانە بەبێ ئەوەی ئەوەیش بڵێ، بەئاشكرای عالەم وەك میراتگری خۆی دیاری كردم.

قورئانخوێنان گەیشتن و چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزیان خوێندەوە. پاشان تاج لەسەر تەخت دانیام. گوێڕایەڵی بووم و هەوڵم دەدا خۆ لە تەماشاكردنی چاوەكانی رۆمی ببوێرم. لە قووڵایی دڵمەوە هەستم

دەکرد ئەو تاکە پیاوە شیاوی ئەو تەختەیە. کاتێ خۆم ئامادە دەکرد تا لەسەر داوای تاج پێشنوێژی بکەم، لەناکاو پیاوێك بەناوی "ئەحمەدی برام" هەستا، کە زریانوس ئاگەداری کردبووم لێی، بەپاڵ لایدام و وتی: "من و براکانم بەشێخی خۆمان قبوڵت ناکەین".

دەستبەجێ خانەقاکە، شوێنی تایبەت بە رامان و خەڵوەت، گۆڕا بۆ گۆڕەپانی جەنگ. ئەندامانی تەریقەتەکە کە هێمن و ئارام بوون، ئەوانیش خەنجەرەکانیان هەڵکێشا و گژبەریی نەیارانیان کرد. بەڵام هاوڕێکانی "ئەحمەدی برام"یش خەنجەر و شمشێریان پێ بوو. هاوار هاواری پیاوان بەرز بوویەوە، خوێن رژا، خەمی گەورەم بوو بە پاراستنی مەولانا تا تووشی بەڵایەك نەبێ. بەهێزی جەستەییم و چەند جوڵەیەکم توانیم رۆمی لە بەشەڕهاتووان دوور بخەمەوە و بردم بۆ بەلەکۆنێك بەسەر هۆڵەکەیدا دەڕوانی.

چاوەڕوانم کرد شتێك بڵێ. بەڵام یەك وشەی نەدرکاند و چاودێریی ئەو شەڕەی دەکرد لە خوارەوە بەرپا بووبوو. لەکۆتاییدا کاتێ بەشەڕهاتووە بەتەمەنەکان لە زۆر شەکەتیدا پەکیان کەوت، ژیرترینیان بەدوای رێگەیەکدا گەڕان بۆ وەستاندنی شەڕەکە. پاشان پێی وتن: "کاتێ تەماشاتان دەکەم، پیاوانێك دەبینم بەدەستی خۆیان ماڵی خۆیان وێران دەکەن".

لە بەلەکۆنەکەوە و بۆ ئەوەی هەمووان ببینن، دەستی خستە سەر سەرم و ئەم قەسیدەیەی بەئاراستەی من وت:

**لەکۆتاییدا خۆشەویستیت هات، بەڵام لە یەکەم گەورەتر ئەبێ،**
**چونکە خوا خۆی فەرمویەتی کۆتایی دەبێتە یەکەم.**

پاشان لە بارێکدا تەماشای دیمەنێکی لە خوار پێکانی دەکرد کە هیچ پەیوەندیەکی بە کۆبوونەوەیەکی بەویقارەوە نەبوو، کە تێیدا دەروێشە دەموچاو خوێناویەکان لەگەڵ سۆفیەکانیتر کە لەسەر زەوی کەوتبوون تێکەڵ بووبوون، خەنجەر بەدەستیانەوە و هەستیان پەرێشان بوو، وتی: "پێغەمبەری ئیسلامتان بیر بێ. مەگەر ئەو دووایین پێغەمبەر نەبوو. ئەی مەگەر نەیفەرموو ئەو، ئەو کۆتاییەیە دەبێتە یەکەم؟ بەهەمان شێوە، شێخ حوسام کۆتاییە و یەکەمیش دەبێ لە دڵمدا، لە دڵتاندا، هەروەك لە دڵی تەواوی گەردووندا".

پاشان لە بەلەکۆنەکە هاتە خوارەوە و خۆی دابوو بەسەر شانمدا، وەك کە عادەتی وابوو کاتێ تووڕە بووایە بەپێی پەتی چووە دەرەوە، لەگەڵی رۆیشتم و زریانوسم بەجێهێشت تا خەڵکەکە هێور بکاتەوە.

کاتێ سوڵتان بیستی "ئەحمەدی برام" فتیلەی ئەم شەڕەی هەڵگیرساندوە، وەزیری دادی بانگ کرد و فەرمانی پێکرد تۆمەتبار دادگەیی بکات و بەزووترین کات لەسێدارەی بدات، بەڵام رۆمی بەشەخسی هاتە ناوەوە و ژیانی "ئەحمەدی برام"ی رزگار کرد.

پاشان هات بۆ قوتابخانە تا سوپاسی مەولانا بکات، بەڵام مەولانا دەریکرد و رازی نەبوو بیبینێ و پێی وت: "تۆ لە ئێمە نیت".

لەو رۆژەوە هەموو خەڵك پشتیان لە "ئەحمەدی برام" کرد، تەنانەت خەڵکە ساویلەکەیش. وای لێهات خەڵك خۆیان لێ دەبوارد یان هەر کات لەوسەری شەقامێکدا بیانبینیایە رێرەوی خۆیانیان دەگۆڕی. پیاوان رایاندەکرد و هاواریان دەکرد "نزیکی نەکەونەوە! نزیکی نەکەونەوە!" و خۆیان لە هەر پەیوەندیەك بەو بێزراوەوە دەبوارد.

دوای ماوەیەك تاج رێوڕەسمێکی نوێی دامەزراندنی ساز کرد، بەو پێیە بەڕەسمی بوومە سەرۆکی خانەقای "زیا". پاشتر، لەکاتێکدا هێشتا بەتۆمارکردنی مەسنەویەوە سەرقاڵ بووم کە مەولانا پێی دەنووسیمەوە، ئەرکی بەڕێوەبردنی خانەقایەکیتریشیان پێ سپاردم، ئەویش خانەقای "لالا" بوو. جارێکیتر رۆمی داوای لێکردم ئەو بەرپرسیارێتییە قبوڵ بکەم. مەولانا ئامادەی ئەم ئاهەنگە نەبوو، بەڵام بەگەرمی پیرۆزبایی لێکردم. بەم پێداگرتنەی، هەستم کرد دەیەوێ ئایندەیەکی سەقامگیر و ئاسوودەم بۆ مسۆگەر بکات. بوو بە پیاوی دابڕان و کۆچ و شۆکە لەناکاوەکان و ناڕۆشنی، ئێستا نیگەرانە بۆ پیریم، ئەمەیش شتێکی نامۆیە.

# کۆچ

دوای پازدە ساڵی ڕەبەق، ئەرکەکەم بەجێهێنا کە بریتی بوو لە نووسینی مەسنەوی و خوێندنەوە و ڕاستکردنەوە و تەواوکردنی. کاتێ ڕۆمی دواین قەسیدەی لە بەرگی شەشەمدا ڕێکخست —وتوێژێکە، تێیدا دایکێك بەکچەکەی دەڵێ ئەگەر تارماییەکی ڕەشی زۆر ڕقاویت دی ئازابە و پەلاماری بدە، ئەوکاتە زوو لەکۆڵت دەبێتەوە— هەستم نەکرد هێشتا کارەکەمان تەواو کردبێ.

لە خانی بازرگانانی شەکر بووین، کە تێیدا پێش بیست و نۆ ساڵ دیدار —یان پێویستە بڵێم بەریەککەوتن—ەکەی نێوان شەمس و ڕۆمی ڕووی دا. تەماشای جۆر و شێوە جیاوازەکانی شەکرمان دەکرد: بلوری، کلۆ، شلە، کاتێ مەولانا دواین قەسیدەی مەسنەوی بەم دوو بەیتە تەواو کرد:

**ئەو قسە جوانەیش لە دڵمدا،**

**چونکە لەدڵەوە بۆ دڵ دەلاقەیەك هەیە.**

وشەی "دەلاقە"ی وت و پێی وتم "تەواو".

لەپڕ، پازدە ساڵ لە جۆش و خرۆش و شەیدایی و سەرمەستی و وڕێنە و باڵایی تەواو بوو. کۆرپەکەمان بە وشەی "گوێ بگرە" لەدایك بوو و بە وشەی "دەلاقە" کۆتایی دێ. منداڵەکەمان دەنگی ئەو عیشقە بوو کە هاوارێکی دابڕان چریکاندی. دوای پازدە ساڵ لە گەڕان و نسکۆ، دەلاقەی دڵی هەڵبژارد.

هەستکردنێك بە دڵتەنگی و بەهەمان ئەندازەیش بەخۆشی دایگرتم. هەستم بەشانازی کرد لەبەرئەوەی توانیم ئەو کارە گەورەیە تەواو بکەم، توانیم کۆرپەکەمان ببینم گەشە دەکات و گەورە دەبێ. بەڵام تەواوبوونی مەسنەوی ئاماژەیش بوو بۆ سستی و بێسوودیی من. بەدرێژایی کات سەبارەت بەسروشتی ئەو خۆشەویستیەی ڕۆمی بۆ منی هەیە لە خۆمم دەپرسی. وەڵامەکەم لە مانای مەسنەویدا دەبینی و زانیم کۆتایی قەسیدە مەزنەکە، کۆتایی مێژوو و دابڕانمان دەبێ.

لە ترسەکەمدا هەڵە نەبووم. ئەوە بوو ماوەیەکی کورت دوای تەواوبوونی قەسیدەکە ڕۆمی بانگی کردین، من و سوڵتان وەلەد و زریانوس و موعین سلێمان و ئەمیرە غوردجی و کیرا و فاتیمە، پێکەوە.

موچرکەیەك بە لەشمدا هات. بەفر حەوشەکەی پڕ کردبوو، کزەی زوقمی قۆنیە لەڕێی درز و قلێشەکانی دەرگا کۆنەکانەوە دزەی کردبووە کون و قوژبنی ماڵەکە. کاتێ نەعلەکانم دادەکەند تا بچمە ژوورەکە، بیرم کەوتەوە کە من ئامادەبوونی دیدارەکان لەو ژوورەدا سەدان جار ئەوەم کردوە. دیدارێك لەو دیدارانە بەس بوو تا ژیانێکی تەواوی تێدا بکرێتەوە.

دوای ئەوەی لە بەردەرگای ژوورەکە تێپەڕیم، لەپڕ ئارەقێکی زۆرم دەردا، ئەی ئەگەر بیەوێ دابڕانمان ڕابگەیەنێ چی؟

کاتێ گەیشت لەبەردەمیدا چەماینەوە، فەرمانی پێکردین هەستین، پاشان لەو ساتەی چاوم بەچاوی گەیشت، هەستم کرد نیگەرانیەکەم بۆ رەتکردنەوەم بەبەراورد بەوەی پێمان دەڵێ وەك چڵە پووشێك وایە. روخساری لە هەر کاتێکی پێشتر رەنگ پەڕیوتر بوو، دەستەکانی کەمێك دەلەرزین و دەنگیی دەلەرزی، وتی:

"مەترسن ئەگەر ئۆغرم کرد، چونکە ئێوە لە هەموو بارودۆخێکدا لەگەڵم دەمێننەوە. بیرم لێ بکەنەوە و منیش بۆتان دەردەکەوم. هەر پۆشاکێك بپۆشم من هەمیشە دەگەڕێمەوە لاتان، هزرتان پڕ دەکەم لە مانای نهێنی".

ساتێك وەستا، پاشان بەردەوام بوو:

"ژیانم بەسوودە بۆتان، مردنیشم بۆتان بەسوود ئەبێ".

ئەمیرە غوردجی دایە پرمەی گریان. فاتیمە بۆ دووەم و دواین جار لە ژیانیدا قیژاندی —جاری یەکەم ئەوە بوو بەتووڕەیی بەڕووی سوڵتان وەلەدی مێردیدا قیژاندی. ئەمیر موعین سلێمان بەتوندی سەری خۆی بەدیوارەکەدا کێشا و خوێنی پێدا هاتە خوارەوە. سوڵتان وەلەد روومەتی داڕنی. زریانوس لەپڕ کەوتە بەیۆنانی قسەکردن، کیرا حیجابەکەی فڕێ دا، جلەکانی دادڕاند و هەندێ بەشی گۆشتی جەستەی لە ئێمەوە دەرکەوت و وتی: "ئەی نووری گەردوون! ئەی هەناسەی مرۆڤایەتی! ئیتر بۆ کێ بخولێینەوە؟ بۆ کوێ ئۆغر ئەکەی؟".

رۆمی وەڵامی دایەوە: "لە دەرەوەی بازنەی ئێوە نامێنمەوە".

کیرا لە قسەکردن بەردەوام بوو و هێشتا گۆشتی جەستەی بەدەرەوە بوو، "ئایا جگە لە تۆ کەسیتر دەردەکەوێ؟"

رۆمی مێزەرەکەی داکەند، بڵاوی کردەوە و بەنەرمی جەستەی کیرای پێ داپۆشی و وتی: "ئەگەر دەرکەوت، ئەوا هەر من ئەبم! لە گەردووندا دوو جەستەم هەیە: یەکێکیان بۆ تۆ و ئەویتریان بۆ خۆم. کاتێ بەفەزڵی پاشای تاکانە لەم جەستەیەی لێرەدا ئەیبینی رووت ئەبمەوە، ئەویتریان بۆ تۆ ئەمێنێتەوە".

لە شڵەژانەکەمدا بڕیارم دا لە خوا بپاڕێمەوە دە ساڵ لە تەمەنی من ببات و بیدات بەرۆمی و چەند مانگێکیتر تەمەنی پێ درێژ بکاتەوە، چونکە ئەو خوایەی سەلاح لۆمەی کرد و ئەوەی شەمس باوەڕی پێی بوو، ئەوەی دەمی رۆمی لە ناوبردنی ماندوو نەدەبوو، دەتوانێ ئەم داوایەم گیرا بکات. بەڵام ئەوە رووی نەدا. پێش تەواوبوونی دیدارەکە، مەولانا تەوێڵی نا بە تەوێڵی هەرهەموومانەوە و ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە ماینەوە. کاتێ نای بەناوچاوانی زریانوسەوە هێشتا هەر بە یۆنانی قسەی دەکرد.

خەریك بوو ژوورەکە بەجێبێڵم، رۆمی داوای لێکردم یاوەری بکەم بۆ ژووری نووستنەکەی.

له ژوورەکەدا خۆی بە بەتانیەکەوە پێچا و کەوتە باسکردنی ئەو کاتانەی پێکەوە بەسەرمان بردن. پاشان چیرۆکی ئەو نەحویەی بۆ گێڕامەوە کە کەوتە ناو بیرێك، جا دەروێشێك دەیەوێ رزگاری بکات و قسەکانی لەڕووی رێزمانییەوە هەڵەیان تێدا بووە. لێی پرسیم ئاخۆ هێشتا کۆتایی چیرۆکەکەم بیر ماوە. دیارە لەبیرم نەکردبوو، ئەوە بوو کابرای نەحوی لەناو بیرەکەدا کەوتە راستکردنەوەی هەڵە رێزمانیەکانی دەروێشەکە، دەروێشەکەیش تووڕە بوو و نەحویەکەی لە بیرەکەدا بەجێهێشت و پێی وت: "لەوێ بمێنەوە تا من فێر دەبم هەڵە رێزمانیەکانم راست بکەمەوە".

هەروەها باسی ئەو رۆژەی کرد تێیدا هەستی کرد خدر پێغەمبەر کە بە "برام" ناوی دەبرد بێبەشی کردوە لە قسەکردن لەگەڵی، لەبەرئەوەی کاتێکی زۆری بەدانان و پێچانەوەی مێزەرەکەیەوە بەسەر بردوە.

ئەمەیشم لەبیر نەکردبوو، لەوکاتەوە ئیتر مەولانا مێزەرەکەی نەدەپێچایەوە، بەڵکو هاوەڵەکانی بۆیان ئامادە دەکرد و لەسەر سەریان دادەنا.

شەو بەهێواشی هات. لەودیو دەرگاکەوە گەورە پزیشکانی سەڵتەنەت کۆبوونەوە و بەبێ سوود چاوەڕوانیان دەکرد. پزیشکی هیچی بۆ مەولانا پێ نەدەکرا. ئەو پزیشکانەی بەڕێ کردن کە ئەمیر لە نەخۆشخانەکان و لەپاڵ پێخەفی نەخۆشەکانیترەوە هێنابوونی. لەودیو دەرگاکەوە دەنگی گریان و شت شکان و هەنگاونان دەبیسترا و هەر زوو دەنگەکە کز بوو. لە ژوورەکەدا، رۆمی سەری لەسەر ئەژنۆم بوو بەهێواشی چووە خەوی لێکەوت.

گوێم لێ بوو بەدەنگێکی کز و لاواز هەندێ نزای سەیری دەکرد:

"ئەی خوای گەورە! من ئامادەم بە هەر ترسێك، هەر بارێك، هەر خەمێك، هەر خۆشیەك، هەر شتێکی سەیر، هەر گوناهێك، هەر مسیبەتێك، هەر گوێڕایەڵیەك، هەر سەرپێچییەك، بگەم. ئەی خوای گەورە! نوورێك بخە دڵم، نوورێك بخە گۆڕەکەم، نوورێك بخە چاوەکانم، نوورێك بخە پرچم، نوورێك بخە پێستم، نوورێك بخە گۆشتم، نوورێك بخە خوێنم، نوورێك بخە ئێسکم، نوورێك بخە بەردەمم، نوورێك لە دواوەم، نوورێك لە ژێرم، نوورێك لە سەرم، نوورێك لە راستم، نوورێك لە چەپم، ئەی نووری نووران! بمکە نوور".

پێی سەیر نەبوو کە بینی ئەوەی دەیڵێ دەینووسمەوە، چونکە پازدە ساڵە کردومە بە نەریت هەرچی بڵێ دەینووسمەوە.

نزا دوور و درێژەکەی تەواو کرد و هەستایەوە دانیشت، بەم شێوەیە مایەوە، پاڵی بەمنەوە دابوو، خۆی بەبەتانیەکەوە پێچا. کاتێ ئەزنەکی دا شێوەی دانیشتنەکەی بگۆڕێ، وام بەخەیاڵدا هات گەنجێکم دی. جوانیەکەی خەریك بوو لەهۆشم ببات. لە چیرۆکی خۆشەویستیدا خوێندومەتەوە عاشق هەبوون، لەهۆش خۆیان چوون. بەخەیاڵمدا نەهات بینینێکی وا سادە دەکرێ هەموو ناخم بهەژێنێ. مەولانا زۆر بەگەرمی پێشوازی لە گەنجەکە کرد و داوای لێکردم جلی خەوتنەکەی بۆ دابکەنم. یارمەتیم دا بۆ داکەندنی. پاشان

کاتێ دیم مەولانا و گەنجەکە هیچ جوڵەیەکیان نەکرد، بەرەو لای چووم و لێم پرسی ئەو گەنجە کێیە و بۆچی هاتووە بۆ ئێرە، گەنجەکە وەڵامی دایەوە:

"من فریشتەی گیانکێشانم. بەفەرمانی خوای گەورە و بەخشندە هاتووم، تا وەسێتی مەولانا ببیستم".

پاشان گوێم لێ بوو رۆمی پێی وت:

"وەرە پێش! وەرە پێش! ئەی هەناسەکەم! ئەی پەیامبەری هاتوو لە کۆشکی سوڵتانەکەم!"

پاشان بەهێمنی پێی وت: "ئەو فەرمانەی پێت کراوە، جێبەجێی بکە".

تارماییەکە دیار نەما.

فریشتەی مەرگم دی. دەرگاکانی دنیاکەیدی. ئەو دنیایەی تێیدا رۆمی و شەمس و سەلاح لەگەڵ خودان. ئەو دنیایەی هزرەکانی تێدا گەڵاڵە دەبن. ئەو دەرگایانەی زۆر حەزیان لێ دەکرێ، پێش کەمێك لەبەردەممدا والا بوون.

مەولانا گەڕایەوە و جلەکانی لەبەرکردەوە و داوای لێکردم تەشتێکی پڕ ئاوی بۆ بێنم و پێکانی خستە ناو تەشتەکە. بەبێدەنگی تەوێڵ و سینگیم سڕی، لەبارێکدا لەبەرخۆیەوە ئەم قەسیدانەی دەوت، کە هەوڵم دا ئەزبەریان بکەم:

**دۆستێك کوپێکی پڕ ژەهری هێنا،**

**لەگەڵ ئەوەیشدا خواردمانەوە، چونکە دەستی ئەو پێشکەشی کردین.**

**ئێمە، لە ناخماندا، لە بڵندایی ئاسمانین.**

**ماددە ئەمانخاتە ژێر زەوی.**

**لەڕێی سیفەتەکانمانەوە هەڵئەزنێین.**

**لەگەڵ ئەوەیشدا رواڵەتی مردوانمان پێوە دیار ئەبێ.**

لە دەرەوە، گوێم لە دەنگی سەرجەم ئەندامانی خێزانەکە و موریدەکان بوو بەدەنگی بەرز دەگریان و شین و شەپۆڕیان دەکرد. رۆمی فەرمانی پێکردم داوایان لێ بکەم بێدەنگ بن. "پێیان بڵێ لە دۆخیان تێئەگەم، بەڵام ئەم هەموو هاوار و رۆڕۆ بەرزە سوودی چییە؟" پاشان پێی وتم: "هاوڕێکانم لەملاوە رامئەکێشن و شەمسیش لەولاوە بانگم ئەکا، ئەبێ بڕۆم".

لە وشککردنەوەی ئارەقی روومەتی نەدەوەستام کە هەندێ دەربڕینی نائیرادی لێوە دەردەکەوت. ئازار ناخمی دەگوشی، بەڵام نەگریام. مەولانا لەبەردەممدا گیان دەسپێرێ، بەهەناسەی، چرپاندی و وتی:

"تەرمەکەم لەسەروو گۆڕەکانیترەوە دابنێ، چونکە من یەکەم کەس ئەبم سەرئەکەوم".

لەسەر داوای خۆی دەمویست لە ژوورەکە بچمە دەرەوە کاتێ سوڵتان وەلەد هاتە ژوورەوە و خەم پەرێشانی کردبوو. رۆمی زۆر دڵی دایەوە. پاشان داوای لێ کرد بڕوات و ئاسوودە بێ. سوڵتان وەلەد چووە دەرەوە. لای بەردەرگاکە داوام لێکرد تەرتیبی گۆڕەکان لەناو مەزارگەکەدا بگۆڕێ.

رۆمی چووە خەوێکی قووڵ، هێشتا پێکانی لەناو تەشتەکەدا بوون. بەنەرمی دەستم بە هەردوو برۆ و دەستەکانیدا هێنا.

کاتێ بێدار بووەوە داوای لێکردم زیاتر لێی نزیك ببمەوە، رووم لەبان رووی، لێوەکانم لەبان لێوەکانی، چاوەکانم لەبان چاوەکانی دابنێم. پێی وتم:

**سەرم لەسەر سەرینەکە دانێ،**

**برِۆ و بەتەنیا جێم بێڵە،**

**بەجێم بێڵە، من ماندوو،**

**شەونخوونکێش و موبتەلام.**

**بەتەنیا لە سەرەتای شەوەوە تا شەبەق،**

**لەگەڵ شەپۆلی عیشق،**

**ئەگەر ویستت، وەرە و بوەخشە،**

**ئەگەریش ویستت، وام لێبکە ئازار بچێژم.**

**لێم دوور کەوە تا تۆیش نەکەویتە**

**بەلا و نائومێدی،**

**رێگەی سلامەتی هەڵبژێرە و**

**واز لە رێگەی بەلا بێنە.**

ساتێك بێدەنگ بوو، پاشان هەناسەدانەکانی خێرا بوون. رووی وەرگێرا. دەنگی گەڕایەوە، ئێستا بەکزتر، وەك ئەوەی شتێکی هەبێ بیەوێ لەکۆتاییدا بیڵێ:

**من لەوێم، ئاوێك بەرچاوم ئەگرێ،**

**بەهێواشی لە گۆشەی خەمدا ئەکشێم،**

**بەسەر ئاوی چاوما،**

**سەد ئاش دائەمەزرێنم.**

**ئەو سەرکەشەی ئەمانفەوتێنێ،**

**دڵێکی هەیە لە بەردە چەخماخە تاشراوە،**

**ئەگەر کوشتی، کەس پێی نالێ:**

**"خوێنباییەکەت لەبیر بێ".**

**شای روومەتە جوانەکان،**

**ئەرکی وەفای لەسەر نیە،**

**جا ئەی عاشقی روو زەرد،**

**ئارامگر و وەفاداربە.**

**جگە لە مەرگ،**

**ئازارێك هەیە چارەی نیە،**

**جا چۆن من بڵێم:**

**چارەیەك بۆ ئەم ئازارە بدۆزەوە؟**

**ئەگەر ئەژدیهایەك لە رێگە دەرکەوت،**

**ئەوا عیشق وەك زومروتە،**

**بەنووری ئەو زومروتە،**

**برۆ و ئەژدیهاکە راو بنێ.**

ئمە دواین قەسید بوو لە ژیانی رۆمیدا. بەدەم قسەکردنەوە مردن رفاندی. ئەوەیش لە رۆژی یەکشەممە پێنجەمی جەمادی دوایی ساڵی ٦٧٢ی کۆچی (١٧ی کانوونی یەکەم/دێسەمبەری ١٢٧٣).

دەمم لەسەر دەمی دانا و دووایین هەناسەیم هەڵمژی. جلەکانیم لەبەر داکەند. جلی تازیەباریم لەبەر داماڵی کە لەو کاتەوە شەمس دیار نەماوە کردبووی بە نەریت لەبەری دەکرد و جلێکی ئاساییم لەبەر کرد. پاشان دەرگاکەم کردەوە و رێگەم بۆ هاورێیان واز کرد بێنە ژوورەوە.

ئەمیر لەبەردەم تەرمی رۆمیدا چوو بەچۆکدا و چەندین سەعات بەو شێوەیە مایەوە. ئەمیرە غوردجیی هاوسەری لەدوایەوە ئارام و بێدەنگ وەستابوو و چاوی لەسەر رۆمیی کۆچکردوو بەرز نەدەکردەوە.

دانیشتم و پشتم بەدیوارەکەوە، هەوڵم دا بەکۆششێك کە پرزە پرزەی دەکردم دان بەوەدا بنێم ئیتر رۆمی

نەماوە. بەخۆمم وت پێویستە بەزووترین کات رێورەسمی بەخاکسپاردن ئەنجام بدەین و شوێنی گۆڕەکەی دیاری بکەین و وەك داوای لێکردم گۆڕەکەی لەسەروو گۆڕەکانیترەوە دابنێین، نوێژی مردووی لەسەر بکەین. پاشان نازانم پێویستە چی بکەین. بۆ ساتێك بەخەیاڵمدا هات لێی بپرسم.

مردن بۆی دووپات کردمەوە لەمەودو ئیتر هیچ وەڵامێکم لێیەوە پێناگات.

بۆ بەیانی، ئیمامێکمان بانگ کرد کە هەمووان رێزی دەگرن. هاوڕێیان لەسەر زەوی دانیشتن. ئیمام دەستی بە شۆردنی لاشەی مەولانا کرد و کاتێ ئیمام ئاوی بەسەر لاشە راکشاوەکەی سەر تەتەشۆرەکەدا کرد، هەرچی دڵۆپی ئەو ئاوەیە خواردمانەوە کە بەسەر جەستەیدا فوارەی دەبەست.

لەپڕ ئیمامەکە قیڕەیەکی کرد و دەستی بۆ سەری شل کرد بکەوێ بەسەر سەری مەولانادا.

پاشان پێی وتم کاتێ سینگی شۆردوە رۆمی جولاوە.

زریانوس رایکرد بۆ لای سەرتاش، پاشان چاوی بە بەرپرسان لە جەنازەکە کەوت. بەدەوری فەناکەدا دەسوڕامەوە کاتێ هاوڕێ یۆنانیەکەم ئاماژەی پێدام تەماشای ئەو تەرمە نەکەم کە لەسەر تابوتێکی داپۆشراو لە ماڵەوە گوێزرایەوە. چاوەکانم بەداخراوی هێشتەوە و هێنامە بەرچاوم مەولانا سەمای بیستن دەکات و دەخولێتەوە، تا هەست بە سەرسوڕان دەکات. لەکاتێکدا کەژاوەکە تێپەڕی زریانوس و سوڵتان وەلەد لای دەرگاکە وەستابوون. پاشتر زانین زریانوس کاتێ جەستەی مەولانای دیوە بەکفن پێچراوەتەوە و دەیخەنە گالیسکە، وتویەتی: "مەولانا بەجێمان دێڵێ".

تێگەیشتم مردن ئۆغرکردنە (المغادرة).

چاوم کردەوە و بینیم هەردوو پیاوەکە لێم نزیك دەبنەوە. یەکترمان لەئامێز گرت. تێگەیشتم مردن سەرلەنوێ یەکگرتنەوەیە.

هەریەکەمان شتێك هەبوو بیکەین. من وەك ژمێریاری قوتابخانە دەبوو خەرجی بەخاکسپاردنەکە بدەم. دەبوو سوڵتان وەلەد گرنگی بەمەسەلەی جێنشین بدات. دەبوو زریانوس هەواڵی مردنەکە بداتە موریدە بیانییەکان. زانیم مردن بەرپرسیارێتیشە.

کاتێ شۆردنی لاشەی رۆمی تەواو بوو، کەژاوەیەك کە حەوت گای لەپێشەوە بوو یاوەریی تەرمەکەیان کرد بۆ گڵکۆی باوکی، سوڵتانی زانایان، کە سەلاحیشی تێدا نێژرا. لەسەر شەقام، پیاوان و ئافرەتان و زانایان و سۆفییان و پیشەکاران و خەڵکانی ئاسایی و فەرمانبەرانی میری و یۆنانی و ئێرانی و تورك و رۆمان و مەسیحی و جولەکە، لە دەوری کەژاوەکە ئەڵقەیان بەست. هەندێ راهیب کە کتێبی پیرۆزیان بەدەستەوە بوو، چەند ئایەتێکی ئینجیلیان خوێند، هەندێ حەبرێکی جولەکەیش هاتنە پێش و چەند ئایەتێکیان لە تەورات خوێندەوە.

ئەمیر بانگی ئوسقوف و حەبری گەورەی کرد کە ئامادە بوون و لەبارەی هۆی ئەو حەماسە پرسیاری لێ کردن، ئەوانیش وەلامیان دایەوە: "لە رێنماییەکانی ئەوەوە حەقیقەتی مووسا و حەقیقەتی عیسا و حەقیقەتی سەرجەم پێغەمبەران تێگەیشتین. لەودا ئەوەمان دەبینی کە سەبارەت بە هەلسوکەوتی پێغەمبەران لە کتێبەکاندا خوێندومانەتەوە. ئێمە بە مووسا و عیسای ئەم سەردەمەمانی دادەنێین".

حەبرە جولەکەکە هەروەها وتی: "رۆمی خۆری راستیەکانە، سەرجەم مەخلوقاتیش خۆریان خۆش دەوێ".

راهیبە مەسیحیەکەیش وتی: "رۆمی وەك نانە، کەس ناتوانێ بەبێ نان بژی. ئایا برسیەکت دیوە پشت لە نان بکات؟ جەنابی ئەمیر تۆ نازانی ئەو بەراستی چییە"، ئەمیریش بێدەنگ بوو.

قورئانخوێنان چەند ئایەتێکی قورئانیان خوێند، بانگدەران نزایان کرد، بیست تیم سرودیان دەربارەی مردن وت کە رۆمی خۆی نووسیبووی، ژەنیاران تەپلیان لێدا و نای–یان ژەنی.

کاتێ کەژاوەکە گەیشتە مەزارگەکە خەریك بوو ئێوارە دەهات. شێخ سەدر کە رۆمی لە ژیانیدا ناوینابوو، چاوەڕوانی ئەنجامدانی نوێژی دەکرد. لەو ژوورەی لە خەلکدا جمەی دەهات بەحال بواری هەناسەدان هەبوو. سلاوم لە شێخ کرد. باسی دوایین دیداری خۆی لەگەل رۆمی بۆ کردم کە تێیدا رۆمی، پاش ئەوەی رازی نەبوو هیچ دەرمانێکیدی بخوات، رازی بوو بەئامۆژگاریی سەدر نەبێ هیچ وەرنەگرێ. کاتێ شەربەتی دەخواردەوە، پێی وت ئەو لەو کاتەوە لەنێوان عەشیق و مەعشوقدا هیچ نامێنێ جگە لە عەبایەکی لە شیعر چنراو، هەروەها نوور جارێکیدی دەچێتەوە پال نوور.

لەبیرم نەکرد. ئەوەم لەو رۆژەیشدا بیر کەوتەوە کە رۆمی رازی نەبوو هیچ لەو دەرمانانە بخوات کە بۆم هێنا.

شێخ سەدر چاوەڕوانی کرد تا دەنگەدەنگەکە هێور بووەوە و وتی: تەنیا یەك شێخ لە جیهاندا هەبوو، ئەویش رۆیشت. ئێستا پەتی پەیوەندی دەپچڕێ. پەتی ملوانکەی فیکر ون دەبێ. ئێستا کارەکان لاواز دەبن و سیستەم بەرەو هەلدێر دەچێ. ئێستا ئیتر هیچ شوێنەوارێکیدی بۆ برایەتی یان شادی نابێ. ئیتر مەغۆل پێ دەنێنە سەر سامانی سولتان و ئەمیرەکان و گەنجینە و سەری زۆر دوور دەبڕێن. قوتابخانە و تەکیەکان دەگۆڕێن بۆ میوانخانە و کاروانسەرا. بەرەکەت نامێنێ و سێبەری زۆرداری بال دەکێشێ و گەردوون تارومار دەبێ".

شێخ دایە پرمەی گریان و هەموو ئەوانەی گوێیان لە وتارەکەی بوو گریان، لەکاتێکدا لە دەرەوە گوێمان لە هاوارێکی بەرزی خەمباری بوو.

خۆمم بینیەوە لەتەنیشت سولتان وەلەد و کیرا وەستاوم کاتێ کیرا بەدەنگێکی نزم پێی وتم هە ئێستا مێردەکەی دیوە بەئاسماندا فڕیوە. بالەکانی بەفراوانی کرابوونەوە، وەك ئەوەی بیەوێ بمانپارێزێ.

سیراجی هاوڕێم نزیك كەوتەوە، ئەو پیاوەی پێش چەند ساڵێك بەدرێژایی شەو چاوەڕوانی كرد تا رۆمی ببینێ، بەدەم لولدانی دوو سمێڵە درێژەكەیەوە پێی وتم: "هەر ئێستا قسەم لەگەڵ مەولانا كرد و پرسیارم كرد لەبارەی ئەو جیهانەی بۆی چووە، ئەویش پێی وتم: لەو جیهانەیتر زۆر وەك ئەم جیهانە ناسراو نیم".

هیچم نەدی، هیچم نەبیست.

كاتێ تەرمی مەولانا بەخاك سپێردرا، بۆ دواجار دەستم لە برۆكانی دا. ئەو شوێنەم ماچ كرد كە تێیدا هەردوو برۆكەی بەیەك دەگەن، تا بۆ هەتاهەتایە هەست بەزبریی مووی لەسەر لێوەكانم بكەم.

سەرم نا بەدڵیەوە، گوێم لێبوو لێی دەدا. ناوچاوانیم ماچ كرد و شەمسم بیر كەوتەوە كە رۆژێكیان وتی: "چرای كوژاوە، چرا دائەگیرسێنێ و ئەڕوات".

پاشان لاشەكەی لە دوا مەنزڵیدا ئەسپەردە كرا و مێزەرەكەی لەسەر كێلی قەبرەكەی دانرا.

چاوەڕوانم كرد تا هەمووان گۆڕستانیان بەجێهێشت، چەند سەعاتێك تێپەڕی تا روناكیەكان كوژێنرانەوە، ئەوكاتە منیش رۆیشتم.

لەناو قوتابخانەكەدا پشیلەكەی مەولانا نان و ئاوی لەخۆی حەرام كرد، تا دوای هەفتەیەك تۆپی. مەلیكە، كچی رۆمی و كیرا پشیلە تۆپیوەكەیان دۆزیەوە، شۆردیان و بەچەرچەفێك پێچایانەوە و لەژێر گۆڕی مەولانادا شاردیانەوە.

هەركات روو دەكەمە گۆڕستان قسەیەكی شەمسم بیر دەكەوێتەوە كە وتی: "كەسێك لەسەر گۆڕێكی نووسی: ژیان لە سەعاتێك زیاتر نیە". ژیانم تەنها یەك سەعات بوو، بەڵام لەگەڵ رۆمی بەسەرم برد.

## کۆتایی

**شەمسی تەورێزی، عیشقت ناسی، عەقڵت نەناسی.**

بە چوار ساڵ ئەم رۆمانەم نووسی. لەو ماوەیەدا دایکم کۆچی دوایی کرد، دوای دە ساڵ لە هەوڵدان بۆ نووسینی، کچەکەم لەدایك بوون کە لەبەر ناوی داپیرەی رۆمی ناومنا کیارا. نووسینی ئەم رۆمانە چەند ماوەیەك پچڕانی تێکەوت، بەخەم و منداڵبوون و پەروەردەکردن.

مێردەکەم کە ئەویش نووسەرە و لە کارکردن ناوەستێ، زۆر جار لەسەر ئەو پچڕانانە رەخنەی لێدەگرتم، منیش بەنیوە بەیتێکی شیعرێکی رۆمی وەڵامم دەدایەوە کە دەڵێ **"ئەم مەسنەوییە ماوەیەك دواکەوت"** (مەسنەوی گەورەترین کاری رۆمیی شاعیر و گەورەترین کارەکانە لە ئەدەبی فارسیدا). دان بەوەدا دەنێم من نیوە بەیتەکەیتریم نەدەزانی، لەبیرم کرد. تەنانەت بە زۆر ناڕوون دەهاتە بەرچاوم. لەڕاستیدا تەواو لەبیرم کرد. لەو ماوەیەدا شیرم دەدایە کچەکەم، رۆژەکانم بۆ چەند ماوەیەك دابەش کرابوون، ماوەی هەریەکەیان سێ کاتژمێر بوو، کە ساتەکانی شیرپێدانی کچەکەم بوون. رۆژێکیان بەرگی دووەمی مەسنەویم کردەوە و دوو بەیتەکەی سەرەتام خوێندەوە:

**ئەم مەسنەوییە ماوەیەك دوا کەوت،**

**ماوە پێویستە تا خوێن بگۆڕێ بۆ شیر.**

"تا خوێن بگۆڕێ بۆ شیر". ئەم وشانە روو لە منن. مەسنەویم داخست. لەسەر لێو و چاوەکانمم دانا —وەك کە قورئان دادەنێم— و هەستم کرد من بڕیارە راستەکەم داوە و رۆمی لەگەڵ منە.

ئەم کتێبە پەیوەندیەکی توندوتۆڵی بە یادەوەریی دایکم (ماهین جاهانبیگلو تەجەدود)ەوە هەیە. کاتێ بەمن دووگیان بوو، لە زانکۆی تاران ئەدەبی فارسی دەخوێند. تەنانەت پاش ئەوەی دکتۆرایشی بەدەست هێنا کردبوویە عادەت ئامادەی ئەو موحازەرانە دەبوو کە پرۆفیسۆر بەدیعوزەمان فرو زانفەر، پسپۆڕی گەورە لە رۆمیدا، پێشکەشی دەکردن. بەیانی هەموو رۆژێکی پێنجشەممان دەچوو، تا مردنی پرۆفیسۆری بەناوبانگ کۆتایی بەو موحازەرە گرنگانە دانا.

کاتێ من و دایکم و مێردەکەم کارمان لەسەر وەرگێڕانی سەد قەسیدە لە "دیوانی شەمسی تەورێزی" دەکرد، زانیارییە قووڵەکەی لە شیعری رۆمی لە بنەڕەتدا پشتی بەئامادەبوونی لەو موحازەرانەی بەدیعوزەمان پێشکەشی دەکردن، دەبەست. کاتێ کێشەیەکمان بهاتایە رێ و سەرنجە کۆنەکانی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە بەس نەبوونایە، پەیوەندی بە هاوڕێکەی لە تاران، محەمەد رەزا شافیعی کادکانی، یەکێك لە دیارترین قوتابیەکانی پرۆفیسۆر بەدیعوزەمانەوە دەکرد، کە هەمیشە وەڵامەکەی ئامادە بوو.

پرۆفیسۆر شافیعی کادکانی جێگەی مامۆستاکەی لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی تاران گرتەوە. جارێکیان، لەکاتی یەکێك لە موحازەرەکاندا —ئەوکاتە دوای دامەزرانی کۆماری ئیسلامیی ئێران بوو—کە تەنیا قوتابیەکانی ئامادە نەدەبوون، بەڵکو مامۆستایان و ژمێریاران و سەدان کەسی شەیدای ناسین و دیراسەکردنی سۆفیزمیش ئامادە دەبوون، وتی: "خوا هەڵەی کرد کاتێ رۆمی دروست کرد".

نەمویست تێزێکی ئەکادیمی سەبارەت بەژیانی رۆمی بنووسم، چونکە من سەرباری پاشخانە ئەکادیمیەکەم، وام نەدەبینی ئەم نەهجە —کاملە وردە قووڵ رۆچووە— هیچ ئاسەوارێکی جوانی یان هەستەکانی تێدا بێ. لە "قوتابخانەی پراکتیکی بۆ خوێندنی باڵا" لە فەرەنسا خۆم تۆمار کرد لەسەر تێزێکی دکتۆرا کە دیراسەکردنی دەقێك لە چینیی مانەوی سەدەی هەژدەیەمی لەخۆ دەگرت. رۆژێکیان کاتێ مامۆستا زۆر بەزەحمەت توانی شفرەکانی دەستنووسێکی مانەوی بکاتەوە کە بە خەتی زمانی قیبتی نووسرابوو، لەبارەی رای خۆمەوە لەوەدا پرسیاری لێکردم، بەعەفەوی وەڵامم دایەوە کە "پێم جوان بوو". پێنج یان شەش قوتابیەکە کە لە ژوورەکەدا بوون مریان لێکردم، چونکە لەناو چوار دیواری ئەکادیمیادا رێگە بەو دەربرینانە نادرێ.

پاشان هەمان کێشە بوو بە رێگرم. پێویستە لە دەرەوەی دیواری زانکۆ بۆ جوانی بگەرێین. لەبەرئەوە بریارم دا ئەم چیرۆکە بەسیغەی راناوی قسەکەر بگێرمەوە. بەڵام ئەوە لە پێویستیی وردبوون و سەختگیریی زانستی ئازادی نەکردم. لە رۆمانی "رۆمی: ئاگری عیشق"دا سەرجەم ئەو دەستەواژانەی لەنێوان کارەکتەرەکاندا ئاڵوگۆر کراون دەربرین و وشەی ئەوتۆن ئەو کەسایەتییانە بەراستی وتونیان و من هیچم هەڵنەبەستوە. خۆم بەوەندە رازی کردوە بارودۆخ و حاڵەت بۆ کارەکتەرەکان دروست و ساز بکەم. کۆپیەکی شەرحکراوی سەرجەم سەرچاوە دەقییەکانیشم پاراستوە.

لەبەرئەوە ئەم رۆمانە بایۆگرافیایەکی زانستی نیە، ئەگەر ئەوەم بویستایە ناو و نازناوی رەسمیم بەکار دەهێنا: جەلالەدین محەمەد بەڵخی، کە بە خواوەندکار (گەورە)، بە خامۆش (بێدەنگ)، بە مەولانا و پاشان بە رۆمیش ناسراوە.

ئەگەر ئەمە بایۆگرافیایەکی زانستی بووایە لیستێکی گشتگیری کارەکانیم دەخستە روو و تەنیا لەسەر مەسنەوی و دیوانی شەمسی تەورێزی نەدەوەستام، هەروەها ئەوەم زیاد دەکرد کە مەسنەوی فۆرمێکی شیعرییە هەر دوو نیوە دێڕ یەك کێش و یەك سەروایان هەیە و کۆی ژمارەی بەیتەکان لە مەسنەویی رۆمیدا ٢٦٠٠٠ بەیتە شیعرە. هەروەها لەبارەی چوارینەکانیەوە، دیسان لەبارەی "فیە مافیە" کە سوڵتان وەلەدی کوری کۆی کردۆتەوە، دەمنووسی. هەروەها زنجیرە دیدارەکانیم لەگەڵ موریدەکانی دەخستە روو بەتایبەت لەگەڵ وەزیرە سەلجوقییە بەهێزەکە موعینەدین سلێمان: پەیامەکانی مینبەر، حەوت کۆرەکە، کە کۆی خوتبەکانی پێکدێنێ. هەروەها باسی هاوسەردەمەکانیم دەکرد، شاعیری مەزن سەعدی، فەخرەدینی

عێراقی، قوتابی سەهرەوەردی کە خەڵکی قۆنیەیە. ئەو بووە ڕۆمی لەبارەیەوە وتوێتی "بەغەریبی هاتە دنیا، بەغەریبی ژیا، بەغەریبیش سەری نایەوە". دیسان دەکرا ناوی زانای گەورەی ئاینی سەفیەدینی هیندی بێنم، کە تاکە ئامانجی قەدەغەکردنی دەنگی ئەو ڕەبابە بوو دەروێشەکانی لە کۆڕەکانی بیستندا بەکاریان دەهێنا، ئەوەی ڕۆمی پێی وت موسڵمانبوونی هەزار کافری مەسیحی ئاسانترە لەوەی بێگەردی بدرێتە پاڵ سەفیەدین، چونکە ڕووی تەختەی ڕۆحی وەك ڕەنگی وجبی قوتابخانەی منداڵێکی لێهاتووە، ڕەش و تەمومژاوی.

هەروەها ناو و مێژووی سوڵتانە سەلجوقیەکانم لە ئاسیای بچوك دەهێنا: عەلائەدین کەیقوباد (٦١٧–٦٣٤ك/ ١٢١٩–١٢٣٦ ز) کە بانگهێشتی باوکی ڕۆمی، بەها وەلەدی کرد بۆ قۆنیە و ویستی لە ماڵەکەی خۆیدا دایبنێ. هەردوو برا عیزەدین کەیکاوس (٦٤٣–٦٥٥ك/ ١٢٤٥–١٢٧٥٧ز) و ڕوکنودین کلێچ ئەرسەلانی چوارەم (٦٥٥–٦٦٤ك/ ١٢٥٧–١٢٦٦ز) کە هەردووکیان موریدی مەولانا بوون و تابلێی ڕێزیان دەگرت.

بۆ ئەوەی ئەوە تەواو بکەم دەکرا لە کوڕەکانی بکۆڵمەوە، سێ کوڕ و کچێك: بەهائەدین محەمەد، ناسراو بە سوڵتان وەلەد (٦٣٢–٧١٢ك/ ١٢٢٥–١٣١٤ز)، عەلائەدین محەمەد (٦٢٤–٦٦٠ك/ ١٢٢٦–١٢٦٢ز)، موزەفەرەدین ئەمیرولعیلم ( –٦٧٦ك/ – ١٢٧٨ز)، لەگەڵ مەلیکە خاتون (–٧٠٣ك/ ١٣٠٥ز) و هیتر.

ڕۆمانەکەم بەسیغەی ڕاناوی قسەکەر —ی نێر– نووسیوە و خۆمم لەجێی پیاوی سێیەم داناوە کە ڕۆڵێکی گرنگ و گەورەی لە ژیانی ڕۆمیدا هەبووە، ئەویش حوسامە، یان وردتر بڵێین حوسامەدین چەلەبی حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی حەسەن، ئەویش بەهۆی دێڕێکەوە لە بایۆگرافیەکەیدا دیم، کە پاش مردنی لەنێوان ساڵانی ١٣١٨ و ١٣٥٣ نووسراوە، کە دێڕێکی سادەیە لە دەقێکی سەدەی چواردەیەمدا هاتووە. زمانی فارسی لەو کاتەوە زۆر نەگۆڕاوە.

ئەو دێڕە ڕاستەوخۆ ئاراستەی من بوو و پێویستی بە تەعلیق نەبوو. ڕستەیەکی سادە دەڵێ مەولانا (ی ڕۆمی) عاشقم بوو (حوسام)[٧].

پێش حوسام سەلاح هەبوو، پێش سەلاحیش شەمسی زۆر بەناوبانگ هەبوو، شەمسی پشکۆ. بەڵام هیچ دێڕێك نەهاتووە بەم ڕۆشنییە پەیوەندییەکانیان —پەیوەندییە ناوەکی، ڕەمزییە تایبەتەکانیان بۆ دەستەیەکی تایبەت لە زانایان– بەم شێوە ئینسانییە ڕوون بکاتەوە. لەکاتی خوێندنەوەدا زانیاریم دەربارەی خەڵوەتە ڕۆحیەکانیان، حەزە —تەنانەت جەستەییەکانیان کۆ کردەوە، بەبێ هیچ ئاماژەیەکی ڕوون دەرفەتی ئەوەم بۆ بڕەخسێنێ وەسفی ئەو شەوە بەناوبانگانە بکەم و ڕاستەوخۆ سەرنجی "خۆشەویستان" بدەم.

---

[٧] الافلاکي، مناقب العارفین، الجزء الثاني ص٧٣٧.

"رۆمی عاشقی حوسام بوو". ئەم دێڕە وای لێکردم لەگەڵ حوسام ئاوێتە ببم، هاوشێوەی هەستکردنی حوسام هەست بەئەزموونی عیشقی جەستەیی بکەم لە راناوی قسەکەری نێرینەدا. هەروەك دەرفەتی بۆ رەخساندم بتوانم بچمە ناو ژوورەکان، گەرماوەکان و دوکانەکانی بازاڕ و ئەو خانانەی رۆمی و ئەوانیتر سەریان لێدەدان. هەروەك دەبوو لەوە بکۆڵمەوە و هەوڵ بدەم تێبگەم بۆچی ئەوە مومکین بوو. ئەو "من"ـە، راناوی قسەکەری تاکی نێرینە هەر دەبوو بزانێ.

بۆچی رۆمی لەناکاو بەشەمسی وت کە پێویستە بڕوات و دووچاری مەرگی بکات، لەکاتێکدا ئەو پیاوە خۆشەویستترین کەس بوو لەلای لە دنیادا؟  ئەم فیراقە لەناکاوە بۆچی؟ بۆچی، لەو ساتەوە، لەدایکبوونی یەکێك لە گەورەترین شاعیرانی جیهان دەبینین؟ ئەو رۆڵە چی بوو عیشق لە ئازاری فیراق و ئافراندندا بینی؟

ئەو "من"ـەی هەڵمبژارد، ناچاری کردم وەڵامێك بدۆزمەوە.

مێردەکەم پێشنیاری کرد پارێزگاری لە دیدگەیەکی هاوچەرخانە بکەم، کە بتوانم بە بابەتیبوونێکی گەورەترەوە سەرنجی ئەو رووداوە "ئەفسانەیی"انە بدەم، کە بناغەی ئەدەبی فارسین. بەڵام ئیتر کات بۆ ئەوە بەسەر چووبوو. "من" ئیدی بەدوای رۆمیدا کەتبووە رێ، لە هەوڵیدا بۆ دۆزینەوەی ئەوەی چۆن چۆنی شاعیرێك لە جەرگەی عیشقدا لەدایك بوو.

## ناوەرۆك

### کتێبی شەمسی تەورێزی


من پیرە پیاوە سەرمابردەکەم...........

لەپڕ، دیم...........

شەو مردبووم، بەیانی زیندوو بوومەوە...........

ئاوی تینووان، نانی برسییان...........

فڕینی ئازیز...........

شێخ و موریدم...........

تۆم بەتەنیا بینی...........

کاڵ بووم، کوڵام و بوومە قەقنەس...........

پەرتت دەکەم...........


### کتێبی سەڵاحەدین


من ئەوم...........

دەرگاکان دەخەمە سەر پشت...........

منداڵەکانمان جەرگمانن بەسەر زەویدا دەڕۆن...........

لەسەر ڕێگەی گۆڕەکەم سەما دەکەم...........


### کتێبی حوسامەدین

